

# راقەی

# كتاب التوحيد

كتاب التوحيد

## الَّذِي هُوَ حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعَبِيدِ

لِلْإِمَامِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْوَهَّابِ رحمه الله

ئامادەكردنی

زێرەڤان خۆشەوی خۆشەوی

بەرگی یەكەم



ڕاڤـــەی

# كتاب التوحيد

الذي هو حق الله تعالى على العبيد

للإمام محمد بن عبد الوهاب

ئامادەكردنی

زێرەڤان خۆشەوی خۆشەوی

بەرگی یەكەم

**ناوی کتێب:** ڕاڤەی کتاب التوحيد.

**نووسەر:** زێرەڤان خۆشەوی خۆشەوی.

**تیراژ:** (١٠٠٠) دانە.

**ژمارەی بەرگەکان:** (٢) بەرگ.

**نۆرەی چاپ:** چاپی یەکەم.

**ساڵی چاپ:** (١٤٤٥) کۆچی، (٢٠٢٤) زایینی.

**ژمارەی سپاردن:** لە بەڕێوەبرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردن (١٠١٥) ساڵی (٢٠٢٤) پێدراوە.

# پێشەكی

إن الحمد لله نحمده، ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلوات الله وسلامه عليه، وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر كەسێک خوای گەورە خێری بۆی ویستبێ، ئەوە لەدین شارەزای دەكات)، دینیش بریتی یە لە قورئان و سوننەت كە سەرچاوەی گشت حوكمە شەرعی یەكانە، جا هەر موسڵمانێک لەم دوو سەرچاوەیە تێ بگات، ئەوە خوای گەورە خێری بۆی ویستووە، هەروەها زانستی یەكخواپەرستیش لەسەرووی هەموو زانستێكەوەیە كە موسڵمان فێری ببێت، یەكەم شت پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی بۆ كردبێت و هاوەڵانی فێركردبێت زانستی بیروباوەر و یەكخواپەرستی بووە، پێغەمبەر (ﷺ) سێزدە ساڵ بانگەوازی خەڵكی كردووە بۆ یەكخواپەرستی بێ ئەوەی نوێژ و ڕۆژوو و زەكات و حەج واجب بێت، ئەمەش بەڵگەیە بۆ فەزلی زانستی یەكخواپەرستی.

بەهۆی ئەوەی كە زۆر لە موسڵمانانی كورد بە تەواوەتی لە زمانی عەرەبی شارەزا نین، بۆیە بە پێویستم زانی دەست بكەم بە ڕاڤەكردنی پەرتووكی یەكخواپەرستی كە یەكێكە لە باشترین و جوانترین و ئاسانترین پەرتووكەكانی یەكخواپەرستی، كە پەرتووكی هاوشێوەی ئەمە نەنوسراوەتەوە، ڕاڤەی ئەم پەرتووكە بەم شێوەیە كراوە:

**١-** هەموو بابەكان و ئایەت و فەرموودە و وتەی زانایان كراوەتە كوردی جگە لە مسائلەكان.

**٢-** هەموو ئایەتێک و فەرموودەیەک وشەکانیان ڕاڤە کراون و سوودەکانیان باسکراون، هەروەها پەیوەندی ئایەت و فەرموودەکان بە بابەوە باسکراوە، هەروەها پەیوەندی باب بە پەرتووکی یەکخواپەرستی یەوە باسکراوە.

**٣-** پلەی فەرموودەکان حەسەنە یان صحیحە یان ضعیفە ئەوەی پێویست بێت باسکراوە بە پوختی.

**٤-** ڕاڤەی ئەم پەرتووکە کۆکردنەوی وتەی زانایانە، لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ سەرچاوەکان.

**٥-** لە سوودەکانی ئایەت و فەرموودەکان زیاتر جەختم کردۆتە سەر بابەتی یەکخواپەرستی، جگە لە هەندێک شوێن و هەندێک بابەتی تر نەبێت کە پێویستی کردووە.

**٦-** لەڕووی زمانەوانییەوە هەوڵم داوە زمانێک بەکاربێنم زمانی زۆربەی خەڵک بێت، بۆ ئەوەی زۆرترین خەڵک لێی تێ بگەن و سوودی لێ ببینن، نەک تەنها یەک چین لێی تێ بگات، هەروەها هەندێک وشەی عەرەبیم بەکارهێناوە، چونکە کتێبەکە کتێبێکی ئایینی یە و دەبێت زاراوەی عەرەبی شەرعی تێدابێت، هەندێک وشە هەیە وا گونجاوە عەرەبی بێت یان بە عەرەبی جوانترە.

لە کۆتاییدا ئومێدم وایە خوێنەری بەڕێز ئەگەر هەڵەیەکی بینی لەوەی نووسیومە یان تێگەیشتنێکی هەڵەم هەبێت ئاگادارم بکاتەوە لە ڕێگای ئەم ژمارە تەلەفۆنەوە (٠٧٥٠٤٣٢٩٤٦٢)، بە سوپاسەوە قبولی دەکەم، هەر ڕاستیەکم پێکا بێت لە نەقل کردن ئەوە لە فەزلی خوای گەورەیە، هەر هەڵەیەکیشم هەبێت ئەوە لە نەفسی خۆم و شەیتانەوەیە، سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە ڕاڤەی پەرتووکی (كتاب التوحيد)ی بۆم ئاسان کرد، جا بەهیوای ڕەزامەندی خوا و مایەی سوودی بۆ خوێنەرانی بەڕێز، لە کۆتاییدا

داواكارم لەخوای گەورە لە هەڵە و كەم و كورتییەكانم ببورێت و بیكاتە توێشوویەك بۆ دواڕۆژم، وصلی اللە علی نبینا محمد وعلی آلە وصحبە أجمعین.

**نووسەر**

**زێرەڤان خۆشەوی خۆشەوی**

# كتاب التوحيد الذي هو حق الله على العبيد

## پەرتووکی یەکخواپەرستی مافی خوایە لەسەر بەندەکانی

زانایانی کۆن سەرەتا پەرتووکی یەکخواپەرستی و بیروباوەڕیان لەگەڵ فقه (واتە: باس کردنی عیبادات و معاملات) پێکەوە باس دەکرد و دەیانووسی، سەرەتای پەرتووکەکە باسی بیروباوەڕی دەکرد پاشان عیبادات و معاملات، بەڵام دواتر لێکیان جیاکردنەوە، بۆ کار ئاسانی و تێگەیشتن پەرتووکی بیرو باوەڕو فیقهیان لێک جیاکردەوە، هەروەها پەرتووکەکانی بیروباوەڕ بە شێوەیەکی گشتی لە کۆنەوە تا ئێستا لە ژێر ئەم ناو نیشانانە نووسراون:

(١) التوحيد. (٢) الإيمان. (٣) السنة. (٤) العقيدة. (٥) الفقه الأكبر. (٦) الشريعة.

سەبارەت بە (فقه الأكبر) یەکەم کەس ڕیسالەی نووسی بێت بەم ناو نیشانە ئەبو حەنیفە بووە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، پاشان کەسانی تر دوای ئەو شوێنی کەوتوون، (فقه) لای ئەبو حنیفە دوو جۆرە (فقه الأكبر) کە باسی اصولی دین دەکات و ئەوەی تر باسی فروعی دین دەکات.

یەکتاپەرستی مافی خوای گەورەیە بەسەر بەندەکانی، خوای گەورە مرۆڤی بۆ یەکتاپەرستی دروستکردووە، قبووڵ بوونی عیبادەت و خۆشی قیامەت لەسەر یەکخواپەرستی وەستاوە، کە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران (عليهم السلام) بووە بۆ قەومەکەی خۆیان، پێشینەکان و زانایان زۆر گرینگیان بە بیروباوەڕ داوە و کتابی بیرباوەڕیان لەبەرکردووە و بەوانە شەرحیان کردووە، وە بیروباوەڕی پووچیان ڕوونکردۆتەوە و دژی وەستاون، لەوانە (اسحاق بن راهويه) و بوخاری و موسلیم و ابن خزیمە و ابن قتیبە و طبری و ابن کثیر و بەغوی و چەندین زانای تر.

ابن تیمیه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (پێویستی مرۆڤ بۆ ڕیساله گەورەتره له پێویستی نەخۆش بۆ پزیشک، چونکه دوا شت که تەقدیر کرابێت به نەبوونی دکتۆر مردنی لاشەیه، بەڵام ئەگەر بەنده نوری ڕیساله و ژیانی بەدەست نەهێنا دڵی دەمرێت به مردنێک ئومێدی ژیانی نییه به هیچ شێوەیەک، یان تووشی بەدبەختی و ناخۆشییەک بووه به هیچ شێوەیەک خۆشی لەگەڵ نییه)[1].

تویجری ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (یەکخواپەرستی ڕاستەقینه بینینی خوای تاک و تەنیایه (واته: گەیشتنه به پلەی الاحسان)، وه تەنها ڕووکردنه خوایه بەوەی ئاوڕ له بێجگه له خوا نەدەیتەوه.

یەکخواپەرستی زمان به جووڵه دێنێت و دڵ پێی ئارام دەبێت، ئەندامەکانی لاشه به کردەوه دێنێت بۆ عیبادەت کردن، چاو به فرمێسک دەهێنێت و لاشه دەهێنێته لەرزین و دڵ دەهەژێنێت و ڕوح بەخۆشی دێنێت بۆ شیرینی زیکر و عیبادەت، هەروەها مرۆڤ هەست به چێژی گوێڕایەڵی و ملکەچ بوونی مەلیکی ڕاستەقینه دەکات.

ئەم یەکخواپەرستی یه بوو خوای گەوره پێغەمبەری (ﷺ) پێی ناردووه و کتێبی بۆ دابەزاندووه و دینی لەپێناودا داناوه)[2].

هەروەها دەفەرموویێت: (به تەوحید چاک بوونی دڵ و لاشه و دونیا و دوارۆژی تێدایه.

دڵ ئەگەر چاك بوو به زانینی تەوحید و ئیمان، ئەوه لاشه هەمووی چاک دەبێت به گوێڕایەڵی و تەسلیم بوون بۆ خوای گەوره، پاشان حاڵی بەنده چاک دەبێت و خوای گەوره لێی ڕازی دەبێت و بەختەوەری دەکات له دونیا و ئاخیرەتدا، خوای گەوره

---

[1] مجموع الفتاوی (٩٦/٩-٩٧)
[2] کتاب التوحید لاپەڕه (٩).

دەفەرمووێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ۝٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ۝٦٣ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ۝٦٤﴾ [يونس: ٦٢-٦٤]

ئەگەر دڵ پووچ بوو بە نەزانین و کوفر و شیرک، ئەوا هەموو لاشە پووچ دەبێت بە تاوان و خراپەکاری، ...

تەوحید گەورەترین شتە لەلای خوای گەورە، گەورەترین شتە کە خوای گەورە واجبی کردووە لەسەر بەندەی خوا) [١].

ئەم پەرتووکە یەکێکە لە گرینگترین پەرتووکەکانی یەکخواپەرستی و بەناوبانگترین کتێبی دانەرە کە چەندین زانا ئەم پەرتووکەیان ڕاڤە کردووە، وە بەشێوەیەکی جوان و ئاسان دانراوە و بابەتەکانی ڕوون کراونەتەوە، پەرتووکەکە باسی ئەمانە دەکات:

١- یەکخواپەرستی، ئەویش ئەوەیە کە دەبێت تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەیت و شەریکی بۆ بڕیار نەدەیت.

٢- باسی شیرکی گەورە دەکات، کە شیرکی گەورە نەفی یەکخواپەرستی دەکات و موسڵمان پێی لە دین دەردەچێت.

٣- باسی شیرکی بچووک دەکات، کە شیرکی بچووک نەفی تەواوی یەکخواپەرستی دەکات.

---

[١] كتاب التوحيد لاپەڕە (٢٩-٣٠).

٤- باسی ئەو ڕێگایانە دەکات کە مرۆڤ نزیک دەکاتەوە لە شیرک یان مرۆڤ تووشی شیرک دەکات.

٥- باسی ئەو داهێنراوانە دەکات کە مەترسی هەیە لەسەر یەکخواپەرستی.

٦- باسی تاوان دەکات کە پاداشتی یەکخواپەرستی کەم دەکاتەوە.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم کتابەی کە ئێمە ڕاڤەی دەکەین کتێبێکی زۆر گەورەیە، هەموو زانایانی تەوحید یەک دەنگن کە کتێبی هاوشێوەی ئەمە لە ئیسلام نەنووسراوە لە بابەتی خۆی وەک خۆی، ئەمە تاکە کتابە بابەت باس بکات بەم شێوەیە کە پێشتر بەم شێوە نەنووسراوە، چونکە دانەری کتێب چەند ڕێگای هەیە لەم کتابە، بابەتی یەکخواپەرستی لە عیبادەت و ئەوەی پێچەوانەی ئەم یەکخواپەرستیەیە یان پێچەوانەی ئەسڵی تەوحیدە کە شیرکی گەورەیە و یان پێچەوانەی کاملی تەوحیدە کە شیرکی بچووکە باسیکردووە، هەروەها باشی و جیاکەرەوەی ئەم کتێبە بەوەیە کە بابەتی یەکخواپەرستی عیبادەت بە تەفسیلی باسیکردووە، بە ڕێک و پێکی و ڕیز بەندیەکی جوان بابەتی یەکخواپەرستی باسکردووە، کەس پێش دانەری کتاب بەم شێوە نەینوسیوە، قوتابی پێویستی پێیەتی بۆ زانینی ماناکەی و ئەو ئایەتانەی لە خۆی گرتۆتەوە و فەرموودە و سوودەکان.

هەندێ لە زانایان ئەم کتابە بە پارچەیەک لە صحیحی بوخاری دەچوێنن، دانەری ئەم کتێبە لەسەر شێوازی ئیمامی بوخاری کتێبەکەی داناوە لە ڕووی باسکردنی بابەتەوە، لە ژێر بابەتەکە ئایەت و فەرموودەی باسکردووە کە ئایەتەکە بەڵگەیە بۆ بابەتەکە و فەرموودەکەش بەڵگەیە بۆ بابەتەکە و ئەوەی دواتریش تەفسیرە بۆی، هەروەها وتەی ئەهلی عیلمی باسکردووە لە هاوەڵان و تابعین و پێشەوایانی ئیسلام، ئەمەی دانەر

كردوویەتی ڕێگای ئیمامی بوخاری بووە کە لە کتابی (صحیح بوخاری)دا بەم شێوەیە دایڕشتووە و بابەتی باسکردووە و وتەی زانایانی هێناوەتەوە بۆ ڕوون کردنەوە.) [١].

[١] التمهيد لاپەڕە (٨).

## (لشيخ الإسلام محمد بن عبدالوهاب)

دانەری کتاب ناوی (محمدی کوڕی عبدالوهابی کوڕی سلیمانی کوڕی علی کوڕی محمدی کوڕی احمدی کوڕی راشدی کوڕی برید کوڕی مشرفی کوڕی عمر)ە، لە شاری (عیینە) لە نەجد لە دایک بووە لە سالی (١١١٥)هیجری، لەلای باوکی و لە خانەوادەیەکی خاوەن زانست پێگەیشتووە.

لە شاری خۆی هەندێک زانستی وەرگرتووە و پاشان دوو جار سەفەری کردووە بۆ حجاز و شام، هەر لە تەمەنی منالییەوە خوێندنەوەی زۆر بوو بۆ کتێبی تەفسیر و فەرموودە و وتەی زانایان، لە لای چەندین مامۆستا زانستی وەرگرتووە لەوانە:

١- محمد حياة السندي

٢- عبدالله بن إبراهيم بن سيف

٣- محمد المجموعى البصرى

٤- عبدالله بن سالم البصرى

٥- عبداللطيف العفالقى

خوای گەورە سینگی کردۆتەوە بۆ تێگەیشتنی یەکخواپەرستی و حەقیقەتی بیروباوەڕ و زانینی هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام، لە سەردەمێکدا ژیاوە کە شیرک زۆر بەربڵاوبووە لە نەجد و شوێنەکانی تری ناو خاکی موسڵمانان، دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ڕاست و دروست، خوای گەورە بەرەکەتی خستە بانگەوازەکەی و خەڵکێکی زۆر سوودمەند بوون لێی و فێری بیروباوەڕی ڕاستەقینە بوون بەو هۆیەوە بانگەوازەکەی چەندین وڵاتی گرتەوە، ئێستاش سوپاس بۆ خوا چەندین موسڵمان لە چەندین وڵات

لەسەر ڕێچکەی ئەو دەڕۆن و کتابەکانی بە وانە دەخوێنن، لە ساڵی (١٢٠٦)هیجری لە شاری (درعییە) کۆچی دوایی کردووە، بە ناوبانگترین کتابەکانی ئەمانەن:

١- كتاب التوحيد الذي هو حق الله على العبيد.

٢- كشف الشبهات في التوحيد.

٣- الأصول الثلاثة وأدلتها.

٤- أصول الإيمان.

٥- تفسير الفاتحة.

٦- المسائل التي خالف فيها رسول الله أهل الجاهلية.

# (الشيخ الإسلام)

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ناونان بە (شیخ الإسلام) وەک ئەوەی بلێیت: شیخ الإسلام ابن تیمیه یان شیخ الإسلام محمد بن عبدالوهاب، واته: مەبەست پێی مطلق بێت و بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، ئەمەیان دروست نییە، چونکە ئیمامی ئەبو بکر خوا لێی ڕازی بێت لەپێشترە بۆ ئەم وەسفە، چونکە باشترین دروستکراوە دوای پێغەمبەران (علیهم السلام)، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی وەسف کردن بێت بە نوێ کەرەوەی ئیسلام و پاشماوەی باشی هەبووبێت و ڕۆڵێکی چاکی هەبووبێت بۆ پارێزگاری کردن لە دین، ئەوە هیچی تێدا نییە و دروستە)[1].

هەروەها دەفەرمووێت: (لەقەبی شیخ الإسلام بە مطلقی دروست نییە، واته شیخ بە مطلقی بۆ ئیسلام دەگەڕێتەوە نابێت کەس پێی وەسف بکرێت، چونکە کەس معصوم و پارێزراو نییە لە هەڵە و لەوەی کە بۆ ئیسلام دەڵێت جگە پێغەمبەران (علیهم السلام) نەبن.

بەڵام ئەگەر مەبەست بە شیخ الإسلام کەسێک بێت گەورە بێت لە ناو ئیسلام و ڕۆڵی هەبێت و دینی نوێ کردبێتەوە لە شیرک و بیدعە و و ڕاستگۆ بێت، ئەوە دروستە وەسفی بکەیت بەم لەقەبە) [2].

---

[1] القول المفید (٣/٢-٥).

[2] کتاب التوحید لاپەڕە (٢٩-٣٠).

## (بسم الله الرحمن الرحيم)

## كتاب التوحيد

**وقول الله تعالى:** ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ [الذاريات: ٥٦]

**وقوله:** ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ [النحل: ٣٦]

**وقوله:** ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ [الإسراء: ٢٣]

**وقوله:** ﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ [النساء: ٣٦]

**وقوله:** ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ [الأنعام: ١٥١]

**قال ابن مسعود رضي الله عنه: من أراد أن ينظر إلى وصية محمد (ﷺ) التي عليها خاتمة فليقرأ قوله تعالى:** ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ إلى قوله تعالى: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ [الأنعام: ١٥١-١٥٣] [1].

**وعن معاذ بن جبل رضي الله عنه قال: كنت رديف النبي (ﷺ) على حمار فقال لي: (يا معاذ أتدري ما حق الله على العباد، وما حق العباد على الله؟) فقلت: (الله ورسوله أعلم). قال: (حق الله على العباد أن يعبدوه ولا يشركوا به شيئا، وحق العباد على الله أن لا**

---

[1] أخرجه الترمذي (٣٠٧٠)، والبيهقي في "الشعب الإيمان" (٢٠٧/٦ رقم ٧٩١٨)، وضعفه الألباني في "ضعيف سنن الترمذي" ص(٣٧٥).

**يعذب من لا يشرك به شيئا)، فقلت: يا رسول الله أفلا أبشر الناس؟ قال: (لا تبشرهم فيتكلوا) أخرجاه في الصحيحين.** [١]

**فيه مسائل:**

**الأولى:** الحكمة في خلق الجن والإنس.

**الثانية:** أن العبادة هي التوحيد؛ لأن الخصومة فيه.

**الثالثة:** أن من لم يأت به لم يعبد الله، ففيه معنى قوله تعالى: ﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣﴾ [الكافرون: ٣]

**الرابعة:** الحكمة في إرسال الرسل. الخامسة: أن الرسالة عمت كل أمة.

**السادسة:** أن دين الأنبياء واحد.

**السابعة:** المسألة الكبيرة أن عبادة الله لا تحصل إلا بالكفر بالطاغوت؛ ففيه معنى قوله: ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ﴾.

**الثامنة:** أن الطاغوت عام في كل ما عبد من دون الله.

**التاسعة:** عظم شأن ثلاث الآيات المحكمات في سورة الأنعام عند السلف. وفيها عشر مسائل، أولها النهي عن الشرك.

**العاشرة:** الآيات المحكمات في سورة الإسراء، وفيها ثماني عشرة مسألة، بدأها الله بقوله: ﴿لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومٗا مَّخۡذُولٗا ٢٢﴾ [الإسراء: ٢٢]) وختمها بقوله:

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٩٦٧)، ومسلم (٣٠).

﴿وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا٣٩﴾ [الإسراء: ٣٩]، ونبهنا الله سبحانه على عظم شأن هذه المسائل بقوله: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ﴾

**الحادية عشرة:** آية سورة النساء التي تسمى آية الحقوق العشرة، بدأها الله تعالى بقوله: ﴿۞وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾.

**الثانية عشرة:**التنبيه على وصية رسول الله (ﷺ) عند موته.

**الثالثة عشرة:** معرفة حق الله تعالى علينا.

**الرابعة عشرة:** معرفة حق العباد عليه إذا أدوا حقه.

**الخامسة عشرة:** أن هذه المسألة لا يعرفها أكثر الصحابة.

**السادسة عشرة:** جواز كتمان العلم للمصلحة.

**السابعة عشرة:** استحباب بشارة المسلم بما يسره.

**الثامنة عشرة:** الخوف من الاتكال على سعة رحمة الله.

**التاسعة عشرة:** قول المسؤول عما لا يعلم: الله ورسوله أعلم.

**العشرون:** جواز تخصيص بعض الناس بالعلم دون بعض.

**الحادية والعشرون:** تواضعه (ﷺ) لركوب الحمار مع الإرداف عليه.

**الثانية والعشرون:** جواز الإرداف على الدابة.

**الثالثة والعشرون:** فضيلة معاذ بن جبل.

**الرابعة والعشرون:** عظم شأن هذه المسألة.

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

دانەری کتاب سەرەتا بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەستی پێ کردووە، لە زمانی عەرەبی بە دانەری کتاب دەڵێن: (مؤلف) و (مصنف)، ئایا جیاوازی چییە لە نێوانیان؟

وەڵام: سەبارەت بەم دوو وشەیە دوو وتەیان هەیە:

(١) هەندێ زانا دەڵێن هەردووکیان یەک مانا هەڵدەگرن، هیچ جیاوازی نییە لە نێوان (مؤلف) و (مصنف).

(٢) هەندێ زانای تر دەڵێن (مؤلف) ئەوەیە کە وتەی کەسانی تر دەهێنێتەوە، بەڵام (مصنف) ئەوەیە کە بە دەربڕینی خۆی دەنووسێت.

ئەگەر وردبیتەوە لە چەندین کتێب ئەگەر دانەری کتێب تەنها وتەی بێجگە لە هی خۆی بنووسێت لە کتێبەکەیدا، زانایان پێی دەڵێن: (مؤلف)، وەک: کتابی فەرموودە یان کتێبێک تەنها ئایەت و فەرموودەی نووسیوە، ئەمەیان پێی دەڵێن (مؤلف).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (دانەری کتاب سەرەتای کتابەکەی بە (بسم الله) دەستی پێ کردووە وەک هەموو دانەرەکانی تر، وەک شوێن کەوتنی کتێبی خوای گەورە کە بە (بسم الله) دەستی پێکردووە لە سەرەتای هەموو سورەتێکدا و هەروەها وەک شوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)) [1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (لێرە دەبێت ئێمە ئەوە بزانین کە ئەوانەی لەم سەردەمە (بسم الله الرحمن الرحيم) نانووسن لە سەرەتای کتابەکانیاندا پێچەوانەی سوننەتیان کردووە و شوێن ڕۆژئاوا کەوتوون، ئەگەرنا ئەوەی ڕێگە پێدراوە بۆ حەق

[1] القول المفيد (١/٢٠-٢٥).

ئەوەیە موسلمان بەم وشەیە دەست پێ بکات بۆ کارەکانی و کتابەکانی و وتار و وانەکان و نامەکان، مەگەر ئەوە نەبێت ئەم وشەیە بەرامبەر شیعری هجاء و یان زەم کردنی تێدا بێت نانووسرێت، هەروەها بەرامبەر وشەیەک نانووسرێت کە جنێو بێت یان قسەی ناشرین و ناخۆش و نارێک بێت، نانووسرێت وەک بە پاک دانانی ئەم وشەیە ....

لەوانەیە کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی کتابەکەی بە (الحمدلله رب العالمين، والصلاة و السلام على النبي) دەست پێ نەکردووە؟

وەلام لە دوو ڕووەوەیە:

١- ئەمەیان بەسە کە بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەستی پێکردووە، چونکە ئەمە بەسە بۆ مەدح کردنی خوای گەورە و بەسە بۆ دەست پێکردن.

٢- (عبدالرحمن بن حسن) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: نسخەی دانەری کتێبم لە لایە بە دەست نووسی دانەر کە ئەم کتابەی دەست پێکردووە بە وتەی: (الحمدلله رب العالمين، و الصلاة والسلام على نبينا محمد).

کەواتە لەم نوسخەیە هەردووکی باسکردووە، سەرەتا بە: (بسم الله الرحمن الرحيم) دەستی پێکردووە، وە بە: (الحمدلله رب العالمين) دەستی پێکردووە، بێگومان ئەمەیان باشترە، پاشان دەڵێت: كتاب التوحيد) [1].

**(بسم الله):** الباء للاستعانة: واتە: بەناوی خوا دەخوێنمەوە، یان بەناوی خوا دەست نوێژ دەگرم، داوای یارمەتی لە خوا دەکەم و تەبەڕوک بەناوی خوا دەکەم.

---

[1] إعانة المستفيد (١/٢١-٢٢).

**(الله):** ناوێکه له ناوەکانی خوای گەورە، کەسی تر جگە لە خوای گەورە ئەم ناوەی نییە، ئەم ناوە بنچینەی هەموو ناوەکانە، لەبەر ئەوە دەوترێ: (الرحمن) و (الرحیم) ناوی (الله)ن، بەڵام ناگوترێ: (الله) ناوی (الرحمن)ە، یان (الرحیم)ە، یان ناوی (الحکیم)ە.

مانای ناوی (الله)، واتە: پەرستراوێکە خۆشت بوێت و بەگەورەی دابنێی.

**(الرحمن):** خاوەن ڕەحمێکی فراوانە، لەسەر وەزنی (فعلان)ە، بە مانای زۆری و فراوانی دێت.

**(الرحیم):** لەسەر وەزنی (فعیل)ە، (الدال علی وقوع الفعل)، بەمانای ڕوودانی کارەکە دێت.

کەواتە، (الرحمن ذو الرحمة الواسعة)، (والرحیم ذو الرحمة الواصلة)، واتە (الرحمن): خاوەنی ڕەحمەتێکی فراوانە لێرە ڕەحم سیفەتە، (الرحیم): خاوەن ڕەحمێکی گەینەرە، ڕەحم کارەکەیەتی.

کەواتە ئەگەر (الرحمن) و (الرحیم) هەردووکیان پێکەوە هاتن هەر یەکەیان مانای خۆی هەڵدەگرێت، یەکێکیان سیفەتی زاتی هەڵدەگرێت و ئەوەی تر سیفەتی (فعلي)، نموونە:

- خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴿١٦٣﴾﴾ [البقرة: ١٦٣]

بەڵام ئەگەر هەر یەکەیان بە تەنیا هات، ئەوە دەلالەت لەسەر سیفەتی ڕەحمی خوای گەورە دەکات بە اعتباری زاتی الله و سیفەتی فعلی.

جیاوازی نێوان ئەم دوو ناوە:

١- (الرحمن): خاوەن ڕەحمێکی فراوانە هەموو دروستکراوەکان دەگرێتەوە لە دونیا و تەنها ئیمانداران دەگرێتەوە لە قیامەت.

(الرحيم): خاوەن ڕەحم و بەزەییە تەنها بۆ ئیمانداران.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمًا﴾ [الأحزاب: ٤٣]، لەم ئایەتە ئیمانداری تایبەت کردووە بەو ناوەی خۆی.

بەڵام خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [البقرة: ١٤٣]، واتە: خوای گەورە بەرامبەر خەڵک زۆر بە بەزەییە.

لەم ئایەتە هەموو خەڵکی تایبەت کردووە بە ناوی خۆی، بەڵام دەڵێین خەڵکیش لێرە مەبەست پێی ئیماندارانن.

٢- (الرحمن): دال على صفة ذاتية، واتە: دەلالەت لەسەر سیفەتی خۆی (ذات)ی دەکات.

(الرحيم): دال على صفة فعلية، واتە: دەلالەت لەسەر سیفەتی کار (فعل) دەکات.

٣- (الرحمن): خاص الاسم عام المعنى، واتە: ناوێکی تایبەتە و مانای گشتییە.

(الرحيم): عام الاسم خاص المعنى، واتە: ناوێکی گشتییە و مانای تایبەتە.

کەواتە (الرحمن) ناوێکە نەهی کراوە مرۆڤ لە خۆی دابنێت، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا﴾ [الإسراء: ١١٠]

لەم ئایەتە ناوی (الله) و (الرحمن) ی پێکەوە باسکردووە، دەوترێت ئەمە بەڵگەیە کە نابێت ناوی (الرحمن) لەخۆت بنێیت هەر وەک چۆن نابێت ناوی (الله) لە خۆت بنێیت.

بەلام بۆ ناوی (الرحيم) خوای گەورە وەسفی پێغەمبەری کردووە بە رحيم و دەفەرموویت:

﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴿١٢٨﴾﴾ [التوبة: ١٢٨]

ئەم ئایەتە مەبەست پێی پێغەمبەرە (ﷺ)، دەوترێت: (رجل رحيم) بەڵام ناوترێت: (رجل رحمن).

ابن كثير ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (بە ناوی (الله) دەست پێکراوە، وەسفی کردووە بە (الرحمن)، چونکە تایبەتترە و زانراوترە لە (الرحيم)، چونکە ناوەکان یەکەم جار بە بەڕێزترینیان دەست پێ دەکرێت، پاشان بە ناوی تایبەت تر پاشان تایبەت تر)[1].

(١) تفسير ابن كثير (٤٣/١).

# كتاب التوحيد

زانایان تەوحیدیان دابەش کردووە بۆ سێ بەش.

جۆری یەکەم: توحید الربوبیة (إفراد الله بأفعاله): واتە: یەکخواپەرستی لە پەروەردگاریەتیدا، ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە بە تەنیا دابنێیت لە کردەوەکانی، لە دروستکردن و رزق و ڕۆزی دان و ژیان و مردن و بەڕێوەبردنی دونیا و دروستکراوەکان، ئەمە یەکخواپەرستی یە لە پەروەردگارێتیدا، هیچ دروستکراوێک و هیچ ڕۆزی دەرێک و هیچ زیندوو کەرەوەیەك و هیچ ژیێنەرێک و هیچ مرێنەرێک و هیچ زیان گەێنەرێک و هیچ سوودت پێ گەێنەرێک نییە مەگەر زاتی خوای تبارک و تعالی، ئەم جۆرە تەوحیدە هەر کەسێک تەنها دان بەمە بنێت نابێتە موسڵمان، چونکە کافرەکانیش دانیان بەم جۆرە تەوحیدەیان ناوە.

جۆری دووەم: توحید الألوهیة (إفراد الله بالعبادة): یەکخواپەرستی لە بەندایەتی کردن دا، واتە خوا بە تەنیا دانانە لە عیبادەتدا، ماناکەی بە تاک دانانی خوای گەورەیە لە عیبادەتدا، ئەمەیان باسی بێجگە لە بەتاک دانانە لە دروستکردن و ڕزق ڕۆزی و بەڕێوەبردن، بەڵکو بە تاك دانانی خوای گەورەیە لە عیبادەت کە کەس ناپەرسترێت مەگەر خوای گەورە، نوێژ ناکەیت و دوعا ناکەیت و ئاژەڵ سەر نابڕیت و نەزر ناکەیت و حەج ناکەیت و عومرە ناکەیت و خێر ناکەیت مەگەر بۆ خوای گەورە، دەبیت تەنها مەبەستت خوا بێت، لەمەیان کێشە و جیاوازی کەوتە نێوان پێغەمبەران و ئوممەتەکانیان.

جۆری سێیەم: توحيد الأسماء و الصفات: یەکتاپەرستی لە ناو و سیفەتدا، واتە ئەوە جێگیر بکەین بۆ خوا ئەوەی خوای گەورە بۆ خۆی جێگیر کردووە و پێغەمبەر جێگیری کردووە لە ناو و سیفەت، بێ ئەوەی تحريف و تعطيل و تكييف و تمثيل بکەیت.)[١].

هەندێک زانا تەوحید دابەش دەکەن بۆ دوو بەش:

(١) توحيد في المعرفة و الإثبات.

(٢) توحيد في القصد و الطلب.

مەبەست بە: (فى المعرفة و الإثبات) ناسینی خوای گەورەیە بە کردەوەکانی، ئەمە تەوحیدی پەروەردگاریەتییە، وە (الإثبات) باسی ئەوەیە ئەوەی خوای گەورە بۆ خۆی جێگیرکردووە لە ناو و سیفەت، ئەمەش تەوحیدی ناو و سیفەت، وە (فى القصد و الطلب) تەوحیدی بەندایەتی کردنە.

وە دابەش کردنی تەوحید بۆ سێ بەش: (الربوبية) و (الألوهية) و (الأسماء و الصفات) ئەمانە لە وتەکانی زانایانی پێش تریش هاتووە، لە أبی جعفر الطبری لە تەفسیرەکەی و لە کتابەکانی تری، وە لە وتەی ابن بطة و وتەی ابن منده و ابن عبدالبر و بێجگە لە ئەمانە و زانایانی تری فەرموودە هاتووە، پێچەوانەی ئەوانەی دەڵێن یەکەم کەس ئەم دابەش کردنەی دانابێت ابن تيميه بووە، ئەم دابەش کردنە لە کۆنەوە دەزانرێت هەر کەسێک سەیری کتابی زانایانی پێشتر بکات[٢].

---

[١] إعانة المستفيد (١/٢٥-٢٦).

[٢] جامع الشروح العقيدة الطحاوية (١/٦٥).

محمد بن عبدالرحمن الخميس دەفەرموويێت: (ئەم دابەش كردنە لە قورئان و سوننەت وەرگیراوە، زانایان لە قورئان و سوننەت دەریان هێناوە و لەسەری ڕۆیشتوون پێش ابن تیمییە)[1].

پوخـــتەی وتەی زانایان:

١- زانایان تەوحیدیان دابەش كردووە بۆ سێ بەش و هەندێكیشیان دابەشیان كردووە بۆ دوو بەش، كە هەمان مانای دابەش كردنی بۆ سێ بەشەكەی تێدایە.

٢- ئەم دابەش كردنەی تەوحید بۆ سێ بەش لە قورئان و سوننەت وەرگیراوە بۆ كار ئاسانی و تێگەیشتن.

٣- زانایانی پێش ابن تیمییە ئەم دابەش كردنەی تەوحیدیان لە وتە و كتابەكانیان دا دیارە، یەكەم كەس ابن تیمییە نەبووە ئەم دابەش كردنەی داهێنابێت هەروەک هەندێک لە ئەهلی بیدەع ئەمە دەڵێن.

٤- هەر كەسێک دان بە تەوحیدی پەروەردگاریەتی دابنێت نابێتە موسڵمان، چونكە كافرەكانیش دانیان بەمە دەنا، بەڵكو كێشە لەسەر یەكخواپەرستی بەندایەتی كردن بووە (ألوهية).

---

[1] التوضيحات الجلية (١/١١٦).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ۝٥٦﴾ [الذاريات: ٥٦]

واته: خوای گەورە دەفەرموویٚت: (بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿ٱلْجِنَّ﴾: لەبەر ئەوە پێی دەڵێن جن چونکە شاراوەن لە مرۆڤ و نایانبینن.

﴿إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ واتە: تەنها بۆ ئەوەی تەنها خوا بپەرستن، لامەکە لامی تەعلیلە.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویٚت: (عیبادەت: ناوێکی گشتییە بۆ هەموو شتێک کە خوای گەورە خۆشی بویٚت و پێی ڕازییە لە وتە و کردەوەی دیار و شاراوە)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویٚت: (ئەم ئایەتە حصری تێدایە، ئەوەی زانراو بێت (ما)ی نافیە لەگەڵ (إلا) مانای (حصر) و (قصر) هەڵدەگرن، مانای ڕستەکە بەم شێوەیە: من جنۆکە و مرۆڤم دروستکردووە بۆ یەک مەبەست، ئەویش عیبادەت کردنە تەنها بۆ خوا، لێرە عیلەتی دروستکردنی (قصر) کردووە تەنها بۆ عیبادەت)[2].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە جنۆکە و مرۆڤ تەنها بۆ کردنی عیبادەت دروستکراون، دەبێت تەنها خوا بپەرستن و هیچ شەریکی بۆ بڕیار نەدەن.

---

(١) العبودية لاپەڕە (٤٤).

(٢) التمهيد لاپەڕە (٢١).

**سوودەكانی ئایەتەكە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە خوای گەورە جنۆكە و مرۆڤی دروستكردووە تەنها بۆ ئەوەی بە تەنیا بیپەرستن و هیچ شەریكی بۆ بڕیار نەدەن، سەیری ووردی دانەری كتێب بكە دەفەرموویت: (كتاب التوحيد)، دواتر وتەی خوای گەورەی هێناوە: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ۝٥٦﴾، بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە مانای تەوحید چییە؟ تەوحید ماناكەی ئەوەیە خوای گەورە بە تەنیا دابنێیت لە عیبادەتدا، ماناكەی ئەوە نییە دان بە پەروەردگاریەتیدا بنێیت و بەتەنها و بەس! بەڵكو ماناكەی بە تەنیا دانانی خوای گەورەیە لە عیبادەت بە بەڵگەی ئەم ئایەتە و جگە لەم ئایەتەش[١].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە ئیماندار باوەڕی بە جنۆكە هەبێت، هەر كەسێك بڕوای پێ نەبێت ئەوا قورئان و سوننەتی بەدرۆ خستۆتەوە، زانایان دەڵێن چەندین ئایەت و فەرموودەی ڕوون و ئاشكرا هاتوون كە خوای گەورە جنۆكەی دروستكردووە، ئەوانیش وەك مرۆڤ داوایان لێكراوە بۆ فەرمان و نەهی، هەیانە ئیماندارە و هەیانە كافرە، ڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكرێت یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ.

ابن تيميه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (هیچ كۆمەڵێك لە موسڵمانان ئینكاری بوونی جنۆكەی نەكردووە و زۆربەی كۆمەڵی كافرانییش دان بە بوونی جنۆكە دەنێن)[٢].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئینكاری كردنی جنۆكە كوفرە و هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام، چونكە ئینكاری كردنی قورئان و سوننەتە، كە چەندین ئایەت و فەرموودە و هەواڵ نەقل كراون سەبارەت بە بوونیان، ئیمان هێنان بە بوونیان ئیمان

---

[١] (إعانة المستفيد) لصالح الفوزان (٣١/١).
[٢] مجموع الفتاوى (١٨/١٠).

هێنانە بە غەیب، چونکە ئێمە ئەوان نابینین بەڵکو پشت دەبەستین بە هەواڵی ڕاست، خوای گەورە سەبارەت بە ئیبلیس و دار و دەستەکەی دەفەرموویێت: ﴿إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ﴾ [الأعراف: ٢٧].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەوانەی ئینکاری دەکەن پشت بە چی دەبەستن؟ پشت بە شتێک دەبەستن ئەویش ئەوەیە کە نایان بینن، ئایا هەموو شتێک ئەگەر بوونی هەبێت دەبێت ببینرێت؟ چەندین شت هەن و نایان بینین کەچی بوونیان هەیە، نموونە: ڕوح ئەوەی لە تۆدا هەیە ئایا دەیبینی؟ عەقڵ بوونی هەیە و لەگەڵ ئەوەش نابینرێت)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئیمان بە جنۆکە واجبە، ئیمان بە بوونیان و بەوەی کە خوای گەورە هەواڵی بە ئێمە داوە لە قورئان و لەوەی کە فەرموودە باسی کردووە سەبارەت بە سیفەتیان، هەر کەسێک ئینکاری جنۆکە بکات کوفرە، چونکە قورئانی بە درۆ خستۆتەوە)[2].

**٣-** جنۆکەش وەک مرۆڤ داوای لێکراوە عیبادەت بکات و ئەوانیش ئیماندار و کافریان هەیە وەک مرۆڤ.

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە جنۆکەش وەک مرۆڤ ئیمانداری دەچێتە بەهەشت و کافری دەچێتە دۆزەخ، چونکە هەردووکیان وەک یەک داوایان لێ کراوە بۆ عیبادەت.

---

[1] إعانة المستفيد (٣٢/١).

[2] شرح الطحاوية.

هەموو زانایان یەک دەنگن کە کافری جن دەچێتە دۆزەخ، بەڵام جیاوازی لەوەدایە ئایا ئیمانداری جنۆکە دەچێتە بەهەشت یان نا، دوو وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان دەڵێن ئیمانداری جن دەچێتە بەهەشت، بەڵگە:

- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ۝٥٦﴾ [الذاريات: ٥٦]، مرۆڤ چۆن کردەوەی لەسەرە و پاداشت و سزای بۆ هەیە جنۆکەش بەهەمان شێوە.

- چەندین ئایەت هاتوون باسی پاداشت دەکات بۆ ئیمانداران کە بەهەشت و چوونە بەهەشتە، ئەم ئایەتانە ئیمانداری جنۆکە و مرۆڤ هەردووکیان دەگرێتەوە.

- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ۝٤٦﴾ [الرحمن: ٤٦]، ئەم ئایەتە باسی مرۆڤ و جنۆکەیە.

- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ۝٧٤﴾ [الرحمن: ٧٤]

واتە: حۆرییەکانی بەهەشت، بەر لە بەهەشتییەکان هیچ مرۆڤ و جنۆکەیەک دەستیان بۆ نەبردوون واتە کچێتیان لانەبردوون، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە جنۆکەش دەچێتە بەهەشت.

دووەم: هەندێک زانا دەڵێن ئیمانداری جن ناچێتە بەهەشت، بەڵکو پاداشتیان تەنها ڕزگار بوونە لە دۆزەخ و ئاگر، پاشان دەبن بە خۆڵ، بەڵگە:

- هیچ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا نەهاتوون لە قورئان و سوننەت کە جن وەک مرۆڤ دەچێتە بەهەشت.

- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ۝٣١﴾ [الأحقاف: ٣١]

واتە: جنۆکەکان کاتێک گوێیان لە قورئان بوو چوون بۆلای قەومی خۆیان وتیان: ئەی قەومی ئێمە وەڵامی بانگبەرەکەی خوا بدەنەوە و ئیمانی پێی بهێنن، لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت و لە سزای بە ئێشیش دەتانپارێزێت.

لەم ئایەتە باسی پاداشت بۆ جن کراوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئیمان بێنن لێ خۆش بوون و ڕزگار بوون لە سزا بۆیان هەیە، ئەگەر پاداشتێکی گەورەتر هەبوایا لە ڕزگار بوون لە ئاگر باسی دەکرد کە ئەویش چوونە بەهەشتە، بەڵگەیە بەهەشت بۆ جن نییە تەنها پاداشتیان ڕزگار بوونە لە ئاگر.

- هەروەها دەڵێن جن نەوەی شەیتانن، نەوەی شەیتانیش ناچنە بەهەشت.

وتەی ڕاست وتەی زۆربەی زانایانە کە ئیمانداری جن دەچێتە بەهەشت، لە وەڵام دا دەڵێین:

- ئایەت بە ڕوونی باسی چوونە بەهەشتی جنۆکەی کردووە، گریمان باسیشی نەکردبێت بەڕوونی کە باسکراوە، دەڵێین باس نەکردن نابێتە بەڵگە کە چوونە بەهەشتیان بۆ نییە.

- دەلێین پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جنۆکە و مرۆڤ نێردراوە، بۆچی هەردووکیان وەک یەک نەبن بۆ پاداشت و سزا، بۆچی دەلێن دۆزەخیان بۆ هەیە، بەڵام بەهەشتیان بۆ نییە.

- ڕاستە ئایەتی سورەتی (الاحقاف) باسی ڕزگار بوون دەکات لە ئاگر، بەڵام خۆی لە خۆیدا ئاماژەی چوونە بەهەشتیشی تێیدایە، چونکە ئەوەی ڕزگار بێت لە ئاگر دەچێتە بەهەشتیش، هەروەها لەبەر ئەوە باسی ڕزگار بوون لە ئاگر دەکات چونکە کەم جن هەیە

لە ئاگر ڕزگاری ببێت، جن وەک مرۆڤ نییە ئەوان زیاتر دەچنە دۆزەخ، لەوانەیە یەکێک بڵێت ئەگەر وابێت کەم جنیش هەیە بچێتە بەهەشتیش، بۆچی باسی چوونە بەهەشتی نەدەکرد، دەڵێین ئایەتی تر ئاماژەی بۆ چوونە بەهەشتیانی کردووە.

- جن ناچێتە بەهەشت چونکە نەوەی شەیتانە یان چونکە جنە، ئەمە ڕاست نییە، ئەگەر وابێت نەوەی ئەبو تالبیش ناچنە بەهەشت یان نەوەی کافرێکی تری مرۆڤیش ناچنە بەهەشت.

لەوانەیە یەکێک بڵێت جنۆکە چۆن سزا دەدرێن لەکاتێکدا خۆیان لە ئاگر دروست کراون؟

سەبارەت بەم پرسیارە زانایان دەڵێن:

یەکەم: لەوانەیە جن لە ئێستا ئاگر نەبن هەروەک چۆن مرۆڤ لەخۆڵ دروستکراوە یان لە مەنی و ئاو دروستکراوە، جنیش هەمان شتە ئەسڵی ئاگرە بەڵام ئیستا ئاگر نییە، بەڵگە:

عن عائشة رضي الله عنها أن رسول الله (ﷺ) كان يصلي فأتاه الشيطان فأخذه فصرعه فخنقه، قال رسول الله (ﷺ): (حتى وجدت برد لسانه على يدي ولولا دعوة أخي سليمان (عليه السلام) لأصبح موثقا حتى يراه الناس)[1].

واتە: عائشە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد شەیتان هات، شەیتانی گرت و خنکاندی فەرمووی: (هەتا هەستم بە ساردی زمانی شەیتان کرد، ئەگەر لەبەر دوعای برای خۆم سولەیمان نەبوایا ئەوە شەیتانم گرێ دەدا تا خەڵک ببینن).

[1] رواه النسائي في "السنن الكبرى" (٤٤٢/٦)، وصححه ابن حبان (١١٥/٦).

ئەگەر شەیتان ئاگر بوایا چۆن هەستی بەساردی زمانی دەکرد، نالێین جن لە ئاگر دروست نەکراوە بەڵکو ئایەت هاتووە و ئەمەی سەلماندووە، بەڵام دەڵێین لەوانەیە ئەویش ئێستا ئاگر نەبێت وەک مرۆڤ کە ئەسڵی خۆڵە یان ئاوە کەچی ئێستا گۆشت و ئێسک و خوێنە، والله أعلم.

أبو الوفاء بن عقيل دەفەرمووێت: (شەیتان و جنۆکەکان دراونەتە پاڵ ئاگر بەوەی کە لە ئاگر دروستکراون هەروەک چۆن مرۆڤ دراوەتە پاڵ خۆل و قوڕ و فەخار، مەبەست لە مرۆڤ ئەوەیە کە ئەسڵی قوڕە، مرۆڤ لە ڕاستیدا قوڕ نییە، جنۆکەش بە هەمان شێوە ئەسڵی ئاگرە)[١].

دووەم: عەقڵەن دەگونجێت ئاگر بە ئاگر سزا بدرێت، هەروەک چۆن ئێستا ئەگەر کەسێک زلەیەک لە کەسێکی تر بدات هەست بە ئازار دەکات کەچی دەستی مرۆڤ گۆشت و ئێسکە و رووەتیشی هەر گۆشت و ئێسکە، جنۆکەش بەهەمان شێوە.

سێیەم: خۆشیەکانی بەهەشت و سزاکانی دۆزەخ غەیبین دەبێت باوەڕت پێی هەبێت، چونکە وەک دونیا نین، نابێت وەک دونیا لێکی بدەیتەوە و بلێی فلانە شت ناچێتە عەقڵم، بەڵکو دەبێت تەسلیم ببیت.

**٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە جنۆکەش دەبێت پێغەمبەریان هەبێت، جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان سێ وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان دەڵێن لە (جن) نە (رسول) هەبووە و نە (نبی).

---

[١] لقط المرجان في أحكام الجان" (ص٣٣) بواسطة "عالم الجن والشياطين" لاپەڕە (٥٨).

دووەم: هەندێ زانا دەڵێن لە جیهانی جنۆکە پێغەمبەران نەبوونە و نەنێردراون بەڵام ترسێنەر بۆیان نێردراون.

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون لە جن پێغەمبەر نێردراون.

وتەی ڕاست وتەی زۆربەی زانایانە کە لە جیهانی جنۆکە پێغەمبەر نەبووینە.

**٦-** حیکمەتی لە پێش خستنی جن چییە لەم ئایەتە، بۆچی لەم ئایەتە یەکەم جار باسی جنی کردووە پاشان مرۆڤ؟

وەڵام: زانایان دوو وتەیان هەیە:

- ئێمە دەڵێین: عیبادەت دوو جۆرە نهێنی و ئاشکرا، عیبادەتی نهێنی فەزڵ و چاکەی زیاترە بەسەر عیبادەتی ئاشکرادا، عیبادەتی جن نهێنییە و ڕیایی گەورەی تێدا نییە، بەلام عیبادەتی مرۆڤ ڕیای داخل دەبێت، ...[1].

بەڵام ئەم وتەیە لە جێگای خۆی نییە، ڕاستە ئێمە جن نابینین بەڵام مانای وا نییە کە ئەوان تووشی ڕیاء نابن، زۆر ئاساییە ئەوانیش وەک مرۆڤ عیبادەتی نهێنی و ئاشکرایان هەیە و تووشی ریاء دەبن.

- شەوکانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هۆی پێش خستنی جن بە پێش مرۆڤ لەبەر پێش کەوتنی بوونیانە، واتە یەکەم جار خوای گەورە جنی دروستکردووە و جنوکە پێش مرۆڤ بوونیان هەبووە.)[2].

---

[1] التفسير الكبير(٢٣٣/٢٨/١٤).
[2] فتح القدير(٩٢/٥).

**وقوله:** ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ [النحل: ٣٦]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا﴾: (الأمة) لە قورئان چوار مانای هەیە:

یەکەم: (الطائفة)، واتە کۆمەڵ.

دووەم: (الإمام)، واتە پێشەوا.

سێیەم: (الملة)، واتە دین.

چوارەم: (الزمن)، واتە کات.

هەموو ئوممەتێک پێغەمبەری بۆی نێردراوە لە سەردەمی نوح (عليه السلام) تا سەردەمی پێغەمبەری ئێمە محمد (ﷺ).

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە عیبادەت دروست نییە تا کوفر بە تاغوت دەکەیت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** لاچوونی حوجە لەسەر ئوممەتەكان بە ناردنی پێغەمبەر بۆیان، كە تەنها عیبادەتی خوا بكەن و خۆیان بەدوور بگرن لە شیرک و تاغوت، لەبەر وتەی: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾.

**٢-** خوای گەورە بۆ هەموو ئوممەتێک پێغەمبەری ناردووە، ئەوانەی كە دینیان پێ نەگەیشتووە خوای گەورە سزاییان نادات هەتا پێغەمبەریان بۆ نەنێرێت، بەڵگە:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا﴾ [الإسراء: ١٥].

حیكمەت لە ناردنی پێغەمبەران:

یەكەم: بۆ ئەوەی خەڵكی بیانویان نەمێنێت و ببنە بەڵگە بەسەریانەوە.

دووەم: بۆ ئەوەی ببنە ڕەحمەت بۆ خەڵكی.

سێیەم: ڕوون كردنەوەی ئەو ڕێگایە كە دەتگەیەنێتە خوای گەورە.

حامد بن محمد بن حسن ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (خوای گەورە بۆ هەموو ئومەتێک پێغەمبەری ناردووە، ئومەتێكی تایبەت نەكردووە بە ناردنی پێغەمبەر و بێجگە لە ئومەتی تر، بۆ ئەوەی دادپەروەری خوا بەدیار بكەوێت و حوجەكانی تەواو بێت بەسەر هەموو خەڵكدا)[1].

**٣-** تەوحید بریتی یە لە پەرستنی خوا بە تەنها و دوور كەوتنەوە و خۆ پاراستن لە شیرک، كە ئەمە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بووە.

---

[1] فتح الله الحميد المجيد (٦٢-٦٤)

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (کەواتە هەموو پێغەمبەران هاتوون بۆ بانگەوازی کردن بۆ تەوحید و نەهی کردن لە شیرک، ئەمە دینی پێغەمبەران بووە (ﷺ) کە یەک دین بووە، کەچی شەریعەتیان جیاواز بووە مەگەر ئەوە نەبێت دین و بیروباوەڕیان تەوحید بووە)[1].

**٤-** یەکخواپەرست دەبێت ڕازی نەبێت بە کردنی عیبادەت بۆ بێجگە لە خوا، دەبێت کوفری پێ بکات و دژایەتی بکات، چونکە چۆن فەرمان کراوە بە تەنها پەرستنی خوا، ئاواش فەرمان کراوە بە کوفر کردن بە طاغوت.

(طاغوت): هەر شتێک بپەرسترێت بێجگە لەخوا ئەوا طاغوتە ئەگەر ڕازی بێت، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبێت ئەوا تاغوت نییە، وەک: پەیکەر و گۆڕ و دار و بەرد و پیاو چاک، بەڵام عیسی یان حسن یان حسین یان پیاو چاک کە ڕازی نین بە پەرستنیان ئەوە طاغوت نین.

ئیمام مالک ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (الطاغوت کل ما عبد من دون الله)، واتە: هەرشتێک بپەرسترێت بێجگە لەخوا ئەوە تاغووتە.

**٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەموو ئوممەتێک و قەومێک پێغەمبەریان بۆ چووە، بەڵام ئایەتی تر هاتووە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ يَدۡرُسُونَهَاۖ وَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ قَبۡلَكَ مِن نَّذِيرٖ﴾ [سبأ: ٤٤] واتە: پێش تۆ هیچ ترسێنەرێکمان بۆیان نەناردووە.

[1] إعانة المستفيد (١/٣٦-٣٧).

وە لە ئایەتی (٢٤)ی سورةتی فاطر دەفەرموویێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ﴾ [فاطر: ٢٤]

واتە: هیچ قەومێک نییە ئیلا ترسێنەری بۆ چووە.

ئایەتی یەکەم دەفەرموویێت پێش تۆ ترسێنەریان بۆ نەچووە، ئایەتی دووەمیش دەفەرموویێت بۆ هەموو قەومێک ترسێنەر چووە؟

وەڵام: زانایان دوو وەڵامیان هەیە:

یەکەم: ئەو ئایەتەی دەڵێت ترسێنەر نەچووە پێش تۆ مەبەست پێی عەرەبە یان قورەیشە، چونکە پێش محمد (ﷺ) هیچ نێردراوێک بۆ عەرەب نەنێردراوە، رسول مژدە دەرن و ترسێنەرن، خوای گەورە ترسێنەری بۆ عەرەب نەناردووە تەنها محمد نەبێت، خوای گەورە ناردوویەتی بە ترسێنەر بۆ تێکڕای خەڵک.

دووەم: ئەو ئایەتەی نەفی ترسێنەر دەکات مەبەست پێی خەڵکی سەردەمی پێغەمبەرن (ﷺ)، واتە پێش تۆ بۆ ئەم خەڵکە ترسێنەرمان نەناردووە لەم کاتە.

**٦-** لەم ئایەتە: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾، ژمارەی پێغەمبەران دیاری نەکراوە و ئەو فەرموودانەی هاتوون و ژمارەی پێغەمبەرانی دیاری کردووە زانایان دەڵێن لاوازن، کەواتە کەس ژمارەیان نازانێت جگە لە خوا نەبێت.

- عن أبي ذر قال: قلت: يا رسول الله، كم الأنبياء؟ قال: (مائة ألف وأربعة وعشرون ألفا)، قلت: يا رسول الله، كم الرسل منهم؟ قال: (ثلاثمائة وثلاثة عشر جم غفير)، قلت: يا رسول الله، من كان أولهم؟ قال: (آدم) ... [١]

ابن تيمييه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ژمارەی کتێب و پێغەمبەران کەس نازانێت (واتە ژمارەیان دیار نییە چەندن)، وە فەرموودەی (أبي ذر) لای زانایان لاوازە)[٢].

**٧-** خوای گەورە مرۆڤی دروست نەکردووە بۆ ڕابواردن و گاڵتە، بەڵکو پێغەمبەری ناردووە بۆ ڕوونکردنەوەی بەرژەوەندی دین و دونیا، لەبەر وتەی ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾.

**٨-** ئەسل لە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران تەوحیدە، تەنها عیبادەتی خوا کردنە و نەهی کردنە لەشیرک.

---

[١] رواه ابن حبان (٣٦١).
[٢] مجموع الفتاوى (٤٠٩/٧).

**وقوله:** ﴿۞وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ﴾ [الإسراء: ٢٣]

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: (پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ﴾: (الوالدان): دایک و باوک و سەرووی دایک و باوک دەگرێتەوە، چەند لە تۆ نزیک بێت ئەوا لە پێشترە بۆ چاکە لەگەڵ کردن.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (خطاب لەم ئایەتە بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) بەڵام دەفەرمووێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، نەیفەرمووە: ﴿أَلَّا تَعۡبُد﴾، هاو شێوەی ئەمانە زۆرن لە قورئان، لەوانە وتەی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ [الطلاق: ١]، خطابی یەکەم بۆ پێغەمبەرە و هی دووەمیش گشتییە، سوودی گۆڕینی ئەم شێوازە چییە؟

وەڵام دەدرێتەوە بەوەی کە سوودەکانی ئەمانەن:

- ئاگادارکردنەوە و وشیار کردنەوەی بەرامبەرە، کە ئەمە شتێکی داوا کراوە بۆ قسەکەر، ئەم شێوازە هاتۆتە دی لەم ئایەتە.

- پێغەمبەر (ﷺ) زەعیمی ئوممەتەکەی خۆیەتی، ئەو خطابەی ڕووبەڕووی دەکرێتەوە ڕووبەڕووی هەموو ئوممەتی بۆتەوە.

- ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەوەی ئاراستەی پێغەمبەر کراوە بۆ پێغەمبەرە و بۆ ئومەتەکەشە، مەگەر بەڵگە هاتبێت و تایبەتی کردبێت بە پێغەمبەر (ﷺ).

- ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردەکراوە نەک پەروەردگارە، وە بەندەیە نەک پەرستراوە.

﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ﴾: واتە: خوای تۆ فەرمانی کردووە بە چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک.

(الوالدان): دایک و باوک و سەرووی دایک و باوک دەگرێتەوە، بەڵام دایک و باوک زیاتر، چەند لە تۆ نزیک بێت ئەوا لە پێشترە بۆ چاکە لەگەڵ کردن، وتەی خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ﴾، لە دوای: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، بەڵگەیە کە حەقی دایک و باوک لە دوای حەقی خوایە، ئەگەر بوترێ: ئەی کوا حەقی پێغەمبەر (ﷺ)؟

وەڵام: حەقی خوا حەقی پێغەمبەریشی لەخۆ گرتووە، چونکە خوا ناپەرسترێت مەگەر بەوە نەبێت کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی هاتووە و فێری کردووین، ...)[١].

خوای گەورە نەیفەرموو: (وإحسانا بالوالدين)، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ﴾، پێش خستنی هەردووکیان بەڵگەیە لەسەر زۆری گرینگی پێدانیان.

خوای گەورە فەرموویەتی: (إحسانا) بە وشەی نەناسراو کە دەلالەت لەسەر بە گەورە دانان دەکات، واتە: چاکە لەگەڵ دایک و باوک بکە بە چاکە کردنێکی گەورە و تەواو،

---

[١] القول المفيد (١/٣٢-٣٨).

چونکە چاکە کردنی ئەوان لەگەڵ تۆ گەیشتۆتە پلەیەکی بەرز و گەورە، دەبێت تۆش چاکەیان لەگەڵ بکەیت بە چاکە کردنێکی گەورە ...[١].

حیکمەت لە باس کردنی چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک لە گەڵ عیبادەتی خوا لەم ئایەتە:

یەکەم: هۆکاری ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ و دروستکردنی مرۆڤ خوایە، هۆکاری بەرچاو و دیاریش دایک و باوکن، فەرمان کرا بە گەورە دانانی هۆکاری ڕاستەقینە، پاشان فەرمان کرا بە گەورە دانانی هۆکاری دیاریش.

دووەم: بوونەوەر یان کۆنن یان نوێن، واجبە مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ خوای کۆن "واتە: یەکەم، نابێت خوای گەورە وەسف بکەیت بە کۆن" بە گەورە دانان و پەرستن بێت، ئەوەی نوێ یان داهێنراو مامەڵەی بە سۆز و بەزەیی بێت، مەبەست لە وتەی پێغەمبەر (ﷺ) : (التعظيم لأمر الله و الشفقة على خلق الله) لە پێشترین کەس بۆ سۆز و بەزەیی و چاکە لەگەڵ کردنیان دایک و باوکن، لەبەر زۆری چاکەیان بەسەر مرۆڤەوە، وتەی خوای گەورە کاتێک دەفەرموویت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، ئاماژەیە بۆ (التعظيم لأمر الله)، وە وتەی خوای گەورە کاتێک دەفەرموویت: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾، ئاماژەیە بۆ (الشفقة على خلق الله).

سێیەم: مشغول بوون بە سوپاسکردنی ئەوەی نیعمەتی لەگەڵ تۆ کردووە واجبە، پاشان ئەوەی نیعمەتی ڕاستەقینەی لەگەڵ تۆ کردبێت خوایە، دەکرێت دروستکراوێک نیعمەتێک لەگەل تۆ بکا بە ویستی خوا، سوپاس کردنی ئەو دروستکراوەش واجبە لەبەر وتەی

[١] التفسير الكبير (١٠/٢٠/١٨٧-١٨٨).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (من لم يشكر الناس لم يشكر الله) هیچ دروستکراوێک چاکەی بەسەر مرۆڤەوە نییە بە ئەندازەی چاکەی دایک و باوک ..)[1].

تێبینی: زانایان دەڵێن (قديم) ناوی خوای گەورە نییە، بەڵکو متکلمون ئەم وشەیەیان بەکارهێناوە بۆ خوا وەک یەکەمی واتە:(أولية)، ئێمە پێویستیمان بەم وشەیە نییە، چونکە قورئان بەسە بۆ ئێمە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ﴾ [الحديد: ٣]، وشەی (قديم) بۆ خوای گەورە بەکار نایەت مەگەر لە بابی خەبەر نەبێت. بابی خەبەر فراوانترە لە بابی ناو و سیفەت، ئەوەی داخلی بابی خەبەر دەبێت فراوانترە لە بابی ناو و سیفەت، (موجود) و (شيء) باس دەکرێت وەک خەبەر، کەچی خوای گەورە هیچ ناوێکی نییە بە ناوی (موجود) و (شيء).

(قديم) ناوی خوای گەورە نییە لەبەر دوو شت:

١- هیچ بەڵگە نەهاتوون لە قورئان و سوننەت، ناوەکانی خوای گەورە تەوقیفین و مەجالی بیروڕای تێدا نییە.

٢- وشەی (قديم) دوو مانای هەیە:

أ- بەمانای کۆن دێت.

ب- بەمانای (الأول) دێت.

[1] التفسير الكبير (١٠/٢٠/١٨٧-١٨٨).

ناوەكانی خوای گەورە جوانن و تەواون هیچ مانایەک نابەخشن کە دەلالەت لەسەر نەقس بکات، یان ئەگەری ئەوەی هەبێت دەلالەت لەسەر کەم و کورتی بکات[١].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

ئەم ئایەتەی لەبەر ئەوە هێناوەتەوە چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، ئەمە تەوحیدە، چونکە نەفی و إثباتی "ئەرێ و نەرێ" لەخۆ گرتووە، واتە: نابێت کەس بپەرستی تەنها خوا نەبێت[٢].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** عیبادەتی خوا گەورەترین مافە بەسەر بەندەکان، لەبەر ئەمەش بەمە دەست پێکراوە، لەبەر وتەی: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، کەواتە واجبە تەنها عیبادەتی خوا بکرێت و شەریکی بۆ بڕیار نەدرێت، کە ئەمە تەوحیدە.

**٢-** ئەوەی ئاراستەی پێغەمبەر کرابێت (ﷺ) ئەسڵ وایە ئوممەتیش دەگرێتەوە، مەگەر بەڵگە هاتبێت و تایبەتی کردبێت پێی.

محمد الأمين الشنقطی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەو خطابەی ئاراستەی پێغەمبەر (ﷺ) کراوە سێ بەشە:

یەکەم: خطاب هەیە ئاراستەی کراوە بە هیچ شێوەیەک پێغەمبەر (ﷺ) داخلی ئەم خطابە نابێت، بەڵکو مەبەست پێی ئومەتەکەیەتی بێ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەنێوان زانایان،

---

[١] التوضيحات الجلية على شرح العقيدة الطحاوية (١٩٦/١-١٩٧).

[٢] (القول المفيد) لابن عثيمين (٣٨/١).

لەوانە وتەی خوای گەورە سەبارەت بە چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک: ﴿۞وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾ [الإسراء: ٢٣-٢٤].

دووەم: خطاب هەیە تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ) کەسی تر داخلی ئەم بانگەوازە نابێت، وەک وتەی خوای گەورە کە دەفەرموویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ﴾ [الأحزاب: ٥٠]

سێیەم: خطاب هەیە گشتییە پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەکەی هەردووکیان دەگرێتەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ ۖ﴾ [الطلاق: ١]

ئەمەیان خطاب ئاراستەی پێغەمبەر کراوە (ﷺ)، ئەوەی بە دوای هاتووە و باسیکراوە: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾﴾ [الطلاق: ٢] خطاب بۆ هەموو ئوممەتە ...)[١].

[١] أضواء البيان (٢٢٠/٨).

**٣-** واجبە چاكە لەگەڵ دایک و باوک بكەیت بەهەموو جۆرەكانی چاكە، چونكە ئەم ئایەتە جۆری چاكەی دیاری نەكردووە.

(سليمان ال الشيخ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (لەم ئایەتە جۆرێک لە جۆرەكانی چاكە كردن لەگەل دایک و باوک باسكراوە، بۆ ئەوەیە تا هەموو چاكەیەكیان لەگەڵ بكەیت نەک هەندێک چاكەی دیاری كراو، چەندین بەڵگە نەقل كراون لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمانی كردووە چاكە بكەن لەگەڵ دایک و باوک و هانی داون، وە ئازاردانیان حەڕامە هەروەک قورئان باسی كردووە ....)[1].

**٤-** واجبە چاكە لەگەڵ باپیر و داپیر بەرەو سەرەوە بكەیت، چونكە (الوالدين): دایک و باوک و داپیر و باپیر بەرەو سەرەوە دەگرێتەوە، بەڵام چەند لە مرۆڤ نزیكتر بێت ئەوا لەپێشترە بۆ چاكە لەگەڵ كردنیان.

**٥-** ڕێز و شەرەفی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و جێگیركردنی پەروەردگاریەتی تایبەت، لەبەر وتەی: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًاۚ﴾.

**٦-** واجبی چاكەكردن لەگەڵ دایک و باوک بە پێدانی مافەكانی واجب و سوننەت و هەموو جۆرەكانی چاكە، لەبەر وتەی: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًاۚ﴾.

**٧-** گەورەیی مافی دایک و باوک و چاكە لەگەڵ كردنیان، چونكە خوای گەورە لەگەڵ مافی خۆی باسكردووە.

---

[1] تيسر العزيز الحميد لاپەڕە (٣٥).

**وقوله:** ﴿۞وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾ [النساء: ٣٦].

واته: خوای گەورە دەفەرمووێت: (ئەی خەڵکینە تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿۞وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾: واتە: تەنها خوا بپەرستن، مانای (إلا الله)ی تێدایە.

﴿وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾: واتە: هیچ شەریکی بۆ بڕیار مەدەن، مانای (لا إله)ی تێدایە.

﴿شَيۡـٔٗاۖ﴾: نەناسراوە لە ڕستەی نەهی، هەموو شتێک دەگرێتەوە، واتە: نابێت پێغەمبەر و فریشتە و وەلی و هەر شتێکی تر بکەیتە شەریک لەگەڵ خوا.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە تەوحید نەفی و إثباتە، واتە: دەبێت تەنها خوا بپەرستی و نابێت هیچ شەریکی بۆ بڕیار بدەیت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە تەوحید بەندایەتی کردنە و شەریک بۆ خوا بڕیار نەدانە.

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە شەریک بۆ خوا بڕیاردان بە هەموو شێوەیەک حەڕامە و هەموو جۆرەکانی شیرک دەگرێتەوە.

**٢-** وتەی: ﴿شَيۡـٔٗاۖ﴾: نەناسراوە، ئەگەر نەناسراو هات و ڕستەكەش نەهی بوو، ئەوە دەلالەت لەسەر گشتییەتی دەكات، واتە: شیركی بچووک و گەورە و شاراوە ڕێگە پێدراو نییە و نابێت بۆی بڕیار بدەیت[١].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (شيرك: شەریک بڕیار دانە لەگەڵ خوا لە:

- (الربوبية): واتە: لە پەروەردگاریەتی.

- (العبادة) (الألوهية): واتە: لە بەندایەتی.

- (الأسماء والصفات): واتە: لە ناو و سیفەت.

مەبەست لێرە ئەوەیە نەهی كراوە لە شەریک بڕیاردان لەگەڵ خوا لە پەروەردگاریەتی دا یان عیبادەت دا یان ناو سیفەت دا، وە فەرمان كردنە بە یەكخواپەرستی.

دابەش كردنی یەكەم ئەوەیە شیرک دابەشكراوە بۆ دوو بەش:

یەكەم: شیركی گەورە.

دووەم: شیركی بچووک.

بە شیركی گەورە لە دین دەردەچێت و شیركی بچووكیش بە شیرک وەسفكراوە بەلام ناگاتە پلەی شیركی گەورە وپێی لە دین دەرناچێت، نموونەی شیركی گەورەی دیار و بەرچاو: عیبادەت كردنی پەیكەر و گۆڕ و مردوو و داوا كردن لە كەسانی ئامادە نەبوو.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٢٥).

نموونەی شیركی گەورەی شاراوە: شیركی ئەوانەی پشت بە شێخەكانیان دەبەستن یان خوای جیاواز یان شیركی دووڕووەكان، چونكە دووڕووەكان موشریكن لە ناخەوە، شیركەكەیان گەورەترە بەڵام شاراوەیە.

هەروەها شیركی بچووك لەسەر ئەم دابەش كردنە، هەیە دیارە و هەیە شاراوەیە، نموونە شیركی بچووكی دیار و بەرچاو: لەبەر كردنی حەلقە و دەزوو و هەڵواسینی تەمیمە و سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا و شتی تری وەك ئەمانە لە وتە و كردەوە.

نموونەی شیركی بچووكی شاراوە: ڕیای كەم و شتی تری وەك ئەمە، لەسەر ئەم دابەش كردنە ڕیا هەیە گەورەیە وەك ڕیای دووڕووەكان، ئەوانەی خوای گەورە سەبارەت بە وەسفیان دەفەرمووێت: ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ [النساء: ١٤٢]، ئەوەی ڕوودەدات لە هەندێك نوێژخوێن لە نوێژەكانیان بۆ ئەوەی خەڵك سەیریان بكەن، هەیە بچووكە وەك حەز كردن بەوەی گوێی لێ بێ یان ببینێ.

دابەش كردنی دووەمیش دابەش كردنی شیركە بۆ سێ بەش:

یەكەم: شیركی گەورە.

دووەم: شیركی بچووك.

سێیەم: شیركی شاراوە.

شیركی شاراوە وەك ڕیای كەم، هەندێ زانا لەسەر دابەش كردنی یەكەمن و هەندێكی تر لەسەر هی دووەمن، ئەوەی ڕاستی بێت هەردووكیان وەك یەك وان و پێچەوانەی یەك نین و جیاوازی نییە لە نێوانیاندا)[1].

---

[1] التمهید لاپەڕە (١٨-٢٠).

جیاوازی نێوان شیرکی گەورە و بچووک:

١- شیرکی گەورە ئەوەی تووش ببێت لە دین دەردەچێت، بەڵام شیرکی بچووک ئەوەی تووش ببێت لە دین دەرناچێت پێی.

٢- شیرکی گەورە ئەگەر تەوبەی نەکردبێت خوای گەورە لێی خۆش نابێت و لە دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت، بەڵام شیرکی بچووک ئەگەر تەوبەی نەکردبێت بۆ لێ خۆش بوونی دوو وتە هەیە:

أ- هەندێ زانا دەڵێن لێی خۆش نابێت و هەر سزای دەدات، دوای سزا دان لە دۆزەخ دەردەهێنرێت.

ب- هەندێ زانای تر دەڵێن ئەگەری هەیە خوا لێی خۆش بێت بێ ئەوەی سزای بدات، وە ئەگەریش هەیە سزای بدات پاشان لە دۆزەخ دەریبهێنێت، واتە: لەژێر ویستی خوای گەورە دایە، کەواتە هەردوو وتە یەک دەنگن لەسەر ئەوەی کە خاوەنی شیرکی بچووک لە دۆزەخ هەتا هەتایی نابێت.

٣- ئەوەی تووشی شیرکی گەورە بووە نابێت نوێژی لەسەر بکرێت و نابێت لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێ، بەڵام شیرکی بچووک دەبێت نوێژی لەسەر بکرێ و لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێ.

٤- شیرکی گەورە هەموو چاکەکانی مرۆڤ پووچ دەکات، بەڵام شیرکی بچووک هەموو چاکەکانی پووچ ناکات.

٥- شیرکی گەورە ماڵ و نەفسی کەسەکە حەڵاڵ دەکات، بەڵام شیرکی بچووک ماڵ و نەفسی حەڵاڵ ناکات، چونکە کەسەکە موسڵمانە بەڵام ئیمانی کەمە و فاسقە.

**قوله:** ﴿۞قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾ [الأنعام: ١٥١]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: خەڵکینە وەرن با ئەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کە پەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان، یەکەمیان ئەوەیە کە هیچ شتێک نەکەن بەشەریک و هاوەڵ بۆی).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾: واتە: وەرن با ئەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کە پەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان، واتە: وەسیەتی بۆ ئێوە کردووە، حەرام کردووەمەبەست پێی وەسیەتە، چونکە هەندێک فەرمانی تێدایە لەوانە:

- چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک.

- کێشان و پێوان بەرێک و پێکی بەکاربهێنن بە دادگەری ئەنجامی بدەن.

- کاتێکیش قسەو گوفتارتان کرد ئەوە دادوەر بن ئەگەر خزمی نزیکیش بێت.

- وەفا بکەن بەو پەیمانەی کە دەیبەستن لەگەڵ خوادا بەو بەڵێنەی کە بە پەروەردگاری دەدەن.

حەڕامکردن مەبەست پێی وەسیەتە و داخلی وەسیەت دەبێت، چونکە وەسیەت کردەوە یان تەرک کردن هەردووکیان دەگرێتەوە، واتە: وەسیەتی کردووە شەریکی بۆ بڕیار نەدەن و لەگەڵ دایک و باوک باش بن.

﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾: نەناسراو هاتووە دەلالەت لەسەر گشتییەتی دەکات، واتە: شەریکی بۆ بڕیار مەدەن هەر شیرکێک بێت گەورە یان بچووک، شیرکی شاراوە یان دیار، هەر شتێک بێت دار یان بەرد یان پیاو چاک یان فریشتە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە خوای گەورە حەرامی کردووە شەریکی بۆ بڕیار بدەن، واتە: دەبێت تەنها خوا بپەرستی و نابێت هیچ شەریکی بۆ بڕیار بدەیت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- پێغەمبەر خەبەردەرە (ﷺ) لەلایەن خوای گەورەوە، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾.

٢- لاچوونی حوجە لەسەر موشریکەکان و کەسانی تر بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی خوا لەسەریانی حەرامکردووە، لەبەر وتەی: ﴿أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾.

٣- حەرامکردن و حەڵاڵ کردن بۆ لای خوای گەورەیە، لەبەر وتەی: ﴿مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾.

٤- جێگیرکردنی پەروەردگاریەتی گشتی خوا بۆ هەموو دروستکراوەکان، لەبەر وتەی: ﴿رَبُّكُمْ﴾.

**٥-** حەڕامی شەریک بۆ خوای گەورە بڕیاردان و واجبی خوای گەورە بە تەنیا دانان لە عیبادەتدا، کە ئەمە مافی خوایە بەسەر بەندەکانی و واجبترین و گەورەترین مافە، لە گەورەترین حەڕامکراوەکان دەستی پێکردووە، لەبەر وتەی: ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾.

**٦-** شیرک بە هەموو جۆرەکانییەوە حەڕامە، لەبەر وتەی: ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾، وشەی: ﴿شَيْئًا﴾، نەناسراوە لە ڕستەی نەهی، بە مانای گشتی دێت هەموو شتێک دەگرێتەوە کە بپەرسترێت بێجگە لەخوا، جا فریشتە بێت یان پێغەمبەر یان وەلی یان پیاو چاک یان دار یان بەرد یان گۆڕ یان بێجگە لە ئەمانە.

**٧-** وتەی: ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾، هەموو جۆرەکانی شیرک دەگرێتەوە گەورە و بچووک، هیچ شیرکێک نییە چاوپۆشی لێکرا بێت لە شیرکی گەورە و بچووک.

**٨-** وتەی: ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾، بە تەوحید دەستی پێکردووە ئەویش بەری بوونە لە شیرک و شەریک بۆ خوا بڕیار نەدانە، ئاماژەیە بۆ ئەوە خۆ ڕزگار کردن لە شتی پیس و ناشیرین پێش خۆ ڕازاندنەوەیە بە شتە باشەکان[1] .

---

[1] (نظم الدرر) للبقاعي (٣١٦/٧).

**قال ابن مسعود رضي الله عنه: (من أراد أن ينظر إلى وصية محمد (ﷺ) التي عليها خاتمه فليقرأ قوله تعالى:** ﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ **الآية إلى قوله:** ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾.

واتە: عبداللەی کوڕی مسعود خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: هەر کەسێک دەیەوێت سەیری ئەو وەسیەتەی محمد بکات (ﷺ)، کە مۆری ئەوی پێوە بێت با ئەو ئایەتە بخوێنێتەوە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ الآية إلى قوله: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وەسیەتێک نییە نووسراو بێت و مۆری لەسەر بێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی نەکردووە، بەڵگە لەسەر ئەمە ئەبو جوحەیفە پرسیاری لە عەلی کرد خوا لێی ڕازی بێت ئایا پێغەمبەر (ﷺ) هیچی بۆ ئێوە بەجێ هێشتووە و بەڵێنی هیچی بە ئێوە داوە بە شتێک؟ عەلی وتی: نەخێر، سوێند بەو خوایەی دانەوێلە شەق دەکات و ڕوح بەبەر دروستکراوەکان دا دەکات ئیلا تێگەیشتنێک نەبێت خوای گەورە دایبێ بە کەسێک بۆ قورئان و ئەوەی لە ناو ئەم پارچە وەرەقەیەش نەبێت، وتی چی لە ناو ئەم پارچە وەرەقەیە دایە؟ عەلی وتی: باسی "دییە" دەکات، واتە: "خوێن بایی کەسێک کە بکوژرێت"، وە ڕزگار کردنی بەندەو نابێت موسڵمان بە کافرێک بکوژرێت، واتە ئەگەر موسلمانێک کافرێکی کوشت نابێت موسلمانەکە بکوژرێتەوە بەڵکو "دییە" لە جیاتی کوشتنەکە دەدرێت.

گومان مەبە کە پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی کردووە بەم ئایەتانە بە وەسیەتێکی تایبەت و نووسراو، بەڵکو ابن مسعود وای دەبینێت ئەم ئایەتانە هەموو دینی لەخۆ گرتووە، وەک ئەوە وایە وەسیەتەکەی مۆر کردووە و پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئومەتەکەی بەجێ هێشتووە.

ئەم ئايەتانە گەورەن ئەگەر مرۆڤ بيری لێ بكاتەوە و كردەوەی پێ بكات، وە ئەم سێ وەسفە تەواوە بە دەست دەهێنێت: العقل و التذكير و التقوى)[1].

[1] القول المفيد (١/٥٠-٥١).

**عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ - رضي الله عنه - قَالَ: كُنْتُ رديف رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَلَى حِمَارٍ قَالَ: فَقَالَ: (يَا مُعَاذُ! أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ وما حقُّ العبادِ عَلَى الله؟) قَالَ قُلْتُ: الله وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (فَإِنَّ حَقَّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوا اللهِ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً. وَحَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لاَ يُعَذِّبَ مَنْ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً) قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَفَلاَ أُبَشِّرُ النَّاسَ؟ قَالَ: (لاَ تُبَشِّرْهُمْ. فَيَتَّكِلُوا).**

واته: موعازی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواری پشتی گوێ درێژێک بوو بووین، منیش لە دوای ئەوەوە بووم، فەرمووی: (ئەی موعاز ئایا دەزانیت کە مافی خوا لەسەر گشت بەندەکانی چییە؟ وە مافی بەندەکان لەسەر خوا چییە؟).

وتم: (خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن).

فەرمووی: (مافی خوا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە عیبادەتی بۆ بکەن و هیچ شەریکی بۆ دانەنێن، وە مافی بەندەکانیش لەسەر خوا ئەوەیە سزای کەسێک نادات کە هیچ شەریکی بۆ دانەنابێت).

وتم: (ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا مژدە بدەم بەو خەڵکە "بەم مزگینیە خۆشە" یان بێ دەنگ بم؟) فەرمووی: (مژدەیان پێ نەدەی، ئەگەرنا خراپ حاڵی دەبن و پشت دەبەستن بەم وتەیە و پاڵ دەدەنەوە و لە کردەوەی چاک سارد دەبنەوە.)

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(كنت رديف):** واتە: من سوار ببووم لەگەڵی لە پشتەوە.

**(على حمار):** واتە: لەسەر پشتی گوێ درێژ، گوێ درێژ مەبەست پێی خۆماڵی یە نەک کێوی، چونکە کێوی لێی سوار نابیت.

**(ولا يشركوا به شيئا):** نەناسراو هاتووە لە ڕستەی نەفی، هەموو شتێک دەگرێتەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

هۆکاری هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە لەم بابە: لەبەر فەزلی تەوحید باسکراوە، چونکە ڕێگرە بۆ سزادانی خوای گەورە، واتە: خوای گەورە سزای نادات[1].

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** مافی خوا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شەریکی بۆ بڕیار نەدەن، کە ئەم مافە گەورەترین مافە و لە مافی بەندەکان گەورەترە.

جیاوازی نێوان مافی خوا (مافی خوا مەبەستمان عیبادەت بۆ خوا ئەنجام دانە و شەریک بۆ بڕیارڕ نەدانە) و مافی بەندەکان:

- مافی خوا ئەگەر لەسەرت بێت و جێ بەجێت نەکردبێت کافر دەبیت، بەڵام مافی بەندەت لەسەر بێت کافر نابیت.

- مافی خوا لێخۆش بوونی بۆ نییە لە ڕۆژی قیامەتدا و ئیلا لەسەری سزا دەدرێت، بەڵام مافی بەندە بە قەرەبوو کردنەوە لادەچێت یان خوای گەورە لێی خۆش دەبێت و لە لای خۆی قەرەبووی دەکاتەوە بە فەزڵ و چاکەی خۆی.

[1] القول المفيد (٥٥/١).

- هەر كەسێک بمرێت و مافی خوای لەسەر بێت كە عیبادەت كردن و شەریک بۆ بڕیار نەدانە، ئەوە نابێت نوێژی لەسەر بكرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێت، بەڵام ئەگەر مافی بەندەی لەسەر بێت واجبە نوێژی لەسەر بكرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێت.

- ئەگەر مافی خوای گەورەی لەسەر بێت هەموو چاكەكانی پووچ دەبێتەوە و لێی وەرناگیرێت (واتە: ئەگەر شیركی كردبێت)، بەڵام ئەگەر مافی بەندەی لەسەر بێت هەموو چاكەكانی پووچ نابێتەوە و كردەوەی وەردەگیرێت.

- بە مافی خوای گەورە خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت، بەڵام بە مافی بەندە خوێنی حەڵاڵ نابێت لە هەموو كاتێكدا.

الشيخ صالح خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم مافە واجبە بۆ خوای گەورە، چونكە كتاب و سوننەت و بەڵكو هەموو پێغەمبەران بۆ ئەم مافە هاتوون بۆ ئەوەی ڕوونی بكەنەوە كە واجب كراوە لەسەر بەندەكان.)[1].

**٢-** مافی بەندە لەسەر خوای گەورە ئەوەیە خوای گەورە سزای نادات ئەگەر عیبادەتی خوای گەورەی كردبێت و شەریكی بۆ بڕیار نەدابێت، فەرموودەكە دەفەرمووێت: (وَحَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لاَ يُعَذِّبَ مَنْ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً) واتە: مافی بەندە لەسەر خوا ئەوەیە كە سزای نەدات ئەگەر شەریكی بۆی بڕیار نەدابێت.

پرسیار: ئەگەر كەسێک عیبادەتی خوا نەكات و شەریكی بۆ بڕیار نەدات سزا دەدرێت؟ فەرموودەكە دەڵێت سزای نادات ئەگەر شەریكی بۆی بڕیار نەدابێت باسی عیبادەتی نەكردووە؟

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٧).

وەلام: ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (تەقدیری ڕستەکە بەم شێوەیە: کەسێک خوای گەورە بپەرستێت و شەریکی بۆ بڕیار نەدات، باسی ئەوەی نەکردووە بپەرسترێت، چونکە ڕوون و ئاشکرایە لە وتەی پێغەمبەر: (حق العباد) هەر کەسێک وەسفی عابد بێت دەبێت عیبادەت بکات.

هەر کەسێک عیبادەتی خوا نەکات و لەگەڵ ئەوەش شەریکی بۆ بڕیار نەدابێت، ئایا سزا دەدرێت؟

وەڵام: بەڵێ سزا دەدرێ، چونکە لە ڕستەکە شاراوە هەیە، ماناکەی بەم شێوەیەیە: ئەوەی دەیپەرستێت و شەریکی بۆ بڕیار نەدات، دوو بەڵگە هەیە بۆ ئەمە:

یەکەم: وتەی: (حق العباد) هەر کەسێک وەسفی عابد بێت دەبێت عیبادەت بکات.

دووەم: وتەی (أن يعبدوه، ولا يشركوا به شيئا) دەزانرێت مەبەست بە وتەی: (لا يشركوا به شيئا) واتە شەریکی بۆ بڕیار نەدەیت لە عیبادەتدا)[١].

**٣-** مافی بەندە لەسەر خوای گەورە ئەم مافە خوای گەورە کردوویەتي بە حەق لەسەر نەفسی خۆی بە فەزڵ و چاکە و ڕەحمی خۆی، نەک بەندە حەق لەسەر خوا دابنێت و بێ ئەدەب بێت بەرامبەری.

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەمە حەقە خوای گەورە لەسەر خۆی واجب کردووە، وە بۆ دروستکراوەکان نییە شتێک لەسەر خالق واجب بکەن)[٢].

---

[١] القول المفيد.

[٢] مجموعة الفتاوى (١/٣٤٠).

صالح ال الشيخ خوا بيپارێزێت دەفەرمووێت: (بەندەکان هیچ شتێک لە حەقەکان لەسەر خوا واجب ناکەن، بەڵکو خوای گەورە خۆی واجبی کردووە لەسەر نەفسی خۆی.)[١].

**٤-** وتنی: (الله و رسوله أعلم)، ئەمەیان نابێتە شیرک و دروستە ئەگەر زیندوو بێت، ڕاستە فەرموودەی ابن عباس هاتووە:

عن ابن عباس أن رجلا قال للنبي (ﷺ) ما شاء الله وشئت فقال النبي (ﷺ): (أجعلتني لله ندا؟! بل ما شاء الله وحده)[٢].

زانایان دەڵێن بۆ زانستی شەرعی دروستە بلێی (الله و رسوله أعلم)، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) زانستی هەیە، بەڵام بۆ کاروباری کەونی و قەدەری نابێت، چونکە زانستی پێی نییە، بەڵام زانایان دەڵێن دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) نابێت بڵێیت: (الله و رسوله أعلم).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر خۆ بە کەم دانانی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە لەسەر پشتی گوێ درێژ سوار بووە، هەر کەسێک خۆی بە کەم دابنێت و لووت بەرز نەبێت ئیلا خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە، هەر کەسێکیش خۆی بە زۆر بزانێت و لووت بەرز بێت ئیلا خوای گەورە نزمی دەکاتەوە.

**٦-** دروستە زانست بشاریتەوە ئەگەر سوودی هەبوو، چونکە هەموو کەس هی ئەوە نییە هەموو شتی بۆی باس بکەیت، هەیە بە هەڵە لێی حاڵی دەبێت و گومڕا دەبێت، موعاز

---

[١] التمهيد لاپەڕە ٢٧.

[٢] رواه أحمد والبخاري في الأدب الكبير، والنسائي في السنن الكبرى، وصحح إسناده العراقي (في تخريج الإحياء ٢٠٠/٣) وكذلك أحمد شاكر (في مسند الإمام أحمد ٢٠٣/٣) وصححه الألباني (في صحيح الأدب المفرد ٦٠١).

لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە چونکە نابێت زانست بشاردرێتەوە و دەبێت دین بە خەڵک بگەیەندرێت.

لەوانەیە یەکێک بڵێت چۆن موسڵمان گومڕا دەبێت و بە هەڵە حاڵی دەبێت لە فەرموودە؟

وەڵام: زانایان دەڵێن گومانی تێدا نییە کە قورئان و سوننەت ڕووناکین کەچی هەیە پێی گومڕا دەبێ و هەیە پێی بە هیدایەت دێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (واتە پێغەمبەر (ﷺ) ترساوە لەوەی خەڵک گوێیان لێ ببێت و پاڵ بدەنەوە لە ڕووی ئومێد بوون بە خوا، وە ئاسانکاری بکەن لە تاوان و دەڵێن: مادام ئێمە یەکخواپەرستین تاوان زیان بە ئێمە ناگەیەنێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (ئەوەی شەریک بۆ خوا بریار نەدات سزای نادەم)، ئێمە سوپاس بۆ خوا موشریک نین و کەسیش ناپەرستین ئیلا خوا نەبێت، ئەوان ئاسانکاری دەکەن لە تاوان کردندا و ڕووی ئومێد بوون بە خوا بەسەر ترسدا دەخەن، ئەمە حیکمەت بوو، زانست دانانرێت مەگەر لە شوێنی خۆی بێت، ....)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێی کرد کە خەبەریان پێ بدات، بۆ ئەوەی پشت نەبەستن بەم مژدەیە و کردەوە ئەنجام نەدەن و تووشی تاوان ببن، چونکە تەوحید داوای خۆ دوورخستنەوە لە تاوان دەکات، چونکە تاوان لە هەواو و ئارەزووەوە هاتووە، ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ [الجاثية: ٢٣])[٢].

---

[١] إعانة المستفيد (٦٦/١-٦٧).

[٢] القول المفيد (٥٥/١).

هەروەها ابن عثيمين دەفەرموویێت: (سەبارەت بە تاوان هەمووی شیرکە، ئەمەیان بەڵێ، بە مانای گشتی، چونکە تاوان لە هەواو ئارەزووەوە هاتووە و خوای گەورە ناوی ناوە بەوە کە هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە خوا، دەفەرموویێت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَـٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴿٢٣﴾﴾ [الجاثية: ٢٣])[١].

وتەی ڕاست هەموو تاوانێک شیرکی بچووک نییە، تاوان چ گەورە بێت یان بچووک بە شیرکی گەورە حساب ناکرێت و شیرکی گەورە نییە، زۆربەی زانایان دەڵێن تاوان شیرکی بچووک نییە ئەگەر چی هۆکاریش بێت بۆ شیرکی گەورە، کە ئەمە وتەی ڕاستە، هەر تاوانێک خوا و پێغەمبەر ناوی نابێت بە شیرک و نەگەیشتبێتە پلەی عیبادەت کردنی جگە لە خوا، واتە: نەگەیشتبێتە پلەی شیرکی گەورە، ئەوە ئەمەیان شیرکی بچووکە.

کەواتە زانایان دەڵێن:

- تاوان چ گەورە بێت یان بچووک بە شیرکی گەورە حساب ناکرێت و شیرکی گەورە نییە.

- هەر تاوانێک خوا و پێغەمبەر (ﷺ) ناویان نابێت شیرک و نەگەیشتبێتە پلەی عیبادەت کردنی بێجگە لە خوا، واتە: نەگەیشتبێتە پلەی شیرکی گەورە، ئەوە ئەمەیان شیرکی بچووکە.

---

[١] لقاء الباب المفتوح (١٩٢/١٣).

- زۆربەی زانایان دەڵێن تاوان شیرکی بچووک نییە، ئەگەر چی هۆکاریش بێت بۆ شیرکی گەورە، کە ئەمە وتەی ڕاستە.

**٧-** دروستە دوو کەس لەسەر پشتی گوێ درێژ سوار بن ئەگەر لەسەری گران نەبێت و توانای هەبێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) معازی سوار کردبوو لە دواوەی خۆی [1].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سوننەتە مژدە بدەیت بە خەڵک.

---

[1] القول المفید (١/٥٠-٥١).

## باب فضل التوحيد وما يكفر من الذنوب

وقول الله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴿٨٢﴾﴾ [الأنعام: ٨٢]

**عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدا عبده ورسوله، وأن عيسى عبد الله ورسوله وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه، والجنة حق، والنار حق أدخله الله الجنة على ما كان من العمل)[١].**

**أخرجاه. ولهما في حديث عتبان: (فإن الله حرم على النار من قال: لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله)[٢].**

**وعن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه عن رسول الله (ﷺ) قال: (قال موسى: يا رب، علمني شيئا أذكرك وأدعوك به. قال: يا موسى: قل لا إله إلا الله. قال: يا رب كل عبادك يقولون هذا. قال: يا موسى، لو أن السموات السبع وعامرهن غيري، والأرضين السبع في كفة، ولا إله الله في كفة، مالت بهن لا إله الله) [رواه ابن حبان، والحاكم وصححه][٣].**

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٤٣٥)، ومسلم (٢٨).

[٢] متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٤٠١)، ومسلم (٢٦٣).

[٣] أخرجه النسائي في "الكبرى" (١٠٦٧٠)، والحاكم في "المستدرك" (٥٢٨/١)، وابن حبان في "صحيح ابن حبان" (١٠٢/١٤ رقم ٦٢١٨)، وضعفه الألباني في "ضعيف الموارد الظمآن" (١٩٢).

**وللترمذي وحسنه عن أنس رضي الله عنه: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (قال الله تعالى: يا ابن آدم؛ لو أتيتني بقراب الأرض خطايا، ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا لأتيتك بقرابها مغفرة)**[١].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** سعة فضل الله.

**الثانية:** كثرة ثواب التوحيد عند الله.

**الثالثة:** تكفيره مع ذلك للذنوب.

**الرابعة:** تفسير الآية (٨٢) التي في سورة الأنعام.

**الخامسة:** تأمل الخمس اللواتي في حديث عبادة.

**السادسة:** أنك إذا جمعت بينه وبين حديث عتبان وما بعده تبين لك معنى قول: (لا إله إلا الله) وتبين لك خطأ المغرورين.

**السابعة:** التنبيه للشرط الذي في حديث عتبان.

**الثامنة:** كون الأنبياء يحتاجون للتنبيه على فضل (لا إله إلا الله).

**التاسعة:** التنبيه لرجحانها بجميع المخلوقات، مع أن كثيرا ممن يقولها يخف ميزانه.

**العاشرة:** النص على أن الأرضين سبع كالسموات.

---

[١] أخرجه الترمذي (٣٥٤٠)، وحسنه الألباني في "الصحيحة" (١٢٧).

**الحادية عشرة:** أن لهن عمارا.

**الثانية عشرة:** إثبات الصفات، خلافا للأشعرية.

**الثالثة عشرة:** أنك إذا عرفت حديث أنس، عرفت أن قوله في حديث عتبان: (فإن الله حرم على النار من قال لا إله إلا الله، يبتغي بذلك وجه الله) أنه ترك الشرك، ليس قولها باللسان.

**الرابعة عشرة:** تأمل الجمع بين كون عيسى و محمد عبدي الله ورسوليه.

**الخامسة عشرة:** معرفة اختصاص عيسى بكونه كلمة الله.

**السادسة عشرة:** معرفة كونه روحا منه.

**السابعة عشرة:** معرفة فضل الإيمان بالجنة والنار.

**الثامنة عشرة:** معرفة قوله: (على ما كان من العمل).

**التاسعة عشرة:** معرفة أن الميزان له كفتان.

**العشرون:** معرفة ذكر الوجه.

## باب فضل التوحيد وما يكفر من الذنوب

## باسكردنی یەکخواپەستی کە چ فەزڵێکی هەیە و ڕوونکردنەوەی ئەوەش کە چۆن تاوانەکان هەڵدەوەرێنێت.

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مانای بابەتەکە فەزڵی یەکخواپەرستی و ڕوونکردنەوەی ئەوەشە کە چۆن تاوانەکان هەڵدەوەرێنێت، یەکخواپەرستی هەموو تاوانەکان هەڵدەوەرێنێت نەک هەندێکی، چونکە یەکخواپەرستی چاکەیەکی گەورەیە و هیچ تاوانێک قبوڵ ناکات ئیلا دەیسووتێنێ و ڕووناکی ئەم چاکەیە کاریگەری دەبێت لەسەری، بەمەرجێک ئەم ڕووناکی یە تەواو بوو بێت.

مەبەست بەم وتەیە: (باب فضل التوحيد وما يكفر من الذنوب) ئەوەیە هەر کەسێک یەکخواپەرستی تەواو بوویێت بە هەر سێ جۆرەکانییەوە، واتە: یەکخواپەرستی لە پەروەردگاریەتیدا و لە بەندایەتی کردن و یەکخواپەرستی لە ناو و سیفەتدا.

چەند بەندە یەکخواپەرستی یەکەی زیاد بێت تاوانەکانی زیاتر هەڵدەوەرێت بەگوێرەی گەورەیی یەکخواپەرستییەکەی، چەند بەندە یەکخواپەرستی زیاد بێت پارێزراوتر دەبێت و لەخۆشی و ئارامیدا دەبێت لە دونیا و دوارۆژدا بە گوێرەی گەورەیی یەکخواپەرستی یەکەی)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب کاتێک باسی پێشتر باسی حەقیقەتی یەکخواپەرستی کرد، مانای یەکخواپەرستی داواکراو ڕوونی کردەوە بە ئایەت و فەرموودە، گونجاو بوو باسی فەزڵی یەکخواپەرستی بکات، بۆ ئەوەی ئارەزوو بۆی

---

[1] التمهيد لاپەڕە (١٠-٣١).

بڕوات و هان بدرێ لەسەری، چونکە شتێک ئەگەر قیمەت و فەزڵی زانرا ئەوا نەفس پێیەوە پەیوەست دەبێت و لەسەری سوور دەبێت.

تەنها ئەوە بەس نییە مەدحی ئیسلام بکەین، بەڵکو دەبێت ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە ئیسلام چییە، حەقیقەتی ئیسلام چییە؟ ئەوەی لە کوفر ڕزگارت دەکات چییە، بە چی دەچیتە ناو یەکخواپەرستی؟ بە چی ڕزگارت دەبیت لە ئاگر و بەچی دەچیتە بەهەشت؟ دەبێت هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام بزانی و ئەوانەی ئیسلام پووچ دەکەنەوە، هەروەها دەبێت تەواوکەرەکان و کەمکەرەوەکانی تەوحید بزانی، دەبێت ئەمانە بزانرێن و تەنها مەدح بەس نییە)[(١)].

بە داخەوە خەڵکانێکی زۆر بەڵکو بگرە چەندین بانگخواز پیشەیان بۆتە گێڕانەوەی چیرۆک و باسکردنی خەڵک و مەدح کردنی ئیسلام، کەچی لە بیروباوەڕ و ئیسلام و هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام بێ ئاگان، تەنها مەدح کردنی ئیسلام بەس نییە، گرینگ بیروباوەڕ و پەروەردەکردنی خەڵکە لەسەر بیروباوەڕێکی پاک.

---

[(١)] إعانة المستفيد (١/٧٣-٧٤).

**وقول الله تعالى:** ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ۝٨٢﴾ [الأنعام: ٨٢]

واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانەکەیان تێکەڵی زوڵم نەکردووە، تەنها ئەمانە لە هێمنایەتیدان بە بەردەوامی لە دونیا و ئاخیرەتدا، تەنها ئەوانەش هیدایەت دراون).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾: واتە: ستەم و هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە، ستەم لێرە مەبەست پێی شیرکە، ((بظلم) زوڵم لێرە بەرامبەرە بە ئیمان مەبەست پێی شیرکە، کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی لەسەر هاوەڵان گران بوو، وتیان: کێ هەیە لە ئێمە زوڵم نەکات لە نەفسی خۆی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کارەکە وا نییە وەک ئێوە بیری لێ دەکەنەوە، بەڵکو مەبەست پێی شیرکە، ئایا گوێتان لە وتەی پیاوی باش نەبووە، واتە لوقمان: ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ۝١٣﴾ [لقمان: ١٣].

ستەم (ظلم) چەند جۆرێکە:

- زوڵم ترین زوڵم، ئەویش شیرکە لە حەقی خوا.

- زوڵم کردنی مرۆڤ لە نەفسی خۆی، حەقی نەفسی خۆی پێ نادات، نموونە: بەڕۆژوو دەبێت و نایشکێنێت، هەڵدەستێت شەو نوێژ دەکات و ناخەوێت.

- زوڵم کردنی مرۆڤ لە کەسی تر، نموونە زوڵم لە کەسێک دەکات بە لێدان یان کوشتن یان ماڵ لێ بردن یان شتی تری وەک ئەمانە.

ئەگەر زوڵم نەما و لاچوو ئەوا هێمنایەتی دێتە دی، بەڵام ئایا هێمنایەتی تەواوە؟

وەڵام: ئیمان تەواو بێت و تاوانی تێکەڵ نەبووبێت، ئەوا هێمنایەتی تەواوی بۆ هەیە، ئەگەر ئیمانەکە تەواو نەبوو ئەوا هێمنایەتی تەواوی بۆ نییە، نموونە: ئەوەی تاوانی گەورە دەکات ئەمینە لەوەی کە لە دۆزەخ هەتا هەتایی نابێت، ئەمین نییە لە سزا، بەڵکو لەژێر ویستی خوای گەورە دایە[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (زوڵم لەم ئایەتە بە نەناسراو هاتووە و ڕستەکەش نەفی یە، کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا﴾، ئەمە بەڵگەیە کە هەموو زوڵمێک دەگرێتەوە، بەڵام مەبەست بەم (عام)ە لێرە تایبەت کراوە، یان مەبەست پێی گشتییە؟

وەڵام: مەبەست لەم (عام)ە (خاص)ە، چونکە (عام) لە لای أصولییەکان هەندێک جار دێت لەسەر (عام)ی خۆی دەمێنێتەوە، هەندێک جار ئەو (عام)ە تایبەت کراوە ...

وتەی ڕاست زوڵم هاتووە و نەناسراوە و ڕستەکەش نەفی یە، هەموو جۆرەکانی زوڵم دەگرێتەوە، بەڵام عام مەبەست پێی خاصە ئەویش ئەوەیە جۆرێک لە جۆرەکانی زوڵم دەگرێتەوە کە شیرکە، عامەکە مەبەست پێی هەموو جۆرەکانی شیرکە نەک هەموو جۆرەکانی زوڵم، کە زوڵم کردنی نەفس و تاوان و زوڵم کردن لە خەڵکی تر، زوڵم کردن لە حەقی خوا بە شیرک ئەمە مەبەستی عامە، واتە هەموو جۆرەکانی شیرک، کەواتە بەمە ڕووی کردنە بەڵگە دێتە دی لەم ئایەتە، مانای ئایەتەکە: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾، واتە: شیرکیان بە هەموو جۆرەکانیەوە تێکەڵ نەکردووە بە یەکخواپەرستی: ﴿أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾، ئەمن لێرە ئەمنی تەواوە لە دونیا، مەبەست پێی ئەوەیە

---

[1] القول المفيد (١/٧١-٧٤).

دڵی هێمن دەبێت و ئارام دەبێت، خەم و پەژارە ناخوات لەسەر جگە لە خوا نەبێت ...)[١].

﴿وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾: واتە: لە دونیا هیدایەت دراون بۆ شەرعی خوا بە زانست و کردەوە، هیدایەت بە زانست هیدایەتی ڕێنمووی یە (هداية إرشاد)، هیدایەت بە کردەوە، واتە هیدایەتی تەوفیق، ئەوان هیدایەت دراون لە ئاخیرەت دا بۆ بەهەشت، هەروەک خوای گەورە سەبارەت بە هاوەڵانی دۆزەخ دەفەرموویێت: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ۝٢٢ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ۝٢٣﴾ [الصافات: ٢٢-٢٣]، ئەم هیدایەتەی ئاخیرەتە بۆ ئەوانەیە کە زوڵمیان کردووە و بەرەو دۆزەخ ڕێنموویی دەکرێن، بەرامبەر ئەمانە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و زوڵمیان تێکەڵی ئیمانیان نەکردووە هیدایەت دراون بۆ بەهەشت.

زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: ﴿أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾، ئەمن مەبەست پێی ئاخیرەتە، هیدایەتیش مەبەست پێی دونیایە، وتەی ڕاست هەردووکیان دەگرێتەوە و گشتین، هیدایەت و ئەمن بۆ دونیا و ئاخیرەتە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

مناسبەی ئەم ئایەتە لەم بابە ئەوەیە کە: خوای گەورە هێمنایەتی جێگیرکردووە بۆ کەسێک کە شەریکی بۆ بڕیار نەدات، ئەوەی شەریک بۆ خوا بڕیار نەدات یەکخواپەرستە، بەڵگەیە لەسەر فەزڵی تەوحید و بوونی هێمنایەتی[٢].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٢).
[٢] القول المفيد (٧٤/١).

عبدالله بن جار دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم ئایەتە لەم بابە ئەوەیە ئەوەی بمرێت لەسەر تەوحید و سوور نەبێت لەسەر تاوانی گەورە، هێمنی و دڵنیایی بۆی هەیە لە سزای ئاخیرەتدا، کە ئەمەش فەزڵی تەوحیدە)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** هەر کەسێک ئیمان بێنێت، ئەوە ئەمن بۆی هەیە لە سزا، ئەگەر چی تاوانیشی هەبێت و بچێتە دۆزەخیش هەتا هەتای نابێت لە دۆزەخ، لەبەر وتەی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴿٨٢﴾﴾.

عبدالله بن جار ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هەر کەسێک بمرێت لەسەر یەکخواپەرستی و سوورنەبێت لەسەر تاوانی گەورە، ئەوە ئەمنی بۆ هەیە لە سزای ئاخیرەت، ئەمە فەزڵی یەکخواپەرستی یە.)[2].

**٢-** هەر کەسێک ئیمان نەهێنێت بە هیچ شێوەیەک هێمنایەتی بۆ نییە لە سزای ئاخیرەت و هەتا هەتایی دەبێت لە دۆزەخ، لەبەر مفهومی ئایەتەکە.

**٣-** ئیمان هێنان بە تەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی لە سزا ڕزگار ببیت، بەڵکو دەبێت زوڵمی تێکەڵ بە ئیمانی نەکردبێت، واتە شیرکی تێکەڵ بە ئیمانی نەکردبێت.

**٤-** هەر کەسێک ئیمان بهێنێت و شەریک بۆ خوا بڕیار نەدات، ئەوا خوای گەورە یان لێی خۆش دەبێت یان سزای دەدات، لەکاتێکدا ئەگەر تاوانی گەورەی هەبێت و تەوبەی لێ نەکردبێت.

---

[1] الجامع الفرید لاپەڕە (١٥).
[2] الجامع الفرید لاپەڕە (١٥).

**٥-** هەر کەسێک ئیمان بهێنێت و شەریک بۆ خوا بڕیار نەدات، ئەوە هیدایەت دراوە لە دونیا، هەر کەسێک ئیمان بهێنێت و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات ئەوا گومڕا بووە لە دونیا.

**٦-** گەورەترین زوڵم شەریک بڕیار دانە بۆ خوای گەورە، بە شیرک دەڵێن زوڵم، چونکە زوڵم ئەوەیە شتێک لە جێگای خۆی دانەنێیت، زوڵمیش شیرکە چونکە عیبادەتێک دەکرێت بۆ بێجگە لەخوا و لە جێگای خۆی دانەنراوە کە دەبوایا بۆ خوا بکرێت.

**٧-** زوڵم لەم ئایەتە مەبەست پێی شیرکە بە هەموو جۆرەکانییەوە چ گەورە بێت یان بچووک، بەڵام بە شیرکی بچووک کافر نابێت و هەتا هەتایی نابێت.

**٨-** هەندێ زانا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە کە شیرکی بچووک ئیلا لەسەری سزا دەدرێیت و لێ خۆش بوونی بۆ نییە، شیرکی گەورە ئەگەر تەوبەی نەکردبێت خوای گەورە لێی خۆش نابێت و لە دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت، بەڵام شیرکی بچووک ئەگەر تەوبەی نەکردبێت، سەبارەت بە لێخۆش بوون دوو وتە هەیە:

- هەندێ زانا دەڵێن خوای گەورە لێی خۆش نابێت هەر سزای دەدات، دوای سزا دان لە دۆزەخ دەردەهێنرێت.

- هەندێ زانای تر دەڵێن ئەگەری هەیە خوا لێی خۆش بێت بێ ئەوەی سزای بدات، ئەگەریش هەیە سزای بدات پاشان لە دۆزەخ دەریبهێنێت، واتە لەژێر ویستی خوای گەورە دایە.

کەواتە هەردوو وتە یەک دەنگن لەسەر ئەوە کە خاوەنی شیرکی بچووک لە دۆزەخ هەتا هەتای نابێت.

هەر کەسێک ئیمان بهێنێت ئەوا ئەمن بۆی هەیە لە سزا، ئەگەر چی تاوانیشی هەبێت و بچێتە دۆزەخ هەتا هەتای نابێت لە دۆزەخ.

عبدالله بن جار ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەر کەسێک بمرێت لەسەر یەکخواپەرستی و سوور نەبێت لەسەر تاوانی گەورە، ئەوا "ئەمن" ی بۆ هەیە لە سزای ئاخیرەت، ئەمە فەزڵی یەکخواپەرستی یە.)[1].

---

[1] الجامع الفرید لاپەڕە (١٥).

**عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدا عبده ورسوله، وأن عيسى عبد الله ورسوله وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه، والجنة حق، والنار حق أدخله الله الجنة على ما كان من العمل)**[1].

واته: له عوبادەی کوڕی صامت دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە جگە لە (الله)، تەنها خۆی پەرستراوی بە حەقە و هیچ شەریکی نییە، شایەتیش بدات کە محمد بەندە و ڕەوانە کراوی خوایە، عیسای کوڕی مەریەمیش بەندە و ڕەوانە کراوی خوایە و کەلیمەی خوایە "واتە بە کەلیمەی خوای دروست بووە" و ڕۆحێکە لە لایەن ئەمری خوداوە، شایەتی بدات بەهەشت حەقە و دۆزەخیش حەقە، ئەوا خوا ئەو کەسە دەخاتە بەهەشتەوە باکردەوەی هەرچی بێت).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە و ماناکەی:

**(من شهد):** من: مەرجە، وەڵامی مەرج: (أدخله الله الجنة على ما كان من العمل).

**(لا إله إلا الله):** واتە: هیچ پەرستراوی بە حەق نییە جگە لە (الله).

**(وأن محمدا عبده ورسوله):** محمد: محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلبە.

**(وروح منه):** واتە: ڕوحێکە سەرەتای دروست بوونی بەئەمری خوا بووە.

---

[1] متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٤٣٥)، ومسلم (٢٨).

**(أدخله الله الجنة على ما كان من العمل):** واتە: خوا ئەو کەسە دەخاتە بەهەشتەوە جا کردەوەکەی هەرچیەک بێت، چەند تاوانی ئەنجام دابێت، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، لەبەر تەوحید.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکات یەکخواپەرست ئەگەر چی کەمتەرخەمیش بێت لە کردەوەی باش و تاوان و سەرپێچیشی هەبێت، ئەوە خوای گەورەی دەیخاتە بەهەشتەوە.

عبدالله بن جار الله دەفەرمووێت: (هەر کەسێک شایەتی بدات بەم پێنج شتانەی لەم فەرموودەیە باسکراون بە زانست و یەقین، ئەوە تاوانەکانی هەڵدەوەرێن و دەچێتە بەهەشتەوە، ئەمە فەزڵی تەوحیدە)[١].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئیسلام تەنها وتنی وشەی شایەتوومان نییە، بەڵکو دەبێت مەرجەکانی شایەتوومانی تێدا بێت.

الإيمان: (اعتقاد بالقلب، وقول باللسان، وعمل بالجوارح، يزيد بالطاعة، وينقص بالمعصية).

---

[١] الجامع الفريد لاپەڕە (١٧).

ئیمان: (واتە باوەڕهێنانە بە دڵ و گوتنی ووشەی شایەتوومانە بە زمان، ئەنجامدانی کردەوەیە بە ئەندامەکانی لاشە، ئیمان بە کردەوەی باش زیاد دەبێت و بە تاوان و سەرپێچییش کەم دەبێت).

هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەر ئەم پێناسەیە و کردەوەی ئەندامەکانی لاشە (عمل الجوارح) مەرجی دروستیێتی ئیمانە، نەک مەرجی تەواوییێتی ئیمانە.

خەڵک لە ئیمان هێنان و ئیمان نەهێنان ئەم حالەتانەن:

حاڵەتی یەکەم: هەر کەسێک ئەم دینەی لا ڕاست بێت و بە دڵ باوەڕی بە پێغەمبەر هەبێت و توانای وتنی وشەی شایەتوومانی هەبێت، بەڵام شایەتوومان نەهێنێت ئەمە نەبۆتە ئیماندار ئەگەر کردەوەش بکات (واتە: بەدڵ باوەڕی هەبووە و کردەوەشی کردووە بە لاشە، بەڵام بە زمان شایەتوومانی نەهێناوە).

حاڵەتی دووەم: هەر کەسێک ئەم دینەی لا ڕاست نەبێت بەدڵ و باوەڕی بە پێغەمبەر نەبێت، بەڵام وشەی شایەتوومانی هێنا، کردەوەشی ئەنجامدا، ئەمە ئیماندار نییە و مونافیقە (واتە: بە دڵ باوەڕی نەبووە بەڵام شایەتوومانی هێناوە و کردەوەشی کردووە).

حاڵەتی سێیەم: هەر کەسێک ئەم دینەی لا ڕاست نەبێت و بەدڵ باوەڕی پێی نەبێت، وشەی شایەتوومانیش نەهێنێت و کردەوەش ئەنجام نەدات ئەمە ئیماندار نییە (واتە: بە دڵ باوەڕی نەبووە و شایەتوومانیشی نەهێناوە و کردەوەشی نەکردووە).

حاڵەتی چوارەم: هەر کەسێک ئەم دینەی لا ڕاست بێت و بە دڵ باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) هەیە و شایەتوومان دەهێنێت و کردەوەش ئەنجام دەدات، ئەمە ئیمانداره (واتە: بە دڵ باوەڕێ هەبووە و بە زمانیش شایەتوومانی گوتووە و وە کردەوەشی کردووە).

حاڵەتی پێنجەم: هەر کەسێک ئەم دینەی لا ڕاست بێت بە دڵ و باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) هەبێت، بە زمان شایەتوومان بهێنێت، بەڵام هیچ کردەوەی ئەنجام نەداوە (مەبەستمان لە کردەوە ئەوەیە هیچ لە چوار ڕوکنەکانی ئیسلامی نەکردووە)، ئەمەیان موسڵمان نییە بە یەک دەنگی هەموو زانایان، کەواتە خەڵک لە کردەوەی لاشە و کردەوەی دیار ئەم چوار حاڵەتانەن:

أ- کەسێک هەر چوار ڕوکنی ئیسلام تەرک بکات دوای شایەتوومان هێنان، ئەمەیان ئیجماع هەیە کە موسڵمان نییە، چونکە ئەگەر ڕاستگۆ بوایا ئیمانەکەی پاڵی پێوە دەنا یەکێک لە چوار ڕوکنەکان ئەنجام بدات.

ب- کەسێک تەنها نوێژ دەکات، ئەمە موسڵمانە، چونکە هەر چوار ڕوکنی ئیسلامی پێکەوە تەرک نەکردووە.

ج- کەسێک تەنها ڕۆژوو دەگرێت و زەکات دەدات، دەڵێین لە بابەتی ئیمان ڕزگاری بووە چونکە هەر چوار ڕوکنی تەرک نەکردووە، بەڵام جیاوازی هەیە ئەگەر یەکێک نوێژ بەتەواوی تەرک بکات ئایا موسڵمانە یان نا؟

د- کەسێک هەر چوار ڕوکنی ئیسلام جێبەجێ دەکات، ئەمەیان گومانی تێدا نییە کە ئیماندارە.

تێبینی:

- مەبەستمان لە کردەوەی لاشە چوار ڕوکنی ئیسلامە: نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەج.

- زۆربەی زانایان دەڵێن نابێتە موسڵمان ئەو کەسەی دەڵێت ئیمانم هێناوە وەک ئیمانی فلانە کەسی ئیماندار، دەبێت شایەتوومان بهێنێت نەک بڵێت ئیمانم هێناوە وەک ئیمان هێنانی فلانە کەس.

- وتنی وشەی (لا إله الا الله) بەس نییە، بەڵکو دەبێت بەشەکەی تریش بڵێت کە (محمد رسول الله)یە.

- وشەی شایەتوومان مەرجی هەیە بە تەنها وتنی شایەتوومان نابیتە موسڵمان، بەڵکو دەبێت کردەوەش بکەیت، لە (ابن المنبه) یان پرسی ئەرێ (لا إله إلا الله) کلیلی بەهەشت نییە؟ فەرمووی: (بەڵێ کلیلی بەهەشتە، بەڵام هەر کلیلێک چەند ددانێکی هەیە ئەگەر ئەو ددانانەیان نەبێت دەرگا ناکرێتەوە، (لا إله الا الله)ش بەهەمان شێوەیە).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی یەکخواپەرستی، چونکە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە ئەگەر چەند تاوانیشی هەبێت، (علی ماکان من العمل) زانایان دوو وتەیان هەیە:

یەکەم: خوای گەورە دەیباتە بەهەشتەوە با کردەوەی هەرچی بێت، واتە: ئەگەر هەر تاوانێکی هەبێت جگە لە شیرک، ئەوە ئەمە نابێتە بەربەست لە نێوان کەسەکە و چوونە بەهەشت، یان یەکسەر دەچێتە بەهەشت، یان دواتر دوای سزادان دەچێتە بەهەشت، فەزڵی یەکخواپەرستی تاوانەکان هەڵدەوەرێنێت بە ئیزنی خوا، یان دەبێتە ڕێگر لە مانەوەی لە دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە.

دووەم: خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە جا کردەوەی هەرچیەک بێت، واتە: دەیباتە بەهەشت بە گوێرەی پلە و کردەوەکەی، چونکە خەڵکی لە بەهەشتدا پلەیان جیاوازە بەگوێرەی کردەوەیانە، هەیانە لە بەرزترین پلە دایە و هەیانەش لە نزمترین پلە دایە[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: ((علی ما كان من العمل) ئەگەر چی کەمتەرخەمیش بێت لە کردەوەی باش ئەنجام دان و تاوان و سەرپێچیشی هەبێت، چونکە

[1] إعانة المستفيد (٩٥/١).

یەکتاپەرستی یەکەی بۆ خوایە و شایەتی دەدات بە تەنیا بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی بە ڕیساڵە و وە شایەتی دەدات بۆ عیسی کە بەندەی خوایە و پێغەمبەری خوایە، عیسی بە کەلیمەی خوا دروست بووە و ڕوحەکەی لە لای خواوە بووە، وە لەبەر دان پێنانی بە غەیب و زیندووبوونەوە، لەبەر ئەمە فەزڵێکی گەورەی هەیە، ئەویش ئەوەیە خوای گەورە دەیخاتە بە هەشتەوە ئەگەر چی کەمتەرخەمیش بێت لە کردەوەی باش ئەنجام دان، ئەم فەرموودەیە فەزڵێکی گەورەی تێدایە بۆ خاوەنەکەی)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە باوەڕت بە هەموو پێغەمبەران هەبێت، وە کوفر کردن بە یەک پێغەمبەر کوفر کردنە بە هەموو پێغەمبەرەکان.

**٤-** ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ جوولەکەکان کە دەڵێن: عیسا منالی زینایە و نێردراوی خوا نییە.

**٥-** ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ گاورەکان کە دەڵێن: عیسی کوڕی خوایە یان خوایە یان دەیکەنە شەریک لەگەڵ خوا، چونکە عیسی بەندەی خوایە و نابێت بپەرسترێت.

**٦-** ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ گاورەکان کە دەڵێن ڕوحی عیسا بەشێکە لە خوا.

هەندێک کەس وا تێگەیشتوون کە خوای گەورە ئادەمی لە ڕوحی خۆی دروستکردووە، لەو ڕوحەی کە بەشێکە لەخوای گەورە و سیفەتی خوای گەورەیە، بەڵگە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ [ص: ٧٢]، واتە: ئەگەر لەشی ئادەمم ڕێک و پێک کرد و ڕوحی خۆم کرد بە بەردا، ئێوەش سوجدەی بۆ ببەن.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٣).

سەرەتا دەبێ پرسیاری ئەوە بکرێ ئایا خوای گەورە خۆی ڕوحی هەیە یان ڕوح سیفەتی خوای گەورەیە، ئینجا بڵێیت ئایا ڕوحی ئادەم بەشێکە لە ڕووحی خوای گەورە، دەڵێین وەسفی خوای گەورە ناکەین بەشتێک مەگەر خوای گەورە خۆی وەسفی خۆی پێ کردبێت یان پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردبێت، هیچ بەڵگە نەهاتوون لەسەر ئەوەی کە ڕوح سیفەتی خوای گەورە بێت، بەڵکو ڕۆح دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە، خوای گەورە ڕۆح دروستکردنی داوەتە پاڵ خۆی وەکو موڵک و ڕێز، کە ڕۆح موڵکی ئەوە و بە ویستی خۆی بە بەر دروستکراوەکانیدا دەکا و بەویستی خۆی دەریدێنێت، نەک ڕۆح بەشێک بێت لە خوا و سیفەتی بێت.

زانایان دەڵێن: ﴿وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ ، لێرە خوای گەورە ڕوحی ئادەمی داوەتە پاڵ خۆی وەک موڵک و ڕێز و گرینگی ڕوحی، هەروەک چۆن وشتری داوەتە پاڵ خۆی: ﴿نَاقَةَ ٱللَّهِ﴾ [الشمس: ١٣]، واتە: وشتری خوای گەورە، هەموومان دەزانین هەموو وشترەکان هی خوان بەڵام لێرە ئەم وشترەی داوەتە پاڵ خۆی وەك تەشریف.

سەبارەت بە عیساش بەهەمان شێوە فەرموویەتی: ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ﴾ [النساء: ١٧١]، گاورەکان بەمە گومڕا بوون، دەڵێن (من) لێرە بە مانای (التبعيض) دێت، واتە بە مانای هەندێک و بەشێک دێت، واتە: ڕوحی عیسی بەشێکە لە هی خوای گەورە، وە هەندێک کەسیش خۆیان بە موسڵمان دادەنێن دەڵێن هی ئادەمیش بەهەمان شێوەیە، کە ئەمە کوفری گەورەیە و لە دین دەرچوونە، زانایان دەڵێن پیتی (من) (لابتداء الغاية)یە، واتە ئەم ڕوحە لەلایەن خوای گەورەیە سەرەتای و دروستکردن و بەبەرداکردنی، هەر خۆی خاوەنیەتی و بەڕێوەی دەبات، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ﴾ [الجاثية: ١٣]، واتە: هەر چی لە ئاسمان و

زەوی دایە خوای گەورە بۆ ئێوەی مسخر کردووە، لەم ئایەتە (من) للابتداء، نەک (للتبعیض)، چونکە کەس نەی وتووە خۆر و مانگ و ڕووبار بەشێکن لە خوای گەورە.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە بەهەشت و دۆزەخ بوونی هەیە، یەکێک لە گرینگترین بنچینەکانی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە بەهەشت و دۆزەخ دروستکراون، نەک هێشتا دروست نەکراون و لە ڕۆژی قیامەت دروست دەکرێن، کە ئەمە وتەی ئەهلی بیدەعە.

**٨-** بەڵگەیە دەبێت مرۆڤ کردەوەی باش ئەنجام بدات، وە وەڵامە بۆ خەوارج و موعتەزیلەکان کە دەڵێن: خاوەنی تاوانی گەورە دەچێتە دۆزەخ و هەتا هەتایی دەبێت.

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فراوانی ڕەحمی خوای گەورە.

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەندەی خوایە و نابێت زیادەڕەوی تێیدا بکرێت لە مەدح کردندا و نابێت بپەرسترێت.

**أخرجاه. ولهما في حديث عتبان: (فإن الله حرم على النار من قال: لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله)**[1].

واته : له عیتبانی کوڕی مالک دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (بەڕاستی خوای گەورە حەڕامی کردووە لەسەر ئاگر هەر کەسێک لەبەر ڕەزامەندی خوای بڵێت: لا إله إلا الله).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(حرم على النار):** واتە: مەنعی کردووە لە چوونە ناو ئاگر یان ئاگر پێی بگات.

**(من قال: لا إله إلا الله):** واتە: بەزمان بیڵێت و ئاشکرای بکات.

**(يبتغي بذالك وجه الله):** واتە: بە وتە و دەربڕینی بە پاکی بۆ خوا بێت، بۆ ڕیا و سومعە و نیفاق نەڵێت، بەڵکو باوەڕی وابێت تەنها خوا شایستەی عیبادەتە و بە تەنیا دایبنێ بۆ عیبادەت کردنی و واز لە عیبادەتی جگە لە خوا بهێنێت، هەروەها باوەڕیشی پێی نەبێت و بە شتێکی پووچی دابنێ و بەری بێت لە شیرک و خاوەنی شیرک.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ فەزڵی یەکخواپەرستی بکات، کە ئاگر لەسەری حەڕام دەبێت، یان ناچێتەوە ناو ئاگر یەکسەر دەچێتە بەهەشت، یان بۆ ماوەیەک دەچێتە ناو ئاگر و هەتا هەتایی نابێت لە دۆزەخدا.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

---

[1] متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٤٠١)، ومسلم (٢٦٣).

**١-** هەر کەسێ (لا إله إلا الله) بڵێت بە مەرجەکانییەوە، ئەوا خوای گەورە ئاگری لەسەر حەڕام دەکات، مەرجەکانی (لا إله إلا الله) ئەمانەن:

(١) العلم. (٢) اليقين. (٣) القبول. (٤) الإنقياد. (٥) الصدق. (٦) الإخلاص. (٧) المحبة.

**(العلم):** واتە: زانست، کەسەکە دەبێت ماناکەی بزانێت کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە جگە (الله) نەبێت، کەس شایستەی عیبادەت نییە جگە خوا نەبێت.

(اليقين): یەقین، دەبێت کەسەکە یەقینی هەبێت و هیچ گومانی لەلا نەبێت بۆ ئەم وشەیە، چونکە ئیمان هیچ سوودی نییە ئەگەر یەقینی لەگەڵ نەبێت.

(القبول): دەبێت ئەم وشەیە قبول بکات بە دڵ و زمان.

(الانقياد): دەبێت ملکەچ بێت و پابەند بێت بۆ (لا إله إلا الله)، دەبێت دەست بە قورئان و سوننەتەوە بگرێت و تەسلیم بێت بۆ خوای گەورە.

(الصدق): دەبێت ڕاستگۆ بێت، ئەم وشەیە بڵێت بە ڕاستگۆیی لە دڵی دەربچێت.

(الإخلاص): دەبێت بە پاکی بۆ خوای گەورە بێت، هەر شتێک دەکات دەبێت تەنها مەبەستی خوا بێت و دوور بێت لە شیرک و ڕیا.

(المحبة): دەبێت خۆشەویستی بۆ ئەم وشەیەی هەبێت و بۆ ئەوانەش کە ئەم وشەیە دەڵێن و موسڵمانن و ئەهلی تەوحیدن.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی یەکخواپەرستی، کە ئاگر لەسەری حەڕام دەبێت، یان ناچێتە ناو ئاگر یەکسەر دەچێتە بەهەشت، یان بۆ ماوەیەک دەچێتە ناو ئاگر و هەتا هەتایی نابێت لە دۆزەخ.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فراوانی ڕەحمی خوای گەورە.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە خاوەنی تاوانی گەورە کافر نابێت و لە دۆزەخ هەتا هەتایی نابێت، هەروەها وەڵامیشە بۆ خوارج و موعتەزیلەکان کە دەڵێن لە دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت.

یەکێک لە بنچینە گرینگەکانی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە تەنها کوفر و شیرکی گەورە هەموو چاکەکانی مرۆڤ پوچ دەکات، کەس کافر نابێت بە ئەنجام دانی تاوانی گەورە، بەڵام لە ئەهلی بیدەع دوو دەستە دروست بوون دژی یەکتری و دژی ئەهلی سوننەن:

یەکەم: خوارج و معتزلە: ئەمانە موسڵمان کافر دەکەن لەسەر ئەنجام دانی تاوانی گەورە و دەڵێن: هەر کەسێک تاوانی گەورە ئەنجام بدات، ئەوە هەموو کردەوەی باشی پوچ دەبێت، خەوارج دەڵێن لە دونیادا مامەڵەی کافری لەگەل دەکەین و کافر بووە، لە ڕۆژی دواییدا لە دۆزەخدا هەتا هەتاییە، بەڵام موعتەزیلە دەڵێن لە دونیادا لە نێوان دوو پلە دایە، نە کافرە و نە موسڵمانە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا لە دۆزەخ هەتا هەتاییە، کەواتە: هەردووکیان یەک دەنگن لە دۆزەخ هەتا هەتایە، مانەوەش لە دۆزەخ بەشێوەی هەتا هەتایی بەس بۆ کافرە.

دووەم: مورجئەکان دەڵێن چاکەی ئیمان هێنان هەموو تاوانەکان دەبات و نایهێڵێت و تاوان زیانی نییە لەگەل ئیمان.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هیچ شتێک کردەوە پوچ ناکات جگە لە شیرک، چونکە ئەوەی دەمرێت لەسەر ئیمان دەبێت بچێتە بەهەشت و لە دۆزەخ

دەربهێنرێت ئەگەر چووە ناوی، ئەگەر هەموو كردەوەی پوچ بێت ئەوە هەر گیز ناچێتە بەهەشت)[١].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كە ئیخلاس مەرجە بۆ ئیمان هێنان و وەڵامە بۆ مورجیئەكان كە دەڵێن وتنی (لا إله إلا الله) بێ ئیخلاسیش بەسە بۆ خاوەنەكەی، چونكە مانای فەرموودەكە وایە هەر كەسێک كردەوە حەڕامەكان ئەنجام بدات لە ئاگر هەتا هەتایی نابێت، بەلام شایستەی سزادانە، ئەوان دەڵێن خاوەنی تاوانی گەورە هەتا هەتایی دەبێت لە ئاگردا[٢].

---

[١] صارم المسلول لاپەڕە (٥٥).
[٢] القول المفيد (٩٣/١).

**عن أبي سعيد الخدري - رضي الله عنه - عن رسول الله (ﷺ) قال: (قال موسى عليه السلام: يا رب علمني شيئا أذكرك وأدعوك به، قال: قل يا موسى: لا إله إلا الله، قال: يا رب كل عبادك يقولون هذا؟ قال: يا موسى لو أن السماوات السبع وعامرهن غيري والأرضين السبع في كفة، ولا إله إلا الله في كفة، مالت بهن لا إله إلا الله")[1].**

واته: ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (موسا وتی ئەی پەروەردگارم فێری شتێکم بکە کە بیکەم بە وەسیلەیەک و زیکری تۆی پێبکەم و دوعای تۆی پێوە بکەم "واتە دەمەوێت زیکرێکم فێر بکەیت کە تایبەت بێت بە خۆم")

خوای گەورەش فەرمووی: ئەی موسا بڵێ (لا إله إلا الله).

موسا گوتی: ئەی پەروەردگارم هەموو بەندە موسڵمانەکانت ئەمە دەڵێن.

خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکان و هەموو ئەوانەی کە ئاسمانەکانیان ئاوەدان کردوەتەوە جگە لە خوا، لەگەڵ حەوت زەمینەکەدا لە تایەکی تەرازودا دابنرێت، وە (لا إله إلا الله) لە تایەکی تەرازوو دابنرێت، ئەوا (لا إلا الله) لە هەموو ئەوانە قورستر دەردەچێت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

[1] وقد أخرجه ابن حبان في صحيحه (٦٢١٨) والحاكم (١٩٣٦) وصححه.

**(أذكرك وأدعوك به):** واتە: موسا وتی ئەی پەروەردگارم فێری شتێکم بکە کە بیکەم بە وەسیلەیەک و زیکری تۆی پێبکەم و دوعای تۆی پێوە بکەم، واتە: دەمەوێت زیکرێکم فێر بکەیت کە تایبەت بێت بە خۆم.

**(قال موسى كل عبادك يقولون هذا):** ماناکەی ئەوە نییە موسی ئەم وشەیەی پێی کەم بێت، بەڵکو دەیویست شتێکی فێر بکات تایبەت بەخۆی بێت.

**(مالت):** قورستر دەبێت.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە تا ئاماژە بۆ ئەوە بکات ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکان و هەموو ئەوانەی کە ئاسمانەکانیان ئاوەدان کردۆتەوە جگە لە خوا، لەگەڵ حەوت زەمینەکەدا لە تایەکی تەرازودا دابنرێت، وە (لا إله إلا الله) لە تایەکی تەرازوو دابنرێت، ئەوا (لا إلا الله) لە هەموو ئەوانە قورستر دەردەچێت.

قەرعاوی دەفەرموویێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە وشەی (لا إله إلا الله) باشترین زیکرە و قورسترینیانە بۆ میزان)[1].

## سـوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە وشەی (لا إله إلا الله) زیکر و دوعایە، وە پاداشتی ئەم وشەیە شاراوە بووە لای موسا (عليه السلام)، تەوحید شاراوە نەبووە لای هیچ پێغەمبەرێک، بەڵکو پاداشتی تەوحید شاراوە بووە لای هەندێک لە پێغەمبەران.

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤٢).

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەمە بەڵگەیە ئەم وشەیە زیکر و دوعایە و فەزڵی شاراوە بووە لەلای هەندێک پێغەمبەر)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی یەکخواپەرستی و وشەی (لا إله إلا الله) کە باشترین زیکرە.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە زەوی حەوت چینە، هەروەک چۆن ئاسمانەکان حەوت چینن.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەلگەیە کە خوای گەورە وتەی هەیە و قسە دەکات.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە خوای گەورە لە ئاسمانەکانە و لە شوێنی بەرزە[٢].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە میزان دادەنرێت لە ڕۆژی قیامەت و کردەوەی باش لە لایەکی میزان دەبێت و کردەوەی خراپیش لە لایەک.

**٧-** هیچ شتێک بەرامبەر وشەی (لا إله إلا الله) نییە بۆ لادانی تاوان و ڕزگار بوون لە ئاگری دۆزەخ، ئەگەر چی فەرموودەکە لاوازیش بێت کە هەندێک زانا لاوازی دەکەن، بەڵام مانای هەمان مانای فەرمووی بطاقەیە.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودە و فەرموودەی بطاقە بەڵگەن لەسەر فەزلی وشەی لا إله إلا الله، تاوان مقابلی نییە، بەڵام بۆ کەسێک تەواوی کردبێت

---

[١] التعليق المفيد.

[٢] إعانة المستفيد (٩٨/١).

و حەقی پێ دابێت و مەرجەکانی جێ بەجی کردبێت و شک و گومان تێکەڵ بە دڵی نەبووبێت.)[١].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٦).

**وللترمذي و حسنه عن أنس رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (قال الله تعالى: يا ابن آدم إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا لأتيتك بقرابها مغفرة).**

واته: له ئەنەس دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت گوتی: گوێ بیستی پێغەمبەری خوا بووم (ﷺ) دەیفەرموو: (خوای بەرز و بڵند فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر پڕ بە زەمین گوناهت هەبێت و پاشان بگەیت پێم "بە مردن" لە حاڵێکدا هیچ شەریکت دانەنابێت بۆم، چ زۆر چ کەم، منیش پڕ بە زەمین لێخۆش بوونت پێ دەبەخشم).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لا تشرك بي شيئا):** نەناسراو هاتووە ڕستەی نەفی، دەلالەت لەسەر گشتییەتی دەکات، واتە: نە شیرکی گەورە و نە شیرکی بچووک.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزلی تەوحید، وە هۆکارە بۆ لێخۆش بوون لە تاوان، مطابقی بابە: (وما يكفر من الذنوب)[1].

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی تەوحید و خۆپاراستن لە شیرک، ئەگەر پڕ بە زەوی تاوانت هەبێت خوای گەورە پڕ بە زەوی لێخۆش بوونی پێ دەبەخشێت.

[1] القول المفيد (١/١٠٠).

قەرعاوی دەفەرموویت: (فەرمووده‌كه بەڵگەیه هەر كەسێک بمرێت و ڕزگار بوویێت له شیرک بە هەموو جۆرەكانییەوە، دەچێته بەهەشت ئەگەر چی تاوانی هەبێت پڕ بە زەوی)[1].

**٢-** هەندێ زانا ئەم فەرموودەیه دەكەنه بەڵگه كه شیركی بچووک خوای گەورە لێی خۆش نابێت ئەگەر تەوبەی لێ نەكردبێت تا سزای دەدات، چونكه ئەم فەرمووده هەموو جۆرەكانی شیرک دەگرێتەوە، وتەی: (شيئا) نەناسراوە و ڕستەكەش نەفی یە، مانای گشتییەتی هەڵدەگرێت، واتە: نه شیركی بچووک و نه شیركی گەورەی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه لەسەر فراوانی ڕەحمی خوای گەورە، وەڵامە بۆ خەوارج و موعتەزیلە كه دەڵێن خاوەنی تاوانی گەورە لە دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه كه لێخۆش بوون بە مەرج گیراوە بە خۆ دوور خستنەوە له شیرک، ئەمە فەزڵی تەوحیدە، وە وەڵامە بۆ خەوارجەكان و ئەوانەی خەڵک كافر دەكەن بە ئەنجام دانی تاوانی گەورە، وە بەڵگەیه بۆ فەزڵ و ڕەحمەتی خوای گەورە)[3].

**٤-** ئەم فەرموودەی بەڵگەیه كه فەرموودەی قودسی هەیە، قودسیش ئەوەیه كه دراوەته پاڵ قودس، واتە: پاک، لەبەر ئەوە پێی دەڵێن فەرموودەی قودسی چونكه بەزۆری باسی

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤٤).
[2] القول المفيد (١٠٠/١).
[3] إعانة المستفيد (٩٩/١).

پاكی خوا و پاک ڕاگرتنی خوا دەكات لە هەموو كەم كوڕییەک، هەروەها فەرموودەی قودسی زانایان ناوی تریشیانی لێناوە، وەک (حديث الإلهي)، (حديث الرباني).

سەبارەت بە فەرموودەی قودسی دوو وتە هەیە:

وتەی یەكەم: هەندێ زانا دەڵێن فەرموودەی قودسی دەربڕینەكە (وتەكە) و ماناكەی لە لایەن خواوەیە، چونكە:

- پێغەمبەر (ﷺ) دەداتە پاڵ خوا، دەفەرموێت: (قال الله) واتە: خوا فەرمووی، ئەمە ڕوون و ئاشكرایە كە خودی وتەكە هی خوای گەورەیە.

- چۆن دەبێت بڵێیت خوای گەورە فەرمووی كەچی وتەكە هی پێغەمبەر (ﷺ) بێت؟! پێغەمبەر (ﷺ) ئەمین بووە چۆن وتەی خوا بە مانا دەگێڕێتەوە و دەڵێت خوا فەرمووی؟!

وتەی دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون فەرموودەی قودسی ماناكەی لە خواوەیە بەڵام دەربڕین (وتە) لە پێغەمبەرەوەیە، دەڵێین:

- ئەگەر فەرموودەی قودسی وتە و ماناكەی لە لایەن خواوە بوایا، دەبوایا لە قورئان بەرزتر بێت، چونكە فەرموودەی قودسی پێغەمبەر (ﷺ) لە خواوە دەگوازێتەوە ڕاستەوخۆ، كەچی قورئانە ڕاستەوخۆ وەری نەگرتووە لە خوا، بەڵكو جبریل بۆ پێغەمبەری دابەزاندووە.

- ئەگەر فەرموودەی قودسی وتە و ماناكەی لە لایەن خواوە بوایا، دەبوایا هیچ جیاوازی نەبوایا لە نێوان فەرموودەی قودسی و قورئان.

زانایان دەڵێن هەردوو لا یەک دەنگن كە فەرموودەی قودسی وەحییە لە خواوە، بەڵام جیاوازی لە وتەكەیە ئایا هی خوایە یان هی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەگەر واز لەم جیاوازییە بهێنرێت باشترە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (فەرموودەی قودسی ماناکەی لە خواوەیە و وتەکە هی پێغەمبەرە (ﷺ)، کە ئەمە وتەی ڕاستە.

ئەگەر بلێی باشتر وایە واز لەم جیاوازییە بهێنی لە ترسی ئەوەی نەوەک تووشی زیادەڕەوی ببیت، بەکورتی بڵێیت: فەرموودەی قودسی ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) لە خواوە دەگێڕێتەوە، ئەمە بەسە...)[1].

---

[1] مجموعە فتاوی ابن عثیمین (٩/٥٩-٦٢).

## باب من حقق التوحيد دخل الجنة بغير حساب

وقول الله تعالى: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ [النحل: ١٢٠]

وقال: ﴿وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ﴾ [المؤمنون: ٥٩]

عن حصين بن عبد الرحمن قال: كنت عند سعيد بن جبير فقال: أيكم رأى الكوكب الذي انقض البارحة؟ فقلت: أنا، ثم قلت: أما إني لم أكن في صلاة، ولكني لدغت، قال: فما صنعت؟ قلت: ارتقيت قال: فما حملك على ذلك؟ قلت: حديث حدثناه الشعبي، قال وما حدثكم؟ قلت: حدثنا عن بريدة بن الحصيب أنه قال: لا رقية إلا من عين أو حمة. قال: قد أحسن من انتهى إلى ما سمع. ولكن حدثنا ابن عباس عن النبي (ﷺ) أنه قال: (عرضت علي الأمم، فرأيت النبي ومعه الرهط، والنبي ومعه الرجل والرجلان، والنبي وليس معه أحد، إذ رفع لي سواد عظيم، فظننت أنهم أمتي، فقيل لي: هذا موسى وقومه، فنظرت فإذا سواد عظيم، فقيل لي: هذه أمتك ومعهم سبعون ألفا يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب)

ثم نهض فدخل منزله. فخاض الناس في أولئك، فقال بعضهم: فلعلهم الذين صحبوا رسول الله (ﷺ).

وقال بعضهم: فلعلهم الذين ولدوا في الإسلام فلم يشركوا بالله شيئا، وذكروا أشياء، فخرج عليهم رسول الله (ﷺ) فأخبروه، فقال: (هم الذين لا يسترقون ولا يكتوون ولا يتطيرون وعلى ربهم يتوكلون) فقام عكاشة بن محصن فقال: ادع الله أن يجعلني منهم. قال: (أنت منهم) ثم قام رجل آخر فقال: ادع الله أن يجعلني منهم. فقال: (سبقك بها عكاشة)[١].

---

[١] أخرجه البخاري (٣٤١٠)، ومسلم (٢٢٠).

**فيه مسائل:**

**الأولى:** معرفة مراتب الناس في التوحيد.

**الثانية:** ما معنى تحقيقه.

**الثالثة:** ثناؤه سبحانه على إبراهيم بكونه لم يكن من المشركين.

**الرابعة:** ثناؤه على سادات الأولياء بسلامتهم من الشرك.

**الخامسة:** كون ترك الرقية والكي من تحقيق التوحيد. السادسة: كون الجامع لتلك الخصال هو التوكل.

**السابعة:** عمق علم الصحابة لمعرفتهم أنهم لم ينالوا ذلك إلا بعمل.

**الثامنة:** حرصهم على الخير.

**التاسعة:** فضيلة هذه الأمة بالكمية والكيفية.

**العاشرة:** فضيلة أصحاب موسى.

**الحادية عشرة:** عرض الأمم عليه، عليه الصلاة والسلام.

**الثانية عشرة:** أن كل أمة تحشر وحدها مع نبيها.

**الثالثة عشرة:** قلة من استجاب للأنبياء.

**الرابعة عشرة:** أن من لم يجبه أحد يأتي وحده.

**الخامسة عشرة:** ثمرة هذا العلم، وهو عدم الاغترار بالكثرة، وعدم الزهد في القلة.

**السادسة عشرة:** الرخصة في الرقية من العين والحمة .

**السابعة عشرة:** عمق علم السلف لقوله: قد أحسن من انتهى إلى ما سمع، ولكن كذا وكذا. فعلم أن الحديث الأول لا يخالف

**الثاني. الثامنة عشرة:** بعد السلف عن مدح الإنسان بما ليس فيه.

**التاسعة عشرة:** قوله: (أنت منهم) علم من أعلام النبوة.

**العشرون:** فضيلة عكاشة.

**الحادية والعشرون:** استعمال المعاريض.

**الثانية والعشرون:** حسن خلقه (ﷺ).

## باب من حقق التوحيد دخل الجنة بغير حساب

## هەر کەسێ بە پوختەیی تەوحید لە خۆیدا بەدی بێنێت ئەوا بەبێ حساب و سزا دەچێتە بەهەشتەوە

تەوحید بە پوختەیی بەدی هێنان بۆ سێ شت دەگەڕێتەوە:

یەکەم: تەرک کردنی شیرک بە هەموو جۆرەکانییەوە، شیرکی گەورە و بچووک و شاراوە.

دووەم: تەرک کردنی بیدعە بە جۆرەکانییەوە.

سێیەم: تەرک کردنی تاوان بە جۆرەکانییەوە.

کەواتە بەدیهێنانی تەوحید بە پوختەیی دوو پلەی هەیە: پلەی واجب و پلەی سوننەت.

(پلەی واجب): تەرک کردنی ئەو شتانەیە کە باسمان کرد بەوەی واز لە شیرکی دیار و شارەوە و بچووک و گەورە بهێنێت، هەروەها واز لە بیدعە و تاوانیش بهێنێت، ئەمە ئەو پلەیەیە کە واجبە.

(پلەی سوننەت): ئەمەیان بەرزترین پلەیە کە پلەی واجبی بە دەست هێناوە و سوننەتیش جێبەجێ دەکات، ئەویش ئەوەیە کە دڵ و مەبەستی تەنها خوایە و بە هەموو شێوەیەک ڕووی لە خوایە و ئاوەڕدانەوەی بۆ کەس نییە جگە لەخوا نەبێت، هەروەها قسەکردن و کردەوە و تەنانەت جووڵەی دڵیشی تەنها بۆ خوایە[1].

[1] (التمهيد) لصالح آل الشيخ لاپەڕە (٤١-٤٢).

عبدالله بن حميد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (بیدعە کار لە تەوحید دەکات، تاوانیش پاداشتی تەوحید کەم دەکاتەوە، چەند بەندە تاوانی زۆر بێت پاداشتی تەوحیدی کەم دەبێتەوە.

لەبەر ئەوە دەڵێین: هێنانەدی تەوحید بە پوختی ساف بوون و ڕزگار بوونە لە شیرک و جۆرەکانی، هەروەها ڕزگاربوونە لە بیدعە و تاوان، شیرکی گەورە نەفی تەوحید دەکات و شیرکی بچووکیش نەفی تەواوی تەوحید دەکات، بیدعە کار لە تەوحید دەکات و کەمی دەکاتەوە، وە تاوانیش کەم کەرەوەی پاداشتی تەوحیدە)[(١)].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هێنانەدی تەوحید بە پوختی ڕزگار بوونە لە شیرک و بیدعە و تاوان، ئەگەر بوترێ: جیاوازی نێوان (باب فضل التوحید) و(باب من حقق التوحید) چییە؟

جیاوازی: باس کردنی فەزڵی تەوحید بۆ یەکخواپەرست ئەوەیە کە کەسێک شیرکی لەلا نەبێت، بەڵام هەندێک تاوانی هەیە کە تەوحید هەڵیدەوەرێنێت و بە هۆیەوە لادەچن.

بەڵام ئەم بابەتە بەرزترە لە بابەتی پێش خۆی، چونکە بابی (من حقق التوحید)، مەبەست پێی ئەوەیە هیچ شەریکی بۆ خوا بڕیار نەداوە و هیچ تاوانی لە لا نەماوە، ئەمەیان بەدیهێنانی تەوحیدە بە پوختی، هەر کەسێک بەم پلەیە بگات دەچێتە بەهەشت بە بێ حساب، سەبارەت بەوەی چ جیاوازیەک هەیە لەنێوانیان؟

هەر کەسێک لە پلەی بابەتی پێشتر بێت، واتە: یەکخواپەرست بێت و تاوانی هەبێت، ئەمەیان ئەگەر هەیە خوا لێی خۆش بێت و ئەگەریش هەیە سزای بدات و پاشان لە ئاگر دەربهێنرێت، چونکە یەکخواپەرستان سێ پلەن:

---

(١) شرح کتاب التوحید لاپەڕە (٥٥).

هەروەک خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾﴾ [فاطر: ٣٢]

چینی یەکەم: (ظالم لنفسه)، ستەمکار: ئەوانەن کە سەلامەتن لە شیرک بەڵام سەلامەت نین لە تاوانی جگە لە شیرک، ئەمانە ستەمکاری نەفسی خۆیانن و شایستەی سزادانن.

چینی دووەم: (سابق بالخيرات)، دەست پێشخەری دەکەن لە خێر و چاکە: ئەوانەن کە سەلامەتن لە شیرکی گەورە و بچووک و بیدعە، هەروەها واز لە حەرام و مەکروهەکان و هەندێک لە ڕێگەپێدراوەکانیش دەهێنن، وە خۆشیان ماندوو دەکەن بۆ گوێڕایەڵی واجب و سوننەتەکان، ئەمانە ئەوانەن کە دەست پێشخەری دەکەن لە خێر و چاکە، هەر کەسێک لەم پلەیە دابێت دەچێتە بەهەشت بێ حساب و سزا.

چینی سێیەم: (مقتصد)، مام ناوەندەکان: ئەوانەن کە واجبەکان ئەنجام دەدەن و واز لە حەرامکراوەکان دەهێنن، ئەوانە چاکەکارن)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (تحقيق التوحيد: ڕزگار بوونە لە شیرک و بیدعە و تاوان، هەر کەسێک تەحقیقی تەوحید بکات و سەلامەت بێت لە شیرک و بیدعە و تاوان، ئەوە دەچێتە بەهەشت بێ حساب و سزا، چونکە شیرکی گەورە نەفی تەوحید دەکات و شیرکی بچووکیش نەفی تەواوی تەوحید دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بیدعە و تاوان کاری تێ بکات و پاداشتەکەی کەم بکاتەوە) [٢]

[١] إعانة المستفيد (١/١٠١-١٠٢).
[٢] التعليق المفيد لاپەڕە (١٦).

**و قول الله تعالى:** ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ١٢٠﴾ [النحل: ١٢٠]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (بەڕاستی ئیبراهیم (علیه السلام) بەردەوام چوار سیفەتی هەبووە:

یەکەم: پێشەوا و پێشەنگی خێر بووە.

دووەم: بەردەوام لە تاعەتدا بووە تەنها بۆ خوا.

سێیەم: ڕوو لە خوا بووە و پشتی لە هەموو شتێک کردووە جگە لە خوا.

چوارەم: بە تەواوی بەریی بووە و دوور بووە لە تەواوی موشریکان).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿قَانِتٗا لِّلَّهِ﴾: (القنوت): واتە بەردەوام بوون لەسەر تاعەت، ﴿حَنِيفٗا﴾: واتە: لادان لە ڕێگای موشریکەکان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

سليمان ال الشيخ دەفەرموویت: (خوای گەورە وەسفی ئیبراهیمی کردووە بەم سیفەتە بەرز و جوانانە، کە هێنانەدی بەرزترین سیفەتەکانی پلەی تەوحیدە لە خۆدا، وەک ئارەزوو خستنەسەر بۆ شوێن کەوتن و تەوحید لەخۆ هێنانەدی بە ئەنجام دانی فەرمانەکان و تەرک کردنی نەهی یەکان، هەر کەسێک شوێنی بکەوێت لەم شتانە دەچێتە بەهەشت بێ حساب و سزا، هەروەک چۆن ئیبراهیم دەچێتە بەهەشت)[1].

---

[1] تيسير العزيز الحميد لاپەڕە (٧١).

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** فەزلی ئیبراهیم (علیه السلام) کە پێشەوای یەکخواپەرستانە و باوکی پێغەمبەرانە، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۝١٢٠ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، بەم چوار سیفەتەی خوای گەورە وەسفی ئیبراهیمی پێ کردووە، کە ئەمانەن:

یەکەم: ئیبراهیم (أمة) بووە، واتە: پێشەوای خێر و چاکە بووە.

دووەم: ئیبراهیم بەردەوام لە تاعەتدا بووە و جێگیربووە لەسەر گوێڕایەڵی و نییەتی پاک بووە لە ئەنجام دانی کردەوە بۆ خوا.

سێیەم: بەردەوام ڕووی لەخوا بوو و پشتی لە موشریکان بوو، پشتی لە هەموو شتێک کردووە جگە لە خوای گەورە نەبێت.

چوارەم: لە موشریکەکان نەبووە و بەری بووە لە خۆیان و لە دینیان)[1].

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕاڤەکارانی قورئان دەفەرموون ئیبراهیم بەرزترین پلەی خۆشەویستی بەدەست هێنا و خوای گەورە مەدحی کرد لەبەر سێ شت:

یەکەم: نەفسی خۆی بەخشی بە خوا، کاتێک پەیکەرەکانی قەومەکەی خۆی شکاند و گفتوگۆی لەگەڵ کرد و ئاگریانی بۆ هەڵگیرساند نەیوت: پێم ناخۆشە و زۆرم لێ کراوە، تەسلیمیان نەبوو، ....

---

[1] إعانة المستفيد (١٠٦/١).

دووەم: منالّی خۆی بەخشی بۆ خوا، بۆ ئەوەی دڵی سەلامەت بێت و تەسلیم بێت تەنها بۆ خوا و کەسێکی تر نەکاتە شەریک لەگەڵ خوا.

سێیەم: کاتێک فریشتەکان هاتنە لای گومانی برد کە میوانن بۆیە باشترین و گەورەترین خزمەتیانی کرد کە لەتوانایدا بوو، ئەویش ئەوە بوو گوێرەکەیەکی گەورەی هێنا بۆیان و فەرمووی: ئایا نافەرموون بیخۆن؟ کاتێک بینی ئەمانە دەست درێژ ناکەن بۆ خواردن و نایخۆن ترسی بۆ دروست بوو.

کەواتە ماڵ و نەفس و منالّی خۆی لە ڕێگای خوادا بەخشی، بۆیە بوو بە خەلیلی ڕەحمان و ئیمامی یەکخواپەرستان و باوکی پێغەمبەران، ئەو تەحقیقی تەوحیدی کرد لەسەر زانست و ئارام گرتن و یەقین و بەردەوامی و دەعوە)[١].

ابن قیم ڕەحمەتی خوا لێ بێت دەفەرمووێت: (کاتێک کە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) حەزی بە کوڕێک کرد، خوای گەورە پێی بەخشی، جا خۆشەویستی ئەو کوڕە بەشێک لە دڵی ئیبراهیمی داگیر کرد، خوای گەورەش ئەم کارەی پێ خۆش نەبوو کە لە دڵی ئیبراهیم دا خۆشەویستیێکی تر هەبێت جگە لە خوا، بۆیە لەخەودا فەرمانی بە ئیبراهیم کرد کە ئەو منالّە سەرببڕێت و بیکاتە قوربانی بۆ خوا، کە ئەمەش گەورەترین تاقیکردنەوە بوو بۆ دڵی ئیبراهیم (علیه السلام)، مەبەست لێرە سەربڕینی کوڕەکەی نەبوو، بەڵکو سەربڕینی خۆشەویستی ئەو کوڕە بوو لە دڵی ئیبراهیم دا (علیه السلام)، هەر بۆیە کاتێک ئیبراهیم ویستی کوڕەکەی سەر ببڕێت خوای گەورە بڕیاریدا لە بری کوڕەکەی مەڕێک سەر ببڕێت و کوڕەکەی دەرباز ببێت، ئەمەش بووە سوننەتێکی بەردەوام)[٢].

---

[١] شرح کتاب التوحید لاپەڕە ٥٧.
[٢] الداء والدواء.

**٢-** ئیبراهیم (علیه السلام) ئوممەتێک بووە، لەبەر دوو ئەگەر:

- یان لەبەر ئەوە بووە سیفەتی تەواوی خێر و چاکەی تێدا بووە، لەبەر ئەوە وەسف کراوە بە ئوممەتێک.

- یان لەبەر ئەوە بوە تەنها خۆی موسڵمان بووە، مجاهد دەفەرموویت: تەنها خۆی موسڵمان بووە، کەسی تر موسلمان نەبووە، لەبەر ئەوە بە ئوممەتێک وەسف کراوە، هەروەک چۆن پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە (زيد بن عمرو بن نفيل) دەفەرموویت: (يبعثه الله أمة وحده)[1].

ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە ئیبراهیم (علیه السلام) تەوحیدی بە پوختی بەدیهێناوە، وەسفی ئیبراهیمی کردووە بە ئوممەت کەچی خۆی بە تەنیا بووە؟ هەندێک دەڵێن ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەگەر کەسێک بە تەنها لەسەر ڕێگای ڕاست بێت تا هەست بە دڵ نەوایی بکات و هەست بە غوربەتی نەکات و نەترسێت، وا حساب بکات ئەو خۆی بە تەنیا ئوممەتێکە، ئەمەش هێز و دڵنەوایی بە ئیماندار دەبەخشێت.

**٣-** جێگیرکردنی پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم (علیه السلام) و پەیامەکەی.

**٤-** ئیبراهیم (علیه السلام) قودوە و پێشەوای دین و پێشەوای خێرە، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾.

**٥-** بەردەوام بوونی ئیبراهیم (علیه السلام) لەسەر عیبادەتی خوا، لەبەر وتەی: ﴿قَانِتًا لِّلَّهِ﴾.

---

[1] أخرجه أحمد في مسنده (١/١٨٨)، والطبراني في الكبير.

**وقال:** ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ۝٥٩﴾ [المؤمنون: ٥٩]

واته: خوای گەورە دەفەرموویێت: (وە ئەوانەش لەگەڵ خوا پەرستییەکەیاندا هەرگیز شەریک بۆ خوا دانانێن).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ﴾: نەفی هاتووە لەسەر کاری ڕانەبردوو، بە مانای گشتییەتی دێت، هەروەک ئەوە وایە خوای گەورە بفەرموویێت: ئەوانەش لەگەڵ خوا پەرستییەکەیاندا شەریک بۆ خوا دانانێن، نە لە شیرکی گەورە و نە لە شیرکی بچووک و نە لە شیرکی شاراوە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئایەتەکە بەڵگەیە هەر کەسێک ئەم سیفەتانەی تێدا بێت و نەفسی خۆی پاک بکاتەوە لە شیرک، ئەوە دەچێتە بەهەشت بێ حساب و سزا، چونکە تەحقیقی تەوحیدی کردووە و ئەمەش بەشێکە لە تەحقیقی تەوحید)[1].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئەهلی تەوحید دەبێت سەلامەت بێت لە شیرکی گەورە و بچووک، ئەمەیان تەحقیقی تەوحیدە، هەرگیز شەریک بۆ خوا بڕیار نادەن، نە شیرکی گەورە و نە شیرکی بچووک، ئەمانە تحقیقی تەوحیدیان کردووە و سەلامەتن لە شیرکی گەورە و

---

[1] الجديد (٤٨).

بچووک و شاراوە و دیار، هەروەها لە هەموو جۆرەکانی شیرک و بیدعە و سەرپێچییەکان [١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەمانە سیفەتی ئەهلی تەوحید و ئیماندارانن، ئەوان یەکخواپەرستن و تەنها خوا دەپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار نادەن و ڕزگار بوونە لە شیرک، لەگەڵ ئەوەش عیبادەت و ترسیان تەنها بۆ خوایە، کە ئەمەش تەواوی تەوحیدە)[٢].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ساف کردنی تەوحید و سەلامەت بوون لە شیرک هۆکارە بۆ چوونە بەهەشت.[٣].

---

[١] إعانة المستفيد (١٠٩/١).

[٢] التعليق المفيد لاپەڕە (٤٠).

[٣] الجامع الفريد لاپەڕە (٢١).

**عن حصين بن عبد الرحمن قال: كنت عند سعيد بن جبير فقال: أيكم رأى الكوكب الذي انقض البارحة؟ فقلت: أنا، ثم قلت: أما إني لم أكن في صلاة، ولكني لدغت، قال: فما صنعت؟ قلت: ارتقيت قال: فما حملك على ذلك؟ قلت: حديث حدثناه الشعبي، قال وما حدثكم؟ قلت: حدثنا عن بريدة بن الحصيب أنه قال: لا رقية إلا من عين أو حمة. قال: قد أحسن من انتهى إلى ما سمع. ولكن حدثنا ابن عباس عن النبي (ﷺ) أنه قال: (عرضت علي الأمم، فرأيت النبي ومعه الرهط، والنبي ومعه الرجل والرجلان، والنبي وليس معه أحد، إذ رفع لي سواد عظيم، فظننت أنهم أمتي، فقيل لي: هذا موسى وقومه، فنظرت فإذا سواد عظيم، فقيل لي: هذه أمتك ومعهم سبعون ألفا يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب)**

**ثم نهض فدخل منزله. فخاض الناس في أولئك، فقال بعضهم: فلعلهم الذين صحبوا رسول الله (ﷺ).**

**وقال بعضهم: فلعلهم الذين ولدوا في الإسلام فلم يشركوا بالله شيئا، وذكروا أشياء، فخرج عليهم رسول الله (ﷺ) فأخبروه، فقال: (هم الذين لا يسترقون ولا يكتوون ولا يتطيرون وعلى ربهم يتوكلون) فقام عكاشة بن محصن فقال: ادع الله أن يجعلني منهم. قال: (أنت منهم) ثم قام رجل آخر فقال: ادع الله أن يجعلني منهم. فقال: (سبقك بها عكاشة)[1].**

واته: حصين کوڕی عبدالرحمن خوا لێی ڕازی بێت گوتی: لای سەعیدی کوڕی جوبەیر بووم گوتی: (کامتان شەوی ڕابردوو ئەو ئەستێرەیەی بینی کە کشا؟) منیش گوتم: (من)، پاشان گوتم: (ئەڵبەتە من لە نوێژدا نەبووم "واتە ئەو گومانە باشەم پێ مەبەن" بەڵکو دووپشک پێوەمی دابوو).

---

[1] أخرجه البخاري (٣٤١٠)، ومسلم (٢٢٠).

سەعید گوتی: (جا چیت کرد؟)

گوتم: (بەدوای یەکێک دەگەڕام کە دوعام بەسەردا بخوێنێت).

سەعید گوتی: (جا چ بەڵگەیەک هانی دایت ئەو کارە بکەیت؟)

گوتم: (فەرموودەیەک کە شەعبی بۆمی گێڕاوەتەوە).

سەعید گوتی: (چی بۆتان گێڕایەوە؟)

گوتم: (شەعبی بۆمانی گێڕایەوە کە بورەیدەی کوڕی حوصەیب گوتی: (دوعا بەسەر خوێندن نییە، مەگەر بۆ کەسێک کە چاو لێی دابێت، یان بۆ کەسێک کە پێوەدراو بێت. "واتە: دوعا بەسەر خوێندن کاریگەری و شیفایەکی بە قوەتە بۆ ئەو دوو نەخۆشییە بە بەراورد لەگەڵ نەخۆشیەکانی دیکە).

سەعید گوتی: (هەر کەسێک کار بەو زانستە بکات کەپێی دەگات، کارێکی زۆر جوانی کردووە. (واتە: کارەکەت دروستە بەڵام پلەیەک هەیە لەوە باشترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت بۆمانی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئوممەتەکانم نیشان دران، پێغەمبەرم دەبینی لە دە کەس کەمتری لەگەڵ بوو، پێغەمبەر هەبوو پیاوێک یان دوو پیاوی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریش هەبوو هیچ کەسی لەگەڵ نەبوو، ڕەشایەکی گەورەم نیشان درا، منیش وام زانی ئەوە ئوممەتەکەی منن، لەوێ پێم گوترا: ئەوە موسا و قەومەکەیەتی، واتە: ئەوانەی کە شوێن موسا کەوتوون." پاشان سەیرم کرد ڕەشاییەکی گەورەم بینی، ئەوسا پێم گوترا ئەمانە ئوممەتی تۆن، جگە لە ئەمانەش لەگەڵیاندا حەفتا هەزاری دیکە بەبێ حساب و لێپرسینەوە و عەزاب دەچنە بەهەشتەوە).

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەجلیسەکە هەستا و چووە ماڵی خۆی.

ئینجا خەڵکانی ئامادە بوو لە بارەی ئەو حەفتا هەزارەوە کەوتنە گفتوگۆ، هەندێکیان گوتیان: لەوانەیە ئەو کەسانە بن کە هاوڕێیەتی پێغەمبەریان کردووە، هەندێکی تریان گوتیان لەوانەیە ئەو کەسانە بن کە بە موسوڵمانییێتی لەدایک بوون و هیچ شەریکیان بۆ خوا دانەناوە، هەندێ شتی دیکەشیان باسکرد.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە ناویان و خەبەری ئەو گفتوگۆ و باسەیان پێدا.

ئەویش فەرمووی: (ئەو حەفتا هەزارە ئەوانەن کە داوا لە کەس ناکەن دووعایان بەسەردا بخوێنن، داوا لە خەڵکیش ناکەن داخ کردنیان بۆ بکەن بۆ شیفای نەخۆشی و خۆشیان نایکەن، هەروەها شوومی و ڕەشبینی ناکەن نە بە باڵندە و نە بە شتی دیکەشەوە، تەنها پشت بەخوا دەبەستن و تەوەکولیان هەر لەسەر ئەوە).

ئینجا عوکاشە هەستایەوە و گوتی: (ئەی پێغەمبەر دوعام بۆ بکە کە من یەکێ بم لەوانە)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تۆ یەکێکی لەوانە).

پاشان پیاوێکی دیکە هەستایەوە و گوتی: (دوعام بۆ بکە کە من یەکێ بم لەوانە).

فەرمووی: (عوکاشە پێشت کەوت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(لدغت):** واتە: دووپشک پێیوە دابووم.

**(ارتقیت):** واتە: داوام لە کەسێک کرد ڕوقیەم لەسەر بخوێنێ.

**(عرضت علي الأمم):** لەوانەیە ئەم پیشان دانە لە خەو بێت یان ئیسرا و میعراج بێت.

**(الرهط):** لە سێ هەتا نۆ پێی دەڵێن (رهط).

**(والنبي ومعه الرجل والرجلان):** لەوانەیە (واو) بە مانای (أو) بێت، واتە: یان، چونکە ئەگەر بڵێی بە مانای (واو) دێت کەواتە سێ پیاوی لەگەڵ بووە.

**(النبي):** لە زمانی عەرەبی دا مشتەقی (النبأ) واتە: هەواڵ، بۆچی پێی دەڵێن (النبي)؟

وەڵام: چونکە هەواڵدەر و هەواڵ پێدراوە، هەواڵ پێدراوە بەوەی خوای گەورە هەواڵی پێداوە و وەحی بۆ ناردووە، وە هەواڵدەرە لە لای خوای گەورە بە گەیاندنی وەحی و فەرمانەکانی.

کەواتە (نبي) لە سەر وەزنی (فعیل)ە ئایا بە مانای (فاعل) یان (مفعول) دێت؟

ئەگەر بڵێین (فعیل) بەمانای (فاعل) دێت، لأنه منبئ عن الله عزوجل، ئەگەر بڵێین (فعیل) بە مانای (مفعول) دێت لأنه منبأ، زانایان دەڵێن دروستە هەردوو مانا هەڵبگرێت ئەگەر پێچەوانەی یەکتر نەبن.

زانایان دەڵێن: (النبي مشتقى النبوة، وهي الشئ المرتفع)، کە شتێکی بەرزە، هەروەها لە زمانی عەرەبی دا وشەی (النبي) بۆ نیشانەیەک لە نیشانەکانی زەوی بە کاردێت کە خەڵک بۆ خۆیان ڕێگای پێ دەدۆزنەوە، کەواتە لەبەر ئەوە پێی دەڵێن (النبي) چونکە خاوەن پلە و پایەی بەرزن لە دونیا و قیامەتدا و باشترینی مرۆڤەکانن، هەروها نیشانەن بۆ خەڵک بە هۆی ئەوانەوە خەڵک ڕێگای ڕاست دەدۆزنەوە و دەگەن بە ڕاستی، دونیا و ئاخیرەتیان چاک دەبێت.

**(سواد عظيم):** ڕەشاتییەکی گەورە مەبەست پێی کەسەکانە.

**(فلعلهم الذين صحبوا رسول الله (ﷺ)):** ئەم گفتوگۆ کردنەی هاوەڵان لەسەر ئەم بابەتە بۆ ئەوە بوو بۆ ئەوەی بە نەزەری بگەن بە ڕاستی و بە کردەوەش لەو کەسانە بن، وتەی: (ئەوانەن کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوون):

١- لەوانەیە مەبەست پێی هاوەڵان بێت بە شێوەیەکی گشتی، پاڵپشتی بۆ ئەمە رووکەشی وتەکەیە.

٢- لەوانەشە مەبەست پێی ئەو هاوەڵانە بێت کە لە کۆچ کردن لەگەڵی بوون، پاڵپشتی بۆ ئەمە ئەگەر بڵێیی هاوەڵان بە شێوەیەکی گشتی، ئەوا ئەوان دەیانگووت: ئێمە، چونکە ئەوانەی قسەیان دەکرد هاوەڵان بوون، بەڵگەش بۆ ئەمە وتەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە بە خالدی کوڕی وەلیدی گوت: (جنێو بە هاوەڵانم مەدە) کەواتە مەبەست پێی ئەو هاوەڵانە بووە کە کۆچیان کردووە لەگەڵی، بەڵام ڕێگرێکی تر بۆ ئەمە ئەوەیە کۆچ کردووەکان ژمارەیان ناگاتە حەفتا هەزار کەس، هەروەها ڕێگر بۆ ئیحتمالی یەکەم ئەوەیە: هاوەڵان لە حەفتا هەزار زیاتر بوون.

٣- لەوانەیە مەبەستیان ئەوە بێت ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر بوون تا فەتحی مەککە، چونکە دوای فەتحی مەککە خەڵک پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلام، ئەم بابەتە پێویستی بە گەڕانەوەی زیاتر هەیە[1].

**(بغير حساب ولا عذاب):** ئەوەی دیار بێت لەناو گۆڕ سزا نادرێن و حسابیان لەگەڵ ناکرێت تا هەستانی قیامەت.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (کە هەر کەسێک تەوحید بە پوختی بەدی بهێنێت دەچێتە بەهەشت بێ حساب و سزا، تەفسیری ئەمە ئەوەیە واز لە شیرکی گەورە و بچووک بهێنێت و شتە مەکروهەکان تەرک بکات)[2].

---

[1] القول المفيد.
[2] إعانة المستفيد (١/١٢٥).

## سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دووری پێشینەکان لە مەدح کردنیان بە شتێک کە تیایاندا نەبووە، چونکە حصینی کوڕی عبدالرحمن وتی: (من لەناو نوێژ نەبووم، بەڵکو دووپشک پێوەمی دابوو)، چونکە ئەوەی ئەستێرە ببینێت لە کاتی کشاندا بەڵگەیە کە بەئاگایە بۆ زیکر یان بۆ شەو نوێژ.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿١٨٨﴾﴾ [آل عمران: ١٨٨]

واتە: وا گومان مەبە بەوانەی دڵخۆشن بەوەی کە هەیانە و حەزدەکەن باس بکرێن و خەڵکی سوپاسیان بکات لەسەر کارو چاکەیەک کە نەیانکردووە، ئەوە هەرگیز وامەزانە ئەوانە لە دەست سزا ڕزگاریان دەبێت، بەڵکو سزایەکی بە ئێش چاوەڕێیانە.

مانای ئایەتەکە ئەوە هەڵدەگرێت هەر کەسێک حەز بکات باسی بکرێت و سوپاسی بکرێت لەسەر کار و کردەوەی باش داخلی زەمکردن نابێت، لەبەر مفهومی وتەی: ﴿وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾، ئیبراهیم (عليه السلام) دەڵێت: ﴿وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ﴿٨٤﴾﴾ [الشعراء: ٨٤]، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت حەز بکات خەڵک سوپاسی بکات بەوەی کردوویەتی تەنها مەبەستی سوپاس کردنی خەڵکی هەبێت، ئەمەیان حەڕامە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەمە ئاگادارکردنەوە و وشیارکردنەوەی مرۆڤە لەوەی کە حەز بکات مەدح بکرێت لە شتێک کە نەیکردووە، ئەمەش چەند جۆرە:

- هەندێ جار مرۆڤ بەڕوونی دەري دەبڕێت کە کردەوەی باشی کردووە، کەچی درۆش دەکات.

- جاریش هەیە فێڵ دەکات و گومانی گوێگر وا دەبات کە خۆی کردەوەی باشی کردووە، کەچی نەشی کردووە.

سەبارەت بە حاڵەتی یەکەم وەک ئەوەیە بڵێیت: شەو نوێژم کردووە و دوعام کردووە، کەچی درۆش دەکات بۆ ئەوەیەتی تا خەڵکی مەدحی بکەن)[1].

کەواتە حەز کردن بە مەدح کردن لەسەر کردەوەی باش ئەم چوار حاڵەتانەن:

یەکەم: کەسێک بە ڕوون و ئاشکرا درۆ دەکات و دەڵێت کردەوەی باشم ئەنجام داوە بۆ ئەوەی مەدحی بکەن، ئەمەیان حەڕامە.

دووەم: کەسێک بە ڕوون ئاشکرا درۆ ناکات، بەڵام گومانی گوێگر بۆ ئەوە دەبات کە کردەوەی باشی ئەنجام داوە بۆ ئەوەی مەدحی بکرێت، ئەمەشیان حەڕامە.

سێیەم: ئەگەر یەکێک باسی کردەوەی باشی خۆی بۆ خەڵك کرد کە پێشتر کردوویەتی بە پاکی، بۆ ئەوەی مەدحی بکەن، ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: کردەوەکەی پووچ دەبێتەوە، هەندێ زاناش دەڵێن خێری کردەوەکەی کەم دەبێتەوە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (یەکێک دڵ خۆش بێت بەوەی خەڵک کردەوەکەی بزانن ئەمە (ریاء) نییە، چونکە ئەمە دوای تەواو بوونی کردەوەکە ڕووی تێ کردووە).

---

[1] تفسير سورة ال عمران (٥٣١/٢).

چوارەم: کەسێک باسی کردەوەی باشی خۆی ناکات، بەڵام بە مەدح کردنی خەڵکیش دڵ خۆشە، زانایان دەڵێن مانای ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر مرۆڤ حەز بکات بە مەدح لە شتێک خۆی کردبێتی، ئەوە هیچی تێدا نییە، بەڵکو ئەوەی حەرام بێت ئەوەیە کە نەیکردبێت و حەزیش بکات مەدح بکرێت.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من لم یشکر الناس لم یشکر الله)[١].

واتە: (هەر کەسێک سوپاسی خەڵک نەکات سوپاسی خوای گەورەش ناکات).

ئەگەر دڵخۆش بوون بە سوپاسی خەڵک دروست نەبوایا ئەوە دەبووە فیتنە بۆ خەڵک و ڕێگری دەکرا لەوەی سوپاسی خەڵک بکەین، دڵخۆش بوون بە مەدح زەم کراو نییە، بەڵکو ئەوکاتە زەم کراو دەبێت ئەگەر نیعمەتەکانی خوای گەورە لەبیر بکات و بڵێ ئەوە لە زیرەکی و باشی خۆمە.

عن أبی ذر رضی الله عنه قال: قیل لرسول الله (ﷺ): أرأیت الرجل یعمل العمل من الخیر و یحمده الناس علیه؟ فقال: (تلك عاجل بشری المؤمن)[٢].

واتە: بە پێغەمبەر (ﷺ) وترا: چی دەڵێی بۆ پیاوێک ئەگەر کردەوەی باش بکات و خەڵکی سوپاسی بکەن؟ فەرمووی: (ئەمە مژدەی پێش وەقتەی ئیمانداره).

سیوطی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم مژدەیە پێش وەقتە بەڵگەیە بۆ مژدەی دواخراو)[٣].

---

[١] مسند احمد (١٣/٢٤).

[٢] رواه مسلم (٢٦٤٢).

[٣] شرح السیوطی علی مسلم (٥٥٦/٥).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە باشترین ڕوقیە ڕوقیە کردنە بۆ چاوەزار و پێوەدان، وە بۆ بێجگە لەم دووانەش نەخۆشییەکانی تریش دروستە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: ((لارقية إلا من عين أو حمة)، زانایان دەڵێن ئەمە لە بابەتی تأکیدکردنەوەیە نەک لە بابەتی (حصر) بێت، ڕوقیە سوودی هەیە بۆ بێجگە لە چاوەزار و پێوەدان و هەروەها بۆ هەموو نەخۆشییەکانی تر، بەڵام ڕوقیە لە هەمووان زیاتر سوودی بۆ ئەم دوو نەخۆشیە هەیە، ئەویش چاوەزار و پێوەدانە)[(١)].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مەبەستی فەرموودەکە ئەوە نییە کە (حصر) بێت، واتە ڕوقیە بەس بۆ ئەم دوو حاڵەتە دروست بێت، بەڵکو زانایان دەڵێن مەبەستی ئەوەیە کە ڕوقیە لەم دوو حاڵەتە لە هەمووان لە پێشترە، واتە: هیچ ڕوقیەیێک لەپێشتر و باشتر نییە بۆ چاوەزار و پێوەدان، چونکە فەرموودەکان بەڵگەن کە دروستە ڕوقیە بۆ بێجگە لە چاو و پێوەدان بکرێت، وەک فەرموودە دەفەرموویێت: (هیچی تێدا نییە ڕوقیە بکرێت ئەگەر شیرک نەبێت) هەروەها جێگیر بووە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوقیەی کردووە و بۆیشی کراوە، ئەمە بەڵگەیە کە دروستە و هیچی تێدا نییە سوود بە نەخۆش بگەینیت و ئایەتەکانی لەسەری بخوێنی)[(٢)].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دڵ دانەوەی پێغەمبەر محمد (ﷺ) و بانگخوازان، چونکە پێغەمبەر هەبووە کەس باوەڕی پێی نەهێناوە و هەشبووە یەک یان دوو کەس باوەڕی پێ هێناوە.

---

[(١)] إعانة المستفيد (١/١١٥).

[(٢)] التعليق المفيد.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (پیشاندانی ئومەت بە پێغەمبەر دوو سوودی هەیە:

یەکەم: دڵ دانەوەی پێغەمبەرە (ﷺ)، بەجۆرێک پێغەمبەری بینیوە پیاوێک یان دوو پیاوی لەگەڵ بووە، هەش بووە کەسی لەگەڵ نەبووە، دڵی پێغەمبەر بەوە دراوەتەوە، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ [الأحقاف: ٩]

دووەم: ڕوون کردنەوەی فەزڵی پێغەمبەر و شەرەفەکەیەتی بەوەی زۆرترین شوێن کەوتەی هەیە و باشترین پێغەمبەرە، کەواتە: پیشان دانی ئومەتانی پێشوو ئەم دوو سوودەی هەبووە)[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی موسا و ئوممەتەکەی، کە زۆرترین ئوممەتن دوای ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ).

**٥-** ئەم فەرموودە بەڵگەیە بۆ فەزڵی ئەم ئوممەتە کە زۆرترینی خەڵکی بەهەشتن، بەڵکو لە سێ بەشی خەڵکی بەهەشت دوو بەشی ئەم ئوممەتەن و بەشەکەی تر ئوممەتەکانی ترن.

عن ابن بريده عن أبيه قال: قال رسول الله (ﷺ): (أهل الجنة عشرون ومائة صف، ثمانون منها من هذه الأمة، وأربعون من سائر الأمم )[2].

واتە: (خەڵکی بەهەشت سەد و بیست ڕیزن، هەشتا ڕیز لەم ئوممەتەن و چل ڕیزەکەی تر هی ئومەتانی ترن).

---

[1] القول المفيد.
[2] رواه الترمذي (٢٥٤٦).

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە ئەوانەی شوێن حەق دەکەون زۆر کەمترن لەوانەی شوێن ناحەق دەکەون.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ گرینگی دانی هاوەڵان بە ئاخیرەت و سوربوونیان لەسەر خێر و چاکە و کردەوەی باش، چونکە گفتوگۆیان کرد لەسەر شتێک بۆ ئەوەی بگەن بە ئەنجام و بە کردەوە جێبەجێی بکەن و ئەم پلەیە بە دەست بهێنن.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەمە بەڵگەیە بۆ حەریسی هاوەڵان لەسەر خێر و چاکە، هەروەها گرینگی دانیان بە کاروباری ئاخیرەت، چونکە ئەمانە گرینگیان بە دونیا نەدەدا بەڵکو گرینگیان بە ئاخیرەت دەدا، بە پێچەوانەی ئەهلی دونیا کاتێک گوێیان لە بازرگانییەک دەبێت قسەی لەسەر دەکەن و ئاخیرەت نابێتە ڕێگر بۆیان لەم بازرگانی یە)[1].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی موعجیزەی ئیسرا و میعراج، چونکە ئەم بینینەی ئوممەتانی پێشوو لە ئیسرا و میعراج بووە، لەسەر وتەیەک لە وتەکانی زانایان.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (پیشاندانی ئوممەتەکانی پێشوو لەلایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا بووە)[2].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەمەیان لە ئیسرا بووە لەسەر وتەی ڕاستی زانایان)[3].

---

[1] إعانة المستفيد (١١٩/١).
[2] القول المفيد.
[3] التعليق المفيد.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەمە موعجیزەیەک بووە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر کە ئوممەتەکانی پێشووی پیشان دراون، وتراوە ئەمەیان لە ئیسرا و میعراج بووە)[1].

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە باشتر وایە داوای ڕوقیە لەکەس نەکەیت، لەوانەیە یەکێک بڵێت: دینی ئیسلام دینی هۆکار گرتنەبەر و پشت بەخوا بەستنە (توكل)ە، بۆچی فەرموودە هاتووە سەبارەت بەو کەسانەی دەچنە بەهەشت بێ حساب و سزا دەفەمووێت: (ئەوانەن کە داوای ڕوقیە لە کەس ناکەن و سوتان بەکارناهێنن وەک چارەسەر و ڕەش بین نین و پشتیان تەنها بەخوا بەستووە)، بۆچی باش نییە داوای ڕوقیە لە کەس بکەیت لە کاتێکدا دروستە؟

وەڵام: زانایان دەڵێن ڕاستە دینی ئیسلام دینی هۆکار گرتنەبەر و ڕوقیە کردنە بێ ئەوەی داوا لەخەڵک بکەیت، داوا لە خەڵک کردن بۆ ڕوقیە ئەویش دروستە بەڵام باشتر وایە وازی لێ بهێنی و داوایان لێ نەکەیت، کە ئەمە لە تەواوی تەوحیدە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (هەندێک ڕیوایەتی مسلم هاتوون دەڵێن: (لا يرقون) واتە ڕوقیە ناکەن، بەڵام ئەم ڕیوایەتانە هەڵەن، هەروەک ابن تيمية وا فەرمووە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوقیەی کردووە و جبریلیش روقیەی بۆ کردووە، هەروەها عائیشە و هاوەڵانی ڕوقیەیان کردووە.

و(استفعل): بە مانای داوا کردنی کار دێت وەک (استغفر)، واتە: داوای لێ خۆش بوون، لێرەش (استرقی)، واتە داوای ڕوقیە کردن، واتە: داوا لەکەس ناکەن لەسەریان بخوێننەوە لەبەر ئەم هۆیانە:

---

[1] إعانة المستفيد.

- لەبەر بەهێزی پشت بەستنیان تەنها بەخوا.

- لەبەر عزەتی نەفسیان لە زەلیل بوون بۆ بێجگە لە خوا.

- لەبەر ئەوەی پەیوەست بوون بە بێجگە لە خوای تێدایە)[(١)].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (داوا لەکەس ناکەن کە لەسەریان بخوێننەوە، بۆچی؟ چونکە داوا کردنی ڕوقیە لە خەڵک داوا کردنە لە خەڵک، وە داوا کردن لە خەڵکیش زەلیلی تێدایە، ئەوان بێ نیازن لە خەڵک و پشت بە خوا دەبەستن، ئەمەیان لە تەواوی تەوحیدە کە مرۆڤ داوا لە خەڵک نەکات، پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتی وەرگرت لە هەندێک لە هاوەڵان کە داوا لە کەس نەکەن، یەکێکیان ئەگەر قامچی بەر ببوایەوە لەسەر پشتی ئاژەڵەکەی بە کەسی نە دەگوت قامچیەکەم پێ بدەوە، چونکە دەیانەویست بێ نیاز بن لە خەڵک، بەڵام پرسیارکردن لە شتێک زانست بێت و کێشەت بۆ دروست بوو‌بێت ئەمەیان لەمە نییە و واجبە بپرسی)[(٢)].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: ("لا يسترقون" واتە داوای ڕوقیە لە کەس ناکەن، چونکە ئەوەی داوای ڕوقیە لە خەڵک دەکات دڵی بەدوای ئەو کەسەوە دەڕوات کە ڕوقیە دەکات، هەتا ئەمە لادەچێت لە ڕووی هۆکارەکە دروستە، ئەم نەفیەی فەرموودە باسی کردووە دەڵێت: (لا يسترقون) چونکە خەڵک زۆر دڵیان پەیوەستە بە ڕوقیە زیاتر لەوەی کە دڵیان پەیوەستە بە پزیشک و شتی تر، عەرەب لە سەردەمی نەزانین ـ کە ئەمە حاڵی زۆربەی خەلکە ـ پەیوەست بوون بە ڕوقیە، دڵ پەیوەست دەبێت بە روقیە و ئەو کەسەی ڕوقیەکە دەکات، ئەمەش نەفی تەواوی پشت بەستن بەخوا دەکات (توكل).

---

(١) القول المفيد.

(٢) إعانة المستفيد (١٢١/١).

بەلام ئەوەی هاتووە لە هەندێ ڕیوایەت: (الذين لايرقون)، واتە: ئەوانەی ڕوقیە ناکەن، ئەم ڕیوایەتە شازە، چونكە ئەوەی ڕوقیە دەکات چاکەکارە بۆ کەسانی تر، ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە کە (الذين لا يسترقون))[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕوقیە بێ ئەوەی داوای بکەیت ڕێگە پێدراوە، بەڵام داواکردن لە خەڵک و واز لێهێنانی باشترە کاتێ پێویستیت پێ نەبێت)[2].

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ بەکارهێنانی شێوازی (معاريض)، چونکە بەو کەسەی نەگوت: (تۆ لەوان نیت یان تۆ شایەنی ئەوە نیت).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم وتەیەی پێی وت؟

- وتراوە: ئەم پیاوە دووڕوو بووە، پێغەمبەر (ﷺ) نەی ویستووە ڕووبەڕوو شتێکی پێ بڵێت پێی ناخۆش بێت و دڵی بشکێت.

- لەوە ترساوە دەرگا بکرێتەوە و کەسانێکی دیکەش داوای ئەم پلەیە بکەن و شایستە نەبن، کە ئەم وتەیە نزیکترە)[3].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (هەروەک ئەوە وایە پێغەمبەر (ﷺ) زانیوویەتی ئەم پیاوە ناگاتە ئەم پلەیە، بەلام نەیویستووە ڕووبەڕوو پێی بلێت و نەوەک پێی ناخۆش بێت، نەی وت: (تۆ شایستە نیت، یان تۆ شیاوی ئەم پلەو پایە نیت))[4].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٤٧) .
[2] التعليق المفيد.
[3] القول المفيد.
[4] إعانة المستفيد (١٢٣/١).

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە باشتر وایە داوا لەخەڵک نەکەیت بۆ دوعا کردن و خۆت داوا لە خوا بکە، چونکە داوای ڕوقیە باش نییە و واز لێهێنانی لە تەواوی تەوحیدە، هەروەها داوا کردن لە خەڵک لە تەواوی تەوحید نییە و زەلیل بوونی بۆ دروست کراوەکان تێدایە، لە تەواوی تەوحید ئەوەیە واستە لەنێوان خۆت و خوا دانەنێیت ئەگەر چی ڕێگەپێدراویشە.

زانایان دەڵێن دروستە موسڵمان داوای دوعا لە برای موسڵمانی بکات، بۆ ئەمەش چەندین بەڵگە لە قورئان و سوننەت هاتوون، بەڵکو هەندێ زانا ئیجماع نەقڵ دەکەن.

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سوننەتە داوای دوعا لە کەسی باش بکەیت، ئەگەر چی ئەو کەسەی داوای دوعا دەکات باشتریش بێت لە داوا لێکراو، وە دوعا لە شوێنی باش، بزانە فەرموودەکان لەم بابەتە زۆرترن لەوەی (حصر)ی بکەی، ئەمەیان یەک دەنگی لەسەرە)[١].

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕێگەپێدراوە بۆ موسڵمان داوای دوعا لە برای موسڵمانی خۆی بکات، جا لە سەرووی خۆی یان ژێرەوەی خۆی بێت)[٢].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (داواکردنی دوعا لە برا یان خوشک لە ڕێگای خوا هیچی تێدا نییە)[٣].

بەڵام ابن تیمیە و چەندین زانای تر دەڵێن باشتر وایە داوای دوعا لە کەس نەکەیت، بەڵگە:

---

[١] الأذكار لاپەرە (٦٤٣).
[٢] مجموع الفتاوى (٦٩/٢٧).
[٣] فتاوى نور على الدرب (١٤٣/٢).

- گشتییەتی بەڵگەکان کە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە داواکردن لە خەڵک، بەوەی تەنها خۆی ئاتاجی خوا بکات نەک دروستکراوەکانی، بابەتەکە چەند بچووک بێت جۆرێک لە زەلیلی تێیدایە، کەوابوو موسڵمان خۆی زەلیل ناکات مەگەر بۆ خوا نەبێت.

- داوا کردن لە خەڵک ترسی ئەوەی تێدایە واستە لە نێوان خۆت و خوا دابنێیت، بنچینەی عەقیدەش ئەوەیە کە واستە لە نێوان خۆت و خوا لابدەیت و پەیوەست بیت بە خوای گەورەوە.

زانایانی اللجنه الدائمه دەڵێن: (داوا کردنی دوعا و ڕوقیە ڕێگەپێدراون، بەڵام تەرک کردنیان و بێ نیاز بوون لە خەڵکی بەوەی خۆت پێی هەڵبسیت باشترە و لەپێشترە)[1].

ابن تیمیه دەڵێت: ئەگەر کەسێک داوای دوعا لە کەسێک بکات و مەبەستی ئەوە بێت سوود بە برای خۆی بگەینێت و بە بیری بهێنێتەوە دوعاکردن بۆ برای موسڵمان فەزڵ و پاداشتی هەیە و فریشتەکان (ئامین)ی بۆ دەکەن، ئەوا چاکەی بۆی دەنووسرێ و لەم حاڵەتەدا دروستە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (داوای دوعا کردن لە کەسی تر دابەش دەکرێت بۆ سێ بەش:

بەشی یەکەم: داوا لە لەکەسی تر دەکەیت بۆ مەسڵەحەتی موسڵمانان، واتە: شتێکی گشتی، ئەمەیان هیچی تێدا نییە، ڕۆژی هەینی پیاوێک هاتە مزگەوت و پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەخوێند، پیاوەکە وتی: (ئەی نێردراوی خوا سەروەت و سامان تیاچوو و ڕێگاکان داخراون لەبەر وشکە ساڵی، داوا لەخوا بکە بارانمان بۆ ببارێنێت)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

---

[1] فتاوى اللجنة الدائمة للإفتاء (٢٦١/٢٤).

(ئەی خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەی خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەی خوایە بارانمان بۆ بارێنە).

کەواتە ئەگەر داوات لە کەسێکی باش کرد و ئومێدی ئەوەی لێ دەکرا دوعای قبوڵ بێت بۆ شتێکی گشتی موسلمانان، ئەوە هیچی تێدا نییە و دروستە، چونکە تۆ بۆ خۆت داوات لێ نەکردووە.

بەشی دووەم: داوای دوعا لە پیاوێکی باش دەکات بۆ ئەوەی سوود بەم پیاوە بگەیەنێت بەم دوعا کردنە، نیازی ئەوەی نییە سوود بە خۆی بگات، بەڵام دەبێت ئەم پیاوەی داوای دوعا کردنی لێکراوە بۆ خوا بگەڕێتەوە و داوا لە خوا بکات و دڵی پەیوەست بێت بە خوا، وە ئەوە بزانێت کە خوای گەورە گوێی لە دوعا دەبێت و وەڵامی دەداتەوە، ئەوەی گرینگ بێت مەبەستی مەسڵەحەتی ئەو پیاوەی هەبێت کە داوای لێ دەکات، ئەمەشیان هیچی تێدا نییە و دروستە، چونکە تۆ داوات تەنها بۆ سوودی خۆت لێ نەکردووە، بەڵکو بۆ سوودی ئەو داوات لێکردووە، تۆ دەتەوێ بۆ ئەو پیاوە چاکە زیاد بکەیت بە دوعا کردن لە خوا و لێیەوە نزیک ببێتەوە بە دوعا و پاداشت وەربگرێت لەسەر ئەم کردەوەیە.

بەشی سێیەم: داوا لە کەسێک بکەیت بۆ خۆت، ئەمەیان هەندێک زانا ڕێگەیان داوە و دەڵێن: هیچی تێدا نییە داوا لە پیاوێکی باش بکەیت دوعات بۆ بکات.

بەڵام ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: نابێت ئەگەر مەبەستت تەنها سوودی نەفسی خۆت بێت.

هەندێ جار وای لێ دێت پشت بە کەسی تر دەبەستێت بۆ دوعا و لەبیر دەکات دوعا بۆ خۆی بکات، دەڵێت: من بە فلانە کەسی باشم وتووە دوعام بۆ بکە لە خوا، ئەگەر خوای

گەورە دوعای قبوڵ کرد ئەوە بەسە بۆی و پشتی پێ دەبەستێت، هەندێک جاریش ئەو کەسەی داوای دوعای لێکراوە تووشی لەخۆبایی بوون دەبێت)[1].

کەواتە حاڵەتی سێیەم جیاوازی هەیە لە تەواوی تەوحیدە ئەوەیە خۆت زەلیل نەکەیت و داوای دوعا لە خەڵک نەکەیت کەچی ڕێگەپێدراوە و تاوانباریش نابیت.

**١٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ قووڵی زانستی پێشینەکان، چونکە دەیانزانی فەرموودەی یەکەم پێچەوانەی فەرموودەی دووەم نییە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕوقیە نییە ئیلا بۆ چاوەزار و پێوەدان نەبێت پێچەوانەی فەرموودەی دووەم نییە، چونکە فەرموودەی دووەم باسی داوا کردنی ڕوقیە دەکات، بەڵام هی یەکەم باسی ڕوقیە دەکات نەک داوا کردن، مرۆڤ ئەگەر کەسێک هاتە لای و ڕوقیەی بەسەری خوێند و ڕێگری نەکرد، ئەمەیان نەفی وتەی (لايسترقون)، ناکات چونکە سێ پلەی هەیە:

پلەی یەکەم: داوا لەو کەسە دەکات کە ڕوقیە دەکات، ئەمەیان پلەی تەواوی تەوحیدیان لە دەستدا.

پلەی دووەم: ڕێگری لەو کەسە ناکات کە ڕوقیەی بۆ دەکەن، ئەمەیان پلەی تەواوی تەوحیدی لە دەست نەداوە، چونکە خۆی داوای ڕوقیەی لێ نەکردووە.

پلەی سێیەم: ڕێگری لەو کەسە دەکات کە ڕوقیەی بۆ دەکات، ئەمەیان پێچەوانەی سوننەتە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لە عائیشە نەکرد کە ڕوقیەی بۆ کرد، هەروەها

---

[1] شرح رياض الصالحين (٢/٤٧٧-٤٧٨).

هاوەڵان لە ڕوقیە بۆ یەکتر کردنیان ڕێگریان لە کەس نەکردووە، چونکە ئەمەیان کاریگەری نییە لەسەر تەوەکول)[(١)].

**١٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە چاو حەقیقەتی هەیە، کە ئەمە وتەی زۆربەی زانایانە و یەکێک لە بنچینەکانی ئەهلی سونە ئەوەیە باوەڕیان وایە کە چاو حقیقەتی هەیە، بەڵگە:

- خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ [القلم: ٥١]

- وأخرج مسلم وأحمد والترمذي وصححه عن ابن عباس رضي الله عنهما عن النبي (ﷺ) قال: (العين حق ولو كان شيء سابق القدر لسبقته العين، وإذا استغسلتم فاغسلوا)[(٢)].

واتە: (چاو حەقە، ئەگەر شتێک پێش قەدەر کەوتبایا ئەوا چاو پێشی دەکەوت، ئەگەر کەسێک داوای خۆ شوشتنی لێتان کرد، ئەوە خۆتان بشۆن و ئاوەکەش بیدەنێ تا خۆی پێ بشوات).

هەروەها چەندین فەرموودەی تری ڕوون و ئاشکرا هاتوون بۆ چاو و واقیعیش بەڵگەیە بۆ کاریگەری و حەقیقەتی چاو.

**١٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە بانگخواز گەیاندنی لەسەرە نەک بەرووبوومی گەیاندن، کەواتە: تاوانبار نابێت ئەگەر کەس شوێنی نەکەوێت و کەس بەگوێی نەکات.

**١٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە بەرووبوومی بانگەواز کردن بەڵگە نییە کە بانگخواز باشە یان خراپە، ئەگەر کەس شوێنی نەکەوت بەڵگە نییە کە کەسەکە خراپە، یان ئەگەر

---

(١) القول المفيد.

(٢) صححه الألباني في السلسلة الصحيحة (١٢٥١).

خەڵكانێكی زۆر شوێنی كەوتن بەڵگە نییە كە كەسەكە لە هەمووان باشترە، چونكە چەندین بانگخواز مەبەستیان خەڵك كۆكردنەوەیە لە خۆیان پەنا بە خوا، یان خەریكی شتێكن و باسی ئەو شتانە دەكەن كە خەڵك بۆ خۆیان ڕابكێشن نەك باسی عەقیدە بكەن، یان خۆیان بێ دەنگ دەكەن لە ڕاستیەك نەوەك خەڵك لێیان دوور بكەوێتەوە.

**١٦-** ئەم فەرمووده بەڵگەیە بۆ ئارام گرتن و پەلە نەكردن لە بەرووبوومی بانگەواز.

**١٧-** فەرموودەی ئەبوهورەیرە هاتووە ڕوون و ئاشكرایە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئوممەتی خۆی دەناسێتەوە ڕۆژی قیامەت بەهۆی گەشاتی و سپیایی ئاسەواری دەست نوێژ، بەڵام لەم فەرموودەیە بۆچی ئوممەتی خۆی نەناسیوە؟

وەڵام: زانایان دەڵێن لەم فەرموودەیە ئوممەت پیشاندانی پێغەمبەر دوور بووە و زۆر بوونە، بەڵام فەرموودەی ئەبو هورەیرە باسی حاڵەتی نزیكی یە.

**١٨-** لەگەڵ هەر كەسێك لەو حەفتا هەزار كەسە حەفتا هەزاری تر دەچنە بەهەشت بە هۆی شەفاعەت كردنیان بۆیان.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (فەرموودەی تر هاتووە لەگەڵ هەر كەسێك لە حەفتا هەزارەكان حەفتا هەزاری تر دەچێتە بەهەشت بێ حساب، لەبەر تەواوی تەقوا و ئیمان و بەردەوامییان)[1].

**١٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كە داوا كردنی داق كردن (داخ كردن) لە خەڵك و بەكارهێنانی وەك چارەسەر باش نییە.

---

[1] التعليق المفيد.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (داوای داق کردن لە کەس ناکەن، مانای (اکتوی): داوا کردنی ئەوەیە کە داقی بۆ بکرێ، ئەمەیان وەک ئەم وتەیە: (ولا يسترقون)، بەڵام سەبارەت بە داق کردنی لە حوکمەتەوە، داوا کردنی داق کردنی بە ئاگر زەلیلی تێدا نییە، چونکە ئەمەیان لە حوکمەت تەرخان کراوە و پاداشت لە حوکمەت وەردەگرێت، چونکە ئەم داوا کردنە تەنها بۆ ئەوەیە کە پێویستیم بە داق کردن هەیە نەک داوا لەکەسەکە بکات و زەلیل بێت بۆی)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (بەکارهێنانی داق کردن لە کاتی پێویستیدا وەک چارەسەر ڕێگەپێدراوە، بەڵام ئەگەر داوات لە کەسێک کرد باش نییە، چونکە داواکردنە لە خەڵک، هەروەها داق کردن خۆی لە خۆیدا باش نییە، چونکە سزا دانی تێدایە بە ئاگر)[2].

**٢٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە یەکێک لە سیفەتەکانی ئەوانەی دەچنە بەهەشت بێ حساب و سزا ئەوەیە کە ڕەشبین نین بە باڵندە و شتی تری هاوشێوەی باڵندە.

**٢١-** هەندێ زانا دەڵێن ئەم فەرموودەیە مژدە نییە بەڵکو ترساندنە، ڕاستە تا ڕادەیەک مژدەی تێدایە کە ئەم ئوممەتە زۆرترینی ئوممەتەکانە و زۆرترینی خەڵکی بەهەشتە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش حەفتا هەزار بێ حساب و سزا دەچنە بەهەشت ئەو مانایە هەڵدەگرێت کە بێجگە لە ئەمانە حسابیان لەگەڵ دەکرێت و خۆتانی بۆ ئامادە بکەن، ڕاستە هەر یەکێک

---

[1] القول المفيد.

[2] إعانة المستفيد (١٢٢/١).

لە ئەمانە شەفاعەت بۆ حەفتا هەزار دەكات بەڵام لەوانەیە شەفاعەتی بۆ بكات تاوەكو نەچێتە دۆزەخ یان لەوانەیە دوای سزادان دەربهێنرێت لە دۆزەخ بە هۆی شەفاعەتەوە.

**٢٢-** لەم فەرموودەیە بە ڕوونی باسی نەكردووە ئایا تەنها حسابی ڕۆژی قیامەتی لەگەڵ ناكرێت یان حساب و لێ پرسینەوەی ناو گۆڕیشیان لەگەڵ ناكرێت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ((حەفتا هەزار دەچنە بەهەشت بێ حساب و سزا)، واتە: سزا نادرێن و حسابیان لەگەڵ ناكرێت وەک ڕێزێک بۆیان، ڕووكەشی فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت نە لەناو گۆڕ و نە دوای هەستانی قیامەت پرسیاریان لێ ناكرێت).

**٢٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەرانیش (الأنبياء) داوایان لێكراوە بانگەواز بكەن، پێچەوانەی وتەی ئەوانەی دەڵێن داوایان لێ نەكراوە، ئایا هیچ جیاوازی هەیە لە نێوان (رسول) و (نبی)؟

وەڵام: جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان, بۆ ئەمەش چوار وتە هەیە:

یەكەم: هەندێ زانا دەڵێن هیچ جیاوازی نیە لە نێوان (رسول) و (نبي).

دووەم: هەندێ زانا دەڵێن (رسول) وەحی بۆ هاتووە وە فەرمانیش پێی كراوە ئەم وەحی یە بگەیەنێت، (نبی)، وەحی بۆی دێت بەلام فەرمانی پێ نەكراوە بیگەیەنێت.

سێیەم: هەندێ زانا دەڵێن (رسول): وەحی بۆی دێت بە شەریعەتێكی نوێ، (نبي): وەحی بۆی دێت بەڵام لەسەر شەریعەتی ڕەسولی پێش خۆی دەڕوات، هەروەها فەرمان بە هەردووكیان كراوە وەحی بگەینن و بانگەواز بكەن.

چوارەم: هەندێ زانا دەڵێن (رسول): خوای گەورە ناردوویەتی بۆ خەڵكانێک كوفریان كردووە، (نبي): خوای گەورە ناردوویەتی بۆ ئەو ئیماندارانەی كە ئیمانیان بە (رسول) هێناوە و فێریان دەكات وحوكم لە نێوانیان دەكات، كە ئەمە وتەی ابن تیمییە.

وتەی ڕاست جیاوازی هەیە لە نێوانیان، هەروەها فەرمانیش کراوە وەحی بگەیێنێت، زانایان دەڵێن شاردنەوەی وەحی و زانست بۆ بێجگە لە پێغەمبەران زەمکراوە، ئەی چۆن دەبێت پێغەمبەر وەحی لەلا بێت فەرمانی پی نەکرابێت بیگەیێنێت؟!

هەروەها فەرمودەی ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (عرضت على الأمم، فرأيت النبى ومعه الرهط، والنبى ومعه الرجل و الرجلان، والنبى وليس معه أحد).

لەم فەرموودەیە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە پێغەمبەر هەبووە کەس باوەڕی پێی نەهێناوە، هەش بووە کەم کەس باوەری پێ هێناوە، ئەمە بەڵگەیە کە بانگەوازی کردووە، هەروەها بەڵگەشە کە پێغەمبەر (نبي) بۆ کافریش چووە.

# باب الخوف من الشرك

**وقول الله عز وجل:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ [النساء: ٤٨]

**وقال الخليل عليه السلام:** ﴿وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ﴾ [إبراهيم: ٣٥]

**وفي حديث: (أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر)، فسئل عنه فقال: (الرياء)[١].**

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (من مات وهو يدعو من دون الله ندا دخل النار) [رواه البخاري][٢].**

**ولمسلم عن جابر رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (من لقي الله لا يشرك به شيئا دخل الجنة، ومن لقيه يشرك به شيئا دخل النار)[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** الخوف من الشرك.

**الثانية:** أن الرياء من الشرك.

**الثالثة:** أنه من الشرك الأصغر.

---

[١] أخرجه أحمد (٤٢٨،٤٢٩/٥ رقم ٢٣٦٣٠ و ٢٣٦٣٦)، والطبراني في "الكبير" (٢٥٣/٤ رقم ٤٣٠١)، والبيهقي (٢٩٠/٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٩٥١).

[٢] أخرجه البخاري (٤٤٩٧،٦٦٨٣)، وأخرجه مسلم أيضا (٩٢).

[٢] أخرجه مسلم (٩٣).

**الرابعة:** أنه أخوف ما يخاف منه على الصالحين.

**الخامسة:** قرب الجنة والنار. السادسة: الجمع بين قربهما في حديث واحد.

**السابعة:** أنه من لقيه لا يشرك به شيئا دخل الجنة. ومن لقيه يشرك به شيئا دخل النار ولو كان من أعبد الناس.

**الثامنة:** المسألة العظيمة: سؤال الخليل له ولبنيه وقاية عبادة الأصنام.

**التاسعة:** اعتباره بحال الأكثر، لقوله: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ﴾ [إبراهيم: ٣٦]

**العاشرة:** فيه تفسير (لا إله إلا الله) كما ذكره البخاري.

**الحادية عشرة:** فضيلة من سلم من الشرك.

# باب الخوف من الشرك

## باسی ترسان لە شیرک

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (هەر کەسێک تەوحیدی بە پوختی لەخۆیدا هێنابێتەدی دەبێت لە شیرک بترسێت، لەبەر ئەوەی گەورەی ئەوانەی تەحقیقی تەوحیدیان کردووە محمد (ﷺ) زۆرینەی دوعاکانی ئەوە بوو خوای گەورە دووری خاتەوە لە شیرک، هەروەها ئیبراهیم (عليه السلام) زۆرینەی دوعاکانی ئەوە بوو کە شیرکی پێ نەگات و تووشی نەبێت یان تووشی پەیکەر پەرستی نەبێت.

باسی کردنی ئەم بابەتە لەگەڵ بابەتی پێشووتر گونجاو و دیارە، ئەویش ئەوەیە تەحقیقی تەوحید لای خاوەنەکەی ئەوەیە دەبێت لە شیرک بترسێت، ترسان لە شیرک چەند بەرووبوومێک بەرهەم دێنێت لەوانە:

- شارەزا دەبێت لە شیرک بە جۆرەکانیەوە، تا تووشی نەبێت.

- لەوانە دەبێت کە خۆی فێری تەوحید دەکات بە هەموو جۆرەکانییەوە، هەتا ترسان لە شیرک لە دڵیدا جێگیر دەبێت و لە شیرک دەترسێت و بە گەورەی دادەنێت و بەردەوام دەبێت لەسەر ئەمە.

- ئەوەی لە شیرک دەترسێت دڵی بەردەوام دەبێت لەسەر گوێڕایەڵی خوا و تەنها ڕەزامەندی خوای دەوێت)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (بۆچی دانەری كتاب باسی بابەتی دژی تەوحیدی کردووە کە شیرکە، چونکە زانینی تەوحید و کار پێکردنی بەس نییە بەڵکو

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٥١-٥٢).

دەبێت دژەکەشی بزانیت کە شیرکە، لە ترسی ئەوەی نەوەک تووش ببێت و تەوحیدی پووچ بێتەوە، چونکە ئەوەی شتێک نەزانێت ئەگەری تووش بوونی هەیە، هەروەک ئیمام عومەر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (نزیکە بناغە و گرێی ئیسلام بڕوخێت و هەڵوەشێتەوە گرێ بە گرێ، ئەگەر ئیسلامی کەسێک دروست بوو و جاهیلیەتی نەناسیبێت)، چونکە نازانێت کاری جاهلیەتە، یان وا حساب دەکات شتێکی باشە کەچی لە کاروباری جاهلیەتە، بە نەزانینەکەی حەق و ناحەق تێکەڵ بەیەکتر دەکات و تووشی دەبێت، وە هەروەها کردەوەیەک ئەنجام دەدات لە جاهلیەتە، لەمە ترسناکتر ئەوەیە نازانێت شیرک چییە و چۆن مرۆڤ تووشی دەبێت و جۆرەکانی چیین.

قەدری لەش ساغی نازانێت مەگەر ئەو کەسەی تامی نەخۆشی کردووە، قەدری ڕووناکی نازانێت مەگەر ئەو کەسەی تووشی تاریکی بووە، قەدری ئاو نازانێت مەگەر ئەو کەسەی تینوو بووە، قەدری خواردن نازانێت مەگەر ئەو کەسەی تووشی برسییەتی بووە، قەدری ئەمان نازانێت مەگەر ئەو کەسەی تووشی ترس بووە، وە قەدر و قیمەتی تەوحید و فەزڵ و تەحقیقیشی نازانێت مەگەر ئەو کەسەی شیرکی ناسی بێت، تاوەکو لە کارووباری جاهلیەت خۆی دووربخاتەوە و پارێزگاری لە تەوحید بکات، لێرە هەڵەی ئەوانە بەدیار دەکەوێ کە دەڵێن: پێویست ناکات خۆمان فێری بیروباوەڕی پووچ بکەین، واز لە موعتەزیلە و جەهمی بهێنن، چونکە ئەوانە هاتن و ڕۆیشتن، خەڵک تەنها فێری تەوحید بکەن بەسە، یان هەندێکیان دەڵێن فێری تەوحیدیان مەکەن چونکە منالی فیطرەتن و لە وڵاتی موسڵمانان پێگەیشتوونە، فێری کاروباری دونیا و پیشە و داهێنان و شتی نوێیان بکەن، سەبارەت بە تەوحید بە فیطرەتی خۆیان فێری دەبن و بە دەستی دێنن، بەڵێ هەیە ئەمە دەڵێت و هەندێک خەڵکی تر دەڵێن خەڵک تێپەڕبووە لە قۆناغی خورافی، چونکە ڕۆشنبیریان لایە و فێربووینە و ناکرێت دوای ئەمە شیرک بڕیار بدەن بۆ خوا، چونکە شیرک لە سەردەمی جاهلی هەبوو.

هەموو ئەمانە فێڵی شەیتانە بۆ نەوەی ئادەم، واجبە حەق و ناحەق بزانین بۆ ئەوەی کردەوە بە حەق بکەین و خۆمان دووربخەینەوە لە ناحەق، لەبەر ئەوە دانەری کتاب بابەتێکی گرینگی باسکردووە ئەویش ترسانە لە شیرک.

یەکخواپەرست دەبێت لە شیرک بترسێت، نابێت بڵێت من یەکخواپەرستم و دەزانم تەوحید چییە و شیرک هیچ ترسناکیەکی لەسەرم نییە، ئەمەیان لە شەیتانەوەیە و مرۆڤی تووشی لەخۆبایی بوون کردووە)[1].

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەگەر شیرک نەفی تەوحید بکات و خاوەنەکەی تووشی چوونە ناو ئاگر بکات و تیایدا بمێنێتەوە هەتا هەتایی ئەگەر شیرکی گەورە بوو، هەروەها بەختەوەری بەدەست ناهێت ئیلا بە سەلامەت بوون نەبێت لە شیرک، ئەوە حەقە بەندە لێی بترسێت بە گەورەترین ترس، هەوڵ بدات بۆ ڕزگار بوون و ڕاکردن لێی و خۆپاراستن لەو ڕێگا و هۆکارانەی مرۆڤ تووشی دەبێت، وە داوای سەلامەتی لەخوا بکات لە شیرک، هەروەک پێغەمبەرانی هەڵبژێردراو کە باشترینی دروستکراوەکان بوونە داوای سەلامەت بوونیان کردووە لە شیرک)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (١/١٢٧-١٢٨).

[2] القول السديد لاپەڕە (٢٥).

**خوای گەورە دەفەرموویێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا﴿٤٨﴾﴾ [النساء: ٤٨]

واتە: (بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:**

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾: ئەم ئایەتە باسی کەسێکە شەریکی بۆ خوای گەورە بڕیار داوە و تەوبەی نەکردووە، ئەگەرنا گەورەترین تاوان ئەگەر بەندە تەوبە بکات خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.

لە عەلی دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: لە قورئانی پیرۆزدا هیچ ئایەتێک نییە خۆشەویستر بێت لام لەم ئایەتە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾[1].

﴿أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾: لەم ئایەتە شیرکی گەورە و بچووک دەگرێتەوە لەسەر وتەی هەندێ زانا.

﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾: زانایان دەڵێن (مغفرة) وەک (مغفر)ە، (مغفر) ئەوەیە کە جەنگاوەر لەسەر سەری دادەنێت، دوو سوودی هەیە:

---

[1] أخرجه الترمذي (٣٠٣٧)، وقال: (حديث حسن غريب).

یەکەم: (مغفر) سەری جەنگاوەر دادەپۆشێت، (مغفرة) خوای گەورە مرۆڤ دادەپۆشێت لە خەڵک و لە تاوانەکان ئاشکرا و ڕیسوای ناکات.

دووەم: (مغفر) سەری جەنگاوەر دەپارێزێت لە تیر، (مغفرة) خوای گەورە دەیپارێزێت لە سزادان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم ئایەتەی باسکردووە تاکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە شیرک لێخۆش بوونی بۆ نییە ئەگەر تەوبەی لێ نەکرێت، هەروەها شیرکی بچووکیش بە هەمان شێوە لەسەر وتەی هەندێ لە زانایان.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- فەرمان کردنی خوای گەورە بە دروستکراوەکانی و پاداشت و لێخۆش بوون بۆیان، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾.

٢- خوای گەورە لە کەسێک خۆش نابێ شەریکی بۆ بڕیار دابێت و تەوبەی نەکردبێت لە شیرک تا مردن، جا شیرک لە پەروەردگاریەتی بێت یان بەندایەتی یان ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾.

٣- جێگیرکردنی سیفەتی لێ خۆش بوون بۆ خوای گەورە، سیفەتێکی زاتی و فعلی یە، لەبەر وتەی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾.

٤- جگە لە شیرک لەژێر ویستی خوای گەورەیە ئەگەر تەوبەی لێ نەکردبێت، لەبەر وتەی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾.

**٥-** خاوەنی تاوانی گەورە لە دین دەرناچێت ئەگەر تەوبەی نەکردبێت، وەڵامە بۆ خەوارج و موعتەزیلەکان کە دەڵێن خاوەنی تاوانی گەورە لە ئاگر هەتا هەتایی دەبێت، لەبەر وتەی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾.

**٦-** وەڵام بۆ هەندێک سۆفیەکان کە تاوان ئەنجام دەدەن بە بیانۆی ئەوە خوای گەورە لە تاوان خۆش دەبێت جگە کە شیرک، کە ئەمە وتەیەکی پووچە چونکە لێخۆش بوون لەژێر ویستی خوای گەورە دایە، ئەگەری لێخۆش بوونی هەیە و ئەگەری سزا دانیشی هەیە.

**٧-** ترسناکی شەریک بڕیاردان بۆ خوای گەورە و تەوبە لێ نەکردنی، چونکە لێخۆش بوون بۆی نییە بە هیچ شێوەیەک.

**٨-** هەندێ زانا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە شیرک چ گەورە بێت یان بچووک لێ خۆش بوونی بۆ نییە ئەگەر تەوبەی لێ نەکردبێت، ئیلا لەسەری سزا دەدرێت، بە شیرکی گەورە هەتا هەتایی دەبێت لە دۆزەخ، بەڵام بە شیرکی بچووک هەتا هەتایی نابێت.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئایا لێرە مەبەست بە شیرک شیرکی گەورەیە یان هەموو شیرکێک دەگرێتەوە، واتە: (شیرکی بچووکیش)؟ هەندێ زانا دەڵێن ئەم ئایەتە (مطلق)ە هەموو شیرکێک دەگرێتەوە ئەگەر بچووکیش بێت، وەک سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا، خوای گەورە لێی خۆش نابێت، بەڵام سەبارەت بە تاوانی گەورەی وەک: دزی و عەرەق خواردنەوە لەژێر ویستی خوای گەورە دایە، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، ابن تیمیە لەم بابەتە دوو وتەی هەیە، جارێکیان دەڵێت: شیرک خوای گەورە لێی خۆش نابێت ئەگەر بچووکیش بێت، جارێکی تر دەڵێت: ئەو شیرکەی خوای گەورە لێی خۆش نابێت شیرکی گەورەیە، بە هەرحاڵ دەبێت حەزەر وەربگریت لە شیرک بە هەموو شێوەیەک، چونکە ئەم گشتیەتییە لەوانەیە شیرکی بچووکیشی داخل

ببێت، چونکە وتەی خوای گەورە: (أن يشرك به)، لە دوای تأويلی مصدر، تقديرەکەی: (إشراكا به)، نەکيرەيە و سياقيش نەفی يە، دەلالەت لەسەر عموم دەکات)[1].

**٩-** هەندێ زانا ئەم ئايەتە دەکەنە بەڵگە کە شيرکی بچووک گەورەترە لە تاوانی گەورە، چونکە شيرکی بچووک لێ خۆش بوونی بۆ نييە و ئيلا دەبێت لەسەری سزا بدرێت، بەڵام تاوانی گەورە لێ خۆش بوونی بۆ هەيە.

هەندێکی تر دەڵێن (جنس)ی شيرک گەورەترە و ترسناکترە لە تاوانی گەورە، چونکە شيرکی بچووک هۆکارە بۆ تووش بوون بە شيرکی گەورە، ئەگەرنا تاوانی گەورە هەيە گەورەترە لە شيرکی بچووک.

**١٠-** يەکخواپەرست دەبێت لە شيرک بترسێت بە هەموو جۆرەکانيەوە، چونکە شيرک ئەگەر تەوبەی لێ نەکرێت لێ خۆش بوونی بۆی نييە، جا چ شيرکی گەورە بێت يان بچووک لەسەر وتەی هەندێک لە زانايان.

**١١-** جێگيرکردنی ويست بۆ خوای گەورە، لەبەر وتەی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾.

**١٢-** جێگيرکردنی کردەوەی ئيختياری بۆ خوای گەورە، لەبەر وتەی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾.

**١٣-** واجبی ئيخلاس لە تەوحيد، تەوحيدی پەروەردگاريەتی و بەندايەتی و ناو و سيفەت، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾، لێ خۆش نەبوو لە شيرک بەڵگەيە لەسەر واجبی تەوحيد.

---

[1] القول المفيد (١/١٤٠-١٤١).

**١٤-** هەر کەسێک شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە، لەبەر وتەی: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا﴾.

**وقال الخليل عليه السلام:** ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ۝٣٥﴾ [إبراهيم: ٣٥]

واته: ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت لە شیرک دەترسا و وتی: (خوایە خۆم و نەوەکانم بپارێزە لەوەی کە بت بپەرستین).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:**

﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ﴾: دوعا بۆ حەقی ئیبراهیم زیاتر پارێزراوتر بوونە لە شیرک و جێگیربوونە لەسەر دین، ئیبراهیم (عليه السلام) دوعای کردووە خۆی و نەوەکانی دوورخاتەوە لە پەیکەرپەرستی، کەچی کافرەکانی قورەیش لە نەوەکانی بوون و تووشی پەیکەر پەرستی بوون؟

وەڵام لە چەند ڕوویەکەوەیە:

یەکەم: لەوانەیە مەبەست پێی نەوەکانی بن لەو کاتە کە زیندووبوون، لەم حاڵەتە دوعای گیرا بووە و هیچ گومانی تێدا نییە.

دووەم: لەوانەیە ئەم دوعایە تایبەت بێت بە ئیمانداراني نەوەکانی، پاڵپشتی بۆ ئەمە دەفەرمووێت: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ﴾.

سێیەم: لەوانەیە دوعایەکە گشتی بێت بەڵام خوای گەورە دوعاکەی بۆ هەندێکیانی قبول کردبێت و بۆ هەندێکی تریانی قبول نەکردبێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە سەییدی پێغەمبەران دوای پێغەمبەری ئێمە لە شیرک ترساوە، دەبێت ئێمەش شوێنی بکەوین و زیاتر لە شیرک بترسین.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئیبراهیم کە ئیمامی یەکخواپەرستان بووە (علیه السلام) لە شیرک ترساوە، کەواتە: دەبێت موسڵمان زیاتر لە شیرک بترسێت.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئیبراهیم (ﷺ) کە تەحقیقی تەوحیدی کردووە و وەسف کراوە بەوەی کە وەسف کراوە، هەروەها بە دەستی خۆی پەیکەری شکاندووە، ئەگەر ئەو لە شیرک بترسێت! ئەی کێ هەیە ئەمین بێت لە شیرک دوای ئەو!)[1].

**٢-** قبووڵ نەکردنی دوعایەک لە لایەن خواوە مەرج نییە کە کەسەکە باش نەبێت، چونکە خوای گەورە دوعای پێغەمبەری خۆشمانی (ﷺ) قبوڵ نەکرد لەوەی کە داوای کرد ئوممەتەکەی شەڕ دژی یەکتری نەکەن.

محمد الأمين الشنقطي ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (لەم ئایەتە ڕوونی نەکردۆتەوە ئایا وەڵامی دوعای ئیبراهیمی داوەتەوە یان نا، بەڵام لە شوێنی تر باسکراوە کە وەڵامی هەندێک لە دوعاکەی داوەتەوە و هەندێک لە نەوەکانیشی پاراستووە لە پەیکەر پەرستی.)[2].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٥٨).

[2] أضواء البيان (٨٣/٣).

**٣-** نەترسان لە شیرک و ئەمین بوون لە شیرک نیشانەیە بۆ نقص لە تەوحیدا.

**٤-** فەزلی ئیبراهیم (علیه السلام) پێشەوای یەکخواپەرستان بووە خۆی پاراستووە لە شیرک و پەیکەر پەرستی و لێی ترساوە، وە زانیویەتی شیرک چەند ترسناکە و بەری بووە لێی.

**٥-** لەپێشترین کەس دوعای بۆ بکەی دوای دوعا بۆ نەفسی خۆکردن دوعا کردنە بۆ مناڵ، لەبەر ئەوە ئیراهیم (علیه السلام) دوعای بۆ نەفسی خۆی کرد، دواتر بۆ مناڵەکانی، لەبەر وتەی: ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ﴾.

**٦-** لەسەر بەندەیە داوا لەخوا بکات لە شیرک و تاوان دووری خاتەوە.

**وفي الحديث عليه السلام: (أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر) فسئل عنه فقال: (الرياء).**

واته: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (ئەوەی کە زۆر لێتان دەترسێم تووشتان بێت و زیانتان پێ بگەیەنێت شیرکی بچووکە)، پرسیاری لێی کرا شیرکی بچووک چییە؟ فەرمووی: (ڕیایە).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(أخوف ما أخاف عليكم):** واتە : ئەوەی کە زۆر لێتان دەترسێم تووشتان بێت و زیانتان پێ بگەیەنێت، خطاب لێرە بۆ موسڵمانانە.

**(الرياء):** واتە: خوا پەرستنە بۆ ئەوەی خەڵک ببینێ و مەدحی بکات لەسەر ئەوەی کە عابدە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات پێغەمبەر (ﷺ) لە ئوممەتی خۆی ترساوە تووشی شیرک ببن، ڕووی لە هاوەڵانی وەک ئەبو بەکر و عومەر و عوثمان و هي تریش کردووە، دەبێت موسڵمان لە شیرک بترسێت.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ واجبی ئیخلاس، موسڵمان دەبێت هەموو کردەوەکانی تەها بۆ خوا بێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە ئیخلاس واجبە، مرۆڤ نابێت مەبەستی مەدح کردنی خەڵکی هەبێت یان باسکردنی یان ویستی دونیا بۆ

کردەوەی باش، بەڵکو دەبێت تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەگەر کردەوەی کرد بۆ ڕیا ئەوە کردەوەی پووچە)[(١)].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شیرک دابەش دەکرێت بۆ دوو جۆر، شیرکی گەورە و شیرکی بچووک.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ترسناکی شیرک، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕیا ترساوە لە هاوەڵان کە لە بەرزترین پلەی تەوحید و ئیمان و جیهاد کردن بوونە، ئەی دەبێت حاڵی ئێمە چۆن بێت لەگەڵ ڕیا.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ریاء: خوا پەرستنە بۆ ئەوەی خەڵک ببینن و مەدحی بکەن لەسەر ئەوەی کە عابدە.

(الرياء): خوا پەرستنە بۆ ئەوەی خەڵک ببینێ و مەدحی بکات لەسەر ئەوەی کە عابدە، مەبەستی ئەوەی نییە عیبادەت بۆ خەڵک بکات، چونکە ئەگەر مەبەستی عیبادەت کردن بێت بۆ خەڵک ئەوا دەبێتە شیرکی گەورە، ئەمەیان وەک شێوەی نموونە، ئەگەرنا ڕیا هەیە و سومعەش هەیە، سومعە عیبادەت کردنە بۆ ئەوەی بەرگوێی خەڵک بکەوێت و مەدحی بکەن، ئەمەش داخلی ڕیا دەبێت، تەعبیر بۆ ڕیا لە بابەتی زۆرینەیە، بەڵام ئەگەر مەبەست لە عیبادەت کردن بۆ ئەوە بێت خەڵکی شوێنی بکەون، ئەمەیان ڕیا نییە، بەڵکو ئەمەیان بانگەوازی کردنە بۆ لای خوا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (من ئەمەم کرد بۆ ئەوەی شوێنم بکەون و فێری نوێژی من ببن).

ڕیا بە گوێرەی پووچ بوونی کردەوە دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش:

---

[(١)] إعانة المستفيد (١٣٣/١).

یەکەم: ڕیا دەکەوێتە ئەسڵی عیبادەت، واتە: هەڵناستێت بۆ عیبادەت مەگەر بۆ ڕیا، ئەمەیان کردەوەی پووچە لەبەر فەرموودەی ئەبو هورەیرە کە دەفەرموویێت: (خوای گەورە دەفەرموویێت: (أنا أغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عمل أشرك معي فيه غيري تركته و شركه).

دووەم: ڕیا دەکەوێتە ناو عیبادەت، واتە: ئەسڵی عیبادەت بۆ خوایە و بەلام ڕیای تێکەڵ بووە، ئەمەیان دوو جۆرە:

١- بەرگری دەکات، ئەمەیان زیانی پێ ناگەیەنێت، نموونە: پیاوێک یەک ڕەکاعەت نوێژی کرد، پاشان لە ڕەکاعەتی دووەم خەڵکانێک هاتن، شتێک چووە دڵی و ڕکوع و سوجدەی درێژ کرد یان گریانی خۆی هێنا یان شتی تر، ئەگەر بەرگری بکات و هەوڵی لادانی بدات، ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، چونکە بە جیهاد کردن هەستاوە.

٢- لەگەڵی بەردەوام دەبێت و بەدوایدا دەڕوات، واتە: بەرگری ناکات، هەر کردەوەیەک بە ڕیا بکرێت ئەوە پووچ دەبێت، وەک ئەوەی قورئان خوێندنەوە درێژ بکات یان ڕکوع یان سوجدە یان خۆی بگریێنێت، هەموو ئەمانە کردەوە پووچ دەکەنەوە، بەڵام ئایا هەموو کردەوەکە پووچ دەکاتەوە یان هەندێکی؟ دەڵێین لەم دوو حاڵەتە زیاتر نییە:

حاڵەتی یەکەم: کۆتایی کردەوە بنیات نراوە لەسەر سەرەتاکەی، بەجۆرێک عیبادەتەکە دروست نییە لەگەڵ پووچ بوونی کۆتاییەکەی، ئەمەیان هەمووی پووچ دەبێت، وەک نوێژ، نموونە: نوێژ ناکرێت کۆتاییەکەی پووچ بێت و سەرەتاکەی پووچ نەبێت، ئەو کاتە نوێژ هەمووی پووچ دەبێتەوە ئەگەر ڕیای کەوتە ناو و بەرگری نەکات لە لابردنی.

حاڵەتی دووەم: سەرەتای عیبادەت جیایە لە ئەوەی تر، بەجۆرێک دەکرێت سەرەتاکەی دروست بێت بێجگە لە کۆتاییەکەی، ئەوەی بێ ڕیا کراوە دروستە و ئەوەی دواتریش

كە بە ڕیا كراوە پووچە، نموونە: پیاوێک ١٠٠ ڕیالی لە لایە، ٥٠ ڕیالی بەخشی بە ئیخلاسی، پاشان ٥٠ ڕیالی تری بەخشی بە ڕیا، هی یەكەم وەرگیراوە و هی دووەمیش وەرنەگیراوە، چونكە كۆتاییەكەی پەیوەست نییە لەگەڵ سەرەتاكەی و لێک جیاوازن)[1].

زانایان دەڵێن (الرياء: هو العمل لرؤية الناس)، واتە: كردەوە ئەنجام دانە بۆ ئەوەی خەڵك ببینن و مەدحی بكەن، نموونە: كەسێك هەڵدەستێت نوێژ دەكات بۆ ئەوەی خەڵكی ببینن واتە دیتنی خەڵكەكە هانیداوە نوێژ بكات.

(السمعة: العمل لأجل سماعهم)، واتە: كردەوە كردنە بۆئەوەی خەڵك گوێیان لێ بێت و مەدحی بكەن، نموونە: كەسێك قورئان دەخوێنێت بە دەنگ بۆ ئەوەی خەڵك گوێیان لە دەنگی بێت و مەدحی بكەن، واتە: گوێ لێ بوونی خەڵكەكەیە هانیداوە قورئان بە دەنگ بخوێنێت، ئەگەرنا قورئانی نەدەخوێند.

حاڵەت هەیە كەسەكە هەم تووشی (رياء) بووە و هەم تووشی سومعەش بووە، نموونە: كەسێك هەڵدەستێت نوێژ دەكات، دەنگي بەرز دەكاتەوە لە ناو نوێژ بۆ ئەوەی ببینن و گوێیان لە دەنگی بێت و مەدحی بكەن، واتە: دیتنی خەڵكەكە و گوێ لێبوونیان هانیداوە نوێژ ئەنجام بدات و دەنگیشی تێدا بەرز بكاتەوە.

زانایان دەڵێن بەشێوەیەكی گشتی (رياء) كردەوەی دڵ ناگرێتەوە بەلام (سمعة) كردەوەی دڵ دەگرێتەوە.

فضيلی كوڕی عیاض ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (تەرك كردنی كردەوەی باش لە بەر خەڵكی نەوەک تووشی ڕیا بیت ئەمەش ڕیایە).

---

[1] القول المفيد (١/١٤٥-١٤٦).

چونکه چۆن ئەنجام دانی کردەوە لەبەر خەڵک ڕیایە، وازهێنانیشی لەبەر خەڵکی بە هەمان شێوە ڕیایە، دەڵێین گومانی تێدا نییە ئەگەر ئیخلاسی تەواو بێت خەڵک کاری تێ ناکات بۆ ئەنجام دان و ئەنجام نەدانی کردەوەی باش، بەڵام بڵێیت تووشی (ریاء) بووە وەستان باشترە، چونکە کەسەکە لەبەر ئەوە کردەوە ئەنجام نادات تا تووشی (ریاء) نەبێت، کامەیان باشترە کردەوە ئەنجام بدات تووشی (ریاء) بێت یان کردەوە ئەنجام نەدات تا تووشی (ریاء) نەبێت؟! گومانی تێدا نییە تووشی دەردێک بووە پێویستی بە چارەسەرە، لەحاڵەتێک تووشی ڕیا بووە ئەگەر کردەوە تەرک بکات هەتا خەڵک مەدحی بکەن بڵێن کەسێکی نییەت پاکە لەبەر ئەوە کردەوەی تەرک کرد تا تووشی ڕیا نەبێت، والله أعلم.

موسڵمان ئەگەر باسی کردەوەی باشی خۆی بکات کە پێشتر کردوویەتی نابێتە ریا، باسکردنی کردەوەی باش ئەم چوار حاڵەتانەن:

حاڵەتی یەکەم: باسی کردەوە باشەکانی خۆی دەکات بۆ ئەوەی هانی خەڵك بدات، ئەمە دروستە و بەڵکو پاداشتیشی لەسەر وەردەگرێت.

نموونە: باسی شەو نوێژەکانی خۆی دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی هانبدات بۆ کردنی شەو نوێژ.

حاڵەتی دووەم: باسی کردەوەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی ریزی لێ بگرن و مەدحی بکەن، ئەمەیان دروست نییە و حەرامە، بەڵام بە (ریاء) حساب ناکرێت، چونکە کردەوەی باشی ئەنجام داوە، هیچ (ریاء) و سومعەی تێکەڵ نەکردووە، هەرچەندە هەندێ زانا دەڵێن کردەوەکەی پووچ دەبێت.

نموونە: شەو نوێژی کرد بە ئیخلاسی، دواتر بۆ خەڵکی باس دەکات بۆ ئەوەی مەدحی بکەن، ئەو کاتە دەبێتە (ریاء) کە کردەوە بکات بۆ ئەوەی خەڵک ببینن یان گوێیان لێ بێت.

حاڵەتی سێیەم: باسی کردەوەی باشی خۆی دەکات و درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەڵك مەدحی بکەن، ئەمە حەڕامە و تاوانەکەی گەورەترە لە حاڵەتی دووەم.

نموونە: کەسێك دەڵێت من شەو نوێژم کردووە بۆ ئەوەی مەدحی بکەن، کەچی درۆ دەکات و شەو نوێژیشی نەکردووە.

حاڵەتی چوارەم: باسی کردەوەی خۆی دەکات مەبەستی هاندانی خەڵکی نییە و بۆ ئەوەشی نییە خەڵك مەدحی بکەن و ڕاستیش دەکات و درۆی نەکردووە، واتە: کردەوەی ئەنجام داوە، لەم حاڵەتەشدا باش نییە باسی بکات.

**عن ابن مسعود رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (من مات وهو يدعو من دون الله ندا دخل النار) رواه البخاري.**

واته: ابن مسعود دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک بمرێت و حاڵی وابێت کە جگە لە خوا هەر شتێکی تری پەرستبێت و کردبێتی بە هاوتای خوا، ئەوا دەچێتە ئاگرەوە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(من):** شرطية، دەلالەت لەسەر گشتییەتی دەکات، نێر و مێ دەگرێتەوە.

**(يدعو من دون الله ندا):** واتە: جگە لە خوا هەر شتێکی تری پەرستبێت، کردبێتی بە هاوتای خوا، جا چ لە دوعا بکاتە شەریک یان لە عیبادەت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ترسناکی شیرک ڕوون بکاتەوە، هەر کەسێک شەریک بۆ خوا بڕیار بدات دەچێتە دۆزەخ، جا شیرکی گەورە بێت یان شیرکی بچووک.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک لەسەر شیرک مردبێت و تەوبەی نەکردبێت دەچێتە ناو ئاگر، ئەگەر شیرکی گەورە بوو لە ئاگردا دەمێنێتەوە و هەتا هەتایی دەبێت، بەڵام ئەگەر شیرکی بچووک بوو لە ئاگر نامێنێتەوە و هەتا هەتایی نابێت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە گرینگترین شت کۆتایی کردەوەیە.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ترسناکی شیرک و پەلە کردن لە تەوبە کردن لە شیرک پێش مردن.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە شیرک خوای گەورە لێی خۆش نابێت مەگەر بە تەوبە نەبێت.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شەریک بۆ خوا بڕیاردان جا دوعای (مسألة) بێت یان دوعای عیبادەت هەردووکیان دەگرێتەوە.

یەکەم: دوعای عیبادەت: وەک ڕۆژوو و نوێژ و بێجگە لە ئەمانە و عیبادەتی تر، چونکە مرۆڤ کاتێک نوێژ دەکات یان ڕۆژوو دەگرێت، ئەوە دوعای کردووە کە لێی خۆش بێت و لە سزا ڕزگاری بکات و پاداشتی پێ بدات.

دووەم: دوعای مسألە: داوا کردن و دوعا کردنە، ئەمەیان هەمووی شیرک نییە، بەڵکو تەفسیلی تێدایە، ئەگەر دروستکراو لە تواناییدا هەبوو، ئەوە شیرک نییە، وەک ئەوەی بڵێت: ئاوم پێ بدە لە تواناییدا هەیە[١].

---

[١] القول المفيد (١٤٨/١-١٥٠).

**ولمسلم عن جابر رضى الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (من لقي الله لا يشرك به شيئا دخل الجنة ، ومن لقيه يشرك به شيئا دخل النار).**

واته: موسليم له جابرەوه دەگێڕێتەوه كه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر كەسێک بگات بە خوا و هیچ شەریكی بۆ دانەنابێت دەچێتە بەهەشتەوە، هەر كەسێكیش پێی بگات و هەر شتێكی كردبێت بە شەریكی خوا، ئەوا دەچێتە ئاگرەوە).

### ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(لقي الله):** بگات بە خوا، واتە: مردبێت.

**(شيئا):** نەناسراو هاتووە لە ڕستەی مەرج، هەموو شیركێک دەگرێتەوە.

### هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسكردووە بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ ترسناكی شیرک بكات.

### سوودەكانی فەرموودەكە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر كەسێک تەوبەی نەكردبێت لە شیرک دەچێتە دۆزەخ، ئەگەر شیركی گەورە بوو هەتا هەتایی دەبێت، بەڵام ئەگەر شیركی بچووک بوو هەتا هەتایی نابێت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئایا چوونە ناو ئاگر بۆ هەتا هەتاییە ئەوەی شەریک بڕیار دەدات؟ ئەمەیان بەگوێرەی شیركەكەیە، ئەگەر شیركی بچووک

بێت، ئەوا هەتا هەتایی نابێت لەناو ئاگر، ئەگەر شیركی گەورەش بێت ئەوا هەتا هەتایی دەبێت لەناو ئاگر، هەروەک بەڵگە هاتوون لەسەر ئەمە)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ترسناكی شیرک، كە لێ خۆش بوونی بۆ نییە ئەگەر تەوبەی نەكردبێت، وتەی: (ومن لقيه يشرك به شيئا دخل النار")، ئەمەیان شیركی گەورە و بچووک و شاراوە دەگرێتەوە، لەسەر موسڵمان پێویستە داوای هەڵاتن و ڕزگار بوون لە شیرک بكات بە هەموو جۆرەكانییەوە و هەوڵ و كۆشش بدات، وە پەنا بگرێت بە خوا لە شیركی بچووک و شاراوە[٢].

ئەهلی تەوحید چەند ئەم دوعایە بكات باشە: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ وَأَسْتَغْفِرُكَ لما لا أعلم)[٣].

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (اللهم إنى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ وَالْكُفْرِ وَالْفُسُوقِ وَالشِّقَاقِ وَالنِّفَاقِ وَالسُّمْعَةِ وَالرِّيَاءِ)[٤].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی شەریک بۆ خوا بڕیار نەدان، كە پاداشتەكەی چوونە بەهەشتە.

---

[١] القول المفيد (١٥٢/١).
[٢] التمهيد لاپەڕە (٦٤).
[٣] رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٧١٦)، وصححه الألباني في "صحيح الأدب المفرد".
[٤] رواه الحاكم (١٩٤٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (١٢٨٥).

**٤-** هەندێ زانا ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە شیرکی بچووک گەورەترە لە تاوانی گەورە، چونکە شیرکی بچووک لێخۆش بوونی بۆ نییە، بەڵام تاوانی گەورە لە ژێری ویستی خوای گەورە دایە.

## باب الدعاء إلى شهادة أن لا إله الله

وقوله الله تعالى: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ١٠٨﴾ [يوسف: ١٠٨]

عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ)، لما بعث معاذا إلى اليمن قال له: (إنك تأتي قوما من أهل الكتاب فليكن أول ما تدعوهم إليه شهادة أن لا إله إلا الله ـ وفي رواية: إلى أن يوحدوا الله ـ فإن هم أطاعوك لذلك، فأعلمهم أن الله افترض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة، فإن هم أطاعوك لذلك: فأعلمهم أن الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم فترد على فقرائهم، فإن هم أطاعوك لذلك فإياك وكرائم أموالهم، واتق دعوة المظلوم، فإنه ليس بينها وبين الله حجاب) أخرجاه[١].

ولهما عن سهل بن سعد رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال يوم خيبر: «لأعطين الراية غدا رجلا يحب الله ورسوله، ويحبه الله ورسوله، يفتح الله على يديه. فبات الناس يدوكون ليلتهم أيهم يعطاها. فلما أصبحوا غدوا على رسول الله (ﷺ) كلهم يرجو أن يعطاها. فقال: (أين علي بن أبي طالب؟) فقيل: هو يشتكي عينيه، فأرسلوا إليه، فأتى به فبصق في عينيه، ودعا له، فبرأ كأن لم يكن به وجع، فأعطاه الراية فقال: (انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم، ثم ادعهم إلى الإسلام وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله تعالى فيه، فوالله لأن يهدي الله بك رجلا واحدا، خير لك من حمر النعم). يدوكون: يخوضون. [٢]

**فيه مسائل:**

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (١٣٩٥)، ومسلم (١٩).

[٢] متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٠٠٩،٣٧٠١)، ومسلم (٢٤٠٦).

**الأولى:** أن الدعوة إلى الله طريق من اتبعه (ﷺ).

**الثانية:** التنبيه على الإخلاص، لأن كثيرا لو دعا إلى الحق فهو يدعو إلى نفسه.

**الثالثة:** أن البصيرة من الفرائض.

**الرابعة:** من دلائل حسن التوحيد: كونه تنزيها لله تعالى عن المسبة.

**الخامسة:** أن من قبح الشرك كونه مسبة لله.

**السادسة:** وهي من أهمها – إبعاد المسلم عن المشركين لئلا يصير منهم ولو لم يشرك.

**السابعة:** كون التوحيد أول واجب.

**الثامنة:** أن يبدأ به قبل كل شيء، حتى الصلاة.

**التاسعة:** أن معنى: (أن يوحدوا الله)، معنى شهادة: أن لا إله إلا الله.

**العاشرة:** أن الإنسان قد يكون من أهل الكتاب، وهو لا يعرفها، أو يعرفها ولا يعمل بها.

**الحادية عشرة:** التنبيه على التعليم بالتدريج.

**الثانية عشرة:** البداءة بالأهم فالأهم.

**الثالثة عشرة:** مصرف الزكاة.

**الرابعة عشرة:** كشف العالم الشبهة عن المتعلم.

**الخامسة عشرة:** النهي عن كرائم الأموال.

**السادسة عشرة:** اتقاء دعوة المظلوم.

**السابعة عشرة:** الإخبار بأنها لا تحجب.

**الثامنة عشرة:** من أدلة التوحيد ما جرى على سيد المرسلين وسادات الأولياء من المشقة والجوع والوباء.

**التاسعة عشرة:** قوله: (لأعطين الراية) إلخ. علم من أعلام النبوة.

**العشرون:** تفله في عينيه علم من أعلامها أيضا.

**الحادية والعشرون:** فضيلة علي رضي الله عنه.

**الثانية والعشرون:** فضل الصحابة في دوكهم تلك الليلة وشغلهم عن بشارة الفتح.

**الثالثة والعشرون:** الإيمان بالقدر، لحصولها لمن لم يسع لها ومنعها عمن سعى.

**الرابعة والعشرون:** الأدب في قوله: (على رسلك).

**الخامسة والعشرون:** الدعوة إلى الإسلام قبل القتال.

**السادسة والعشرون:** أنه مشروع لمن دعوا قبل ذلك وقوتلوا.

**السابعة والعشرون:** الدعوة بالحكمة، لقوله:

## بـــاب الدعـــاء الى شهادة أن لا إله إلا الله

## باسی بانگەوازی کردن بۆ شاهیدی لا إله إلا الله

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم ڕیز بەندییەی دانەری کتاب باسیکردووە باشترین ڕیز بەندییە، چونکە کاتێک باسی تەوحیدی مرۆڤی کرد لە خودی کەسەکە باسی بانگەوازی کردنی خەڵکی کرد بۆ تەوحید، چونکە ئیمان تەواو نابێت مەگەر بانگەواز بۆ تەوحید بکرێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ۝٣﴾ [العصر: ١-٣]، دەبێت لەگەڵ تەوحید بانگەوازی خەڵک بکات بۆ یەکخواپەرستی، ئەگەرنا تەوحیدی تەواو نییە، گومانی تێدا نییە ئەوەی ڕێگای تەوحیدی گرتبێتەبەر ئەم ڕێگەی نەگرتۆتەبەر مەگەر باشترین ڕێگا نەبێت، ئەگەر ڕاستگۆ بێت لەگەڵ بیروباوەڕەکەی دەبێت بانگەوازی بۆ بکات، بانگەوازی کردن بۆ کەلیمەی (لا إله إلا الله) لە تەواوی تەوحیدە، تەوحید تەواو نابێت مەگەر بەوە نەبێت)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (باسکردنی ئەم بابەتە لەگەڵ بابەتی پێشووتر زۆر جوان دیارە، چونکە لە بابەتەکانی پێشوو، بابەتی یەکەم: باسی زانینی تەوحیدی کرد، بابەتی دووەم: باسی فەزڵی تەوحیدی کرد، بابەتی سێیەم: باسی فەزڵی تەحقیقی تەوحیدی کرد، بابەتی چوارەم: باسی دژی تەوحیدی کرد کە شیرکە، ئەگەر قوتابی فێری ئەم بابەتانە بوو بە شێوەیەکی باش، تەوحید و فەزڵی تەوحیدی زانی، هەروەها دژی تەوحیدیشی زانی کە بریتی یە لە شیرکی گەورە یان ئەوەی تەوحید کەم دەکاتەوە لە شیرکی بچووک و بیدعە و تاوانەکان، ئەوە ئەو کات گونجاوە بۆ بانگەوازی کردن،

---

[١] القول المفيد (١٥٩/١).

چونکە ناکرێت بۆ مرۆڤ شتێک بزانێت لەم زانستە بیشارێتەوە و لەناو سینگیدا هەڵیبگرێت، نابێت دایبخات و بەس بۆ خۆی بێت، ئەم زانستە ئوممەت هەمووی تێیدا هاوبەشە، هەر کەسێک شتێک بزانێت ئەوە واجبە بڵاوی بکاتەوە و بانگەوازی خەڵکی بکات بۆی، چونکە ئەم ئوممەتە ئومەتی بانگەوازکردنە، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ﴾ [آل عمران: ١١٠])[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (دانەری كتاب ئەم بابەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە تەواوی ترسان لە شیرک و تەواوی تەوحید ئەوەیە کە بانگەوازی خەڵک بکەیت بۆ تەوحید، چونکە تەوحید لە دڵدا تەواو نابێت تا بانگەوازی بۆی نەکەیت)[2].

[1] إعانه المستفيد .(١٣٧/١).
[2] التمهيد لاپەڕە (٦٩).

**وقوله الله تعالى:** ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ۝١٠٨﴾ [يوسف: ١٠٨]

واته: (به خەڵكی بڵێ: ئەم بانگەوازی تەوحید و یەكخواپەرستییە ڕێگای منە، بانگەواز دەكەم تەنها بۆ لای خوا، لەم كارەمدا هیچ شتێ ناكەم بە شەریكی خوا، لەسەر چاوڕۆشنی و عیلم و یەقینم لەو كارەمدا، خۆشم و هەركەسێكیش كە شوێنم كەوتووە، بلێ خوا پاك و بێگەردە لەوەی شەریكی هەبێت، منیش بەریم و دوورم لە تەواوی موشریكان).

**ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە و ماناكەی:**

﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ﴾: واتە: ئەی محمد بلێ: ئەمە ڕێگای منە، واتە مەنهەج و سوننەتی منە.

﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾: ئەمەیان تەفسیری ڕێبازی پێغەمبەری خوایە، ئەویش بانگەوازی كردنە بۆ ئیمان هێنان و یەكخواپەرستی.

﴿عَلَىٰ بَصِيرَةٍ﴾: واتە: لەسەر زانست و یەقین و بەڵگەی شەرعی و عەقلی.

**هۆكاری باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری كتاب ئەم ئایەتەی باسكردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە دەبێت بانگەواز بۆ تەوحید بكرێت.

**سوودەكانی ئایەتەكان:**

١- پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەبەردەرە لەلایەن خوای گەورەوە، لەبەر وتەی: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ﴾، وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن خۆی قورئانی هەڵبەستووە.

**٢-** ڕێگای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی ڕوون و ئاشکرایە، بانگەوازی کردنە بۆ لای خوای گەورە و ئیمان و تەوحید، لەبەر وتەی: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ﴾.

**٣-** ئاماژەکردن بۆ ئیخلاس لە بانگەوازی کردندا، لەبەر وتەی: ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (بانگخوازەکان دەکرێن بە دوو بەش:

- بانگخواز بۆ لای خوا.

- بانگخواز بۆ لای بێجگە لە خوا.

بانگخواز بۆ لای خوا نییەت پاکە و تەنها دەیەوێت خەڵک بگەیەنێتە لای خوا، بانگخواز بۆ لای بێجگە لە خوا بانگەواز بۆ نەفسی خۆی دەکات، بانگەواز بۆ خوا دەکات بۆ ئەوەی گەورە و بەڕێز بێت لە نێو خەڵکدا)[1].

**٤-** هەر کەسێک بانگەوازەکەی لەسەر زانست نەبێت، ئەوە لە شوێن کەوتنەی ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوا نییە، لەبەر وتەی: ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ﴾، بوونی زانست و چاو ڕۆشنی لە بانگەوازی کردندا لە واجبەکانە.

زانایان دەڵێن گرینگترین مەرج بۆ ئامۆژگاری ئەمانەن:

---

[1] القول المفيد (١/١٦٠-١٦١).

یەكەم: دەبێت ئامۆژگاری خەڵک بکات بۆ خوا بە پاکی، چونکە ئەگەر بە پاکی ئامۆژگاری بکات بەرەکەت دەکەوێتە ئامۆژگارییەکانی و خۆی و خەڵک سوودمەند دەبن لێی.

دووەم: ئەوەی ئامۆژگاری خەڵک دەکات دەبێت کردەوە بە قسەکانی بکات، نەک کەسێک بێت قسە و کردەوەکانی دژی یەکتر بن, کە ئەمە حاڵی زۆربەی ئامۆژگاری کارانە، هەر لەبەر ئەمەشە خەڵکانێکی زۆر ئامۆژگاریان لێ وەرناگرن.

سێیەم: نەرم و نیان بێت لە ئامۆژگاری کردنی خەڵک و واز هێنان لە توندی، کە ئەم توندییە لە ئامۆژگاری بۆتە هۆی ئەوە خەڵکانێک زیاتر سووربن لەسەر هەڵەی خۆیان و بەردەوام بن لەسەری.

چوارەم: دەبێت ئامۆژگارییەکە لەسەر زانست بنیات نرابێت، هەروەها ئامۆژگاری بۆ شتی گرینگ پێش هەموو شتێک بخات، ئاسانکاری بۆ خەڵک بکات و لەسەر بابەتێک کە بەرفراوانی تێدایە لە دین لەسەر خەڵکی توند نەکات، کەچی لەم لاشەوە بیروباوەڕی پشت گوێ خستبێت.

پێنجەم: دەبێت ئامۆژگارییەکەی بە نهێنی بێت، نابێت لەپێش چاوی خەڵک ئامۆژگاري بکات، چونکە ئەوەی ئامۆژگاری خەڵک دەکات مەبەستی بڵاوکردنەوەی عەیبی خەڵکی نییە، بەڵکو مەبەستی داپۆشین و لادانی عەیبی خەڵکە، هەروەک چۆن ئامۆژگاریکار بۆ خۆی پێ خۆشە عەیبەکانی شاراوە بن و بێ ئەوەی کەسانی تر بیزانن.

بەداخەوە چەندین کەس هەن ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن لە پێش چاوی خەڵکانی تر وعەیبەکانیان بەدیار دەخەن و قسەی ناشرینیان پێی دەڵێن، ئەمانە وا دەزانن خێریان پێ دەگات و خۆیان پێ ژیرمەندە, کەچی لە ڕاستیدا نەزانن و بەڵکو زانایان دەڵێن تاوانباریش

دەبن لەسەر ئەم كردەوە ناشرینە، هەروەها زۆر لە موسڵمانان لە یەكتری تورە دەبن لەسەر ئامۆژگاری كردن، لەبەر ئەوەی كەسی ئامۆژگاری كار بەو شێوەیە ئامۆژگاری خەڵكی نەكردووە كە شەرع دیاریی كردووە و ڕێگای بۆی داناوە بەوەی كە چۆن ئامۆژگاری خەڵك بكات.

شەشەم: ڕەچاوی كات و شوێنی گونجاو بكات بۆ ئامۆژگاری كردن، چونكە ئەوەی كارێكی خراپی ئەنجام داوە كات هەیە گونجاو نییە ئامۆژگاری بكەیت، دەبێت دوای بخەیت.

حەوتەم: پێش ئامۆژگاری كردن هەڵەكەی بزانی و دڵنیا بیت كە تووشی فلانە هەڵە بووە، نەك كەسێك بەرییە و بێ تاوانە ئامۆژگاری بكەیت یان تۆمەتی بدەیتە پاڵ.

ابن بطال ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئامۆژگاری واجبە و هەر كەسێك پێی هەڵسێت پاداشت بۆی هەیە و لەسەری لادەچێت و لەسەر كەسانی تریش لادەچێت، ئامۆژگاری دەبێت بكرێت بە گوێرەی توانا ئەگەر ئامۆژگاری كار بزانێت ئامۆژگارییەكەی وەردەگیرێت و گوێڕایەڵی دەكرێت، دڵنیا بێت لەنەفسی خۆی، ئەگەر ترسی ئازاری هەبێ ئەوا بەرفراوانی تێدایە)[1].

**٥-** بە پاك دانانی خوای گەورە لە هەموو عەیب و كەم و كورپییەك، لەبەر وتەی: ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾.

---

[1] شرح ابن بطال (١٢٩/١).

**٦-** بەرائەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شیرک و ئەهلی شیرک، لەبەر وتەی: ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾.

**٧-** شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەواو نابێت مەگەر بە بانگەوازی کردن بۆ لای خوا لەسەر زانست و بەری بوون لە شیرک و ئەهلی شیرک.

**٨-** بانگەوازی کردن دەبێت زانستی لەگەڵ بێت و زانستت بەوە هەبێ کە بانگی دەکەیت.

**٩-** شیرک بەکەم دانانی خوای گەورەیە، دەبێت خوای گەورە پاک و بەدوور بگریت لە شیرک.

**١٠-** دەبێت بانگخواز زانستی بەسوودی لا بێت بۆ بانگەواز کردن، خەڵک لە بانگەوازکردن بە پێی ڕیزبەندی ئەمانەن:

- (زانا): ئەوەیە کە ئەدەواتی زانستی خوێندبێت و لەبەری بێت، وەک قورئان و فەرموودە و اصول .... هتد.

- (قوتابی زانست): ئەوەیە کە هەندێک لە ئەدەواتی زانستی بەدەست هێناوە و لە ڕێگادایە بۆ تەواوکردنی.

- (بانگخواز): ئەوەندەی بە دەست هێناوە بانگەوازی پێ دەکات، بانگەواز ناکات مەگەر بۆ ئەو بابەتانە نەبێت کە تێیگەیشتووە.

- (ئامۆژگاری کار): ئەوەیە کە هەندێک فەرموودەی لەبەرکردووە بۆ ترساندن و ئارەزوو خستنە سەر.

- (ئەوەی چیرۆک دەگێڕێتەوە): ئەوەیە هەندێک چیرۆک و حیکایەتی لەبەرکردووە و بۆ خەڵک دەیگێڕێتەوە.

**عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ)، لما بعث معاذا إلى اليمن قال له: (إنك تأتي قوما من أهل الكتاب فليكن أول ما تدعوهم إليه شهادة أن لا إله إلا الله ـ وفي رواية: إلى أن يوحدوا الله ـ فإن هم أطاعوك لذلك، فأعلمهم أن الله افترض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة، فإن هم أطاعوك لذلك: فأعلمهم أن الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم فترد على فقرائهم، فإن هم أطاعوك لذلك فإياك وكرائم أموالهم، واتق دعوة المظلوم، فإنه ليس بينها وبين الله حجاب) أخرجاه**[1].

واتە: لە ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: کاتێک پێغەمبەر خوا (ﷺ) موعازی نارد بۆ یەمەن لە ساڵی دەی کۆچی پێی فەرموو: (تۆ دەڕۆیت بۆ لای قەومێک کە خاوەنی کتابن (واتە: خاوەنی تەوڕات و ئینجیلن) یەکەم شت کە بانگیان دەکەیت بۆی با شاهیدی (لا إله إلا الله) بێت، لە ڕوایەتی تردا دەفەرموویێت: (بانگیان بکە بۆ ئەوەی تەنها خوا بپەرستن)، جا ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵیانی کردی، ئەوا پێیان ڕابگەیەنە کە خوا پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردووە لە شەو ڕۆژێکدا، جا ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵیان کردیت، ئەوا پێیان ڕابگەینە کە خوا زەکاتی فەرز کردووە لەسەریان، لە دەوڵەمەندەکان وەردەگیرێت و دەدرێت بە هەژارەکان، ئەگەر لەمەشدا گوێڕایەڵیان کردیت، ئەوا خۆت بپارێزە لە سەروەت و سامانە فرە جوانەکان، هەروەها خۆشت بپارێزە لە دوعای ستەم لێکراو، چونکە لە نێوان دوعای ستەم لێکراو و خوادا هیچ ڕێگر و بەربەستێک نییە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(بعث معاذا):** واتە: موعازی نارد، ئەمەیان ساڵی دەی هیجری بوو لە مانگی (ربیع الأول)، پێش مردنی پێغەمبەر بە ساڵێک، موعاز نێردرا بۆ یەمەن وەک بانگخواز و مامۆستا و

---

[1] متفق علیه: أخرجه البخاري (١٣٩٥)، ومسلم (١٩).

حاكم، بۆ ئەوەی بانگیان بكات بۆ لای خوا و فێریان بكات و حوكم لە نێوانیان دا بكات.

**(إلى اليمن):** واتە: ناردی بۆ یەمەن، پێی دەڵێن یەمەن چونكە دەكەوێتە لای ڕاستی كەعبە.

**(صدقة):** واتە: زەكات، نەک مەبەست پێی خێری سوننەت بێت، چونكە دەفەرمووێت: (افترض)، واتە: واجب كراوە لەسەرتان.

**(أهل كتاب):** مەبەست پێی گاور و جوولەكەن.

**(تؤخذ):** بە شێوەی كارا نادیار (مبني للمجهول) باسكراوە، ئەوەی وەردەگرێت یان ئیمامە یان جێگرەكەیەتی یان ئەوەی نێردراوە بۆ زەكات.

ڕیوایەت هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (اتَّقُوا دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ وَإِنْ كَانَ كَافِرًا فَإِنَّهُ لَيْسَ دُونَهَا حِجَابٌ)[1].

واتە: (خۆتان لە دوعای ستەم لێكراو بپارێزن ئەگەر كافریش بێت).

### هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب ئەم فەرموودەیەی باسكردووە بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بكات یەكەمین شت كە بانگەوازی بۆ بكرێت بریتییە لە بانگەوازی كردن بۆ تەوحید.

### سوودەكانی فەرموودەكە:

---

[1] أخرجه احمد (١٢١٤٠)، و حسنه الالباني.

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ناردنی بانگخواز بۆ وڵاتانی تر بۆ بانگەوازی کردن، کە ئەمە سوننەتی پێغەمبەر بووە (ﷺ)، لەبەر وتەی: (بعث معاذا الی الیمن)، کە ئەمە فرض الكفائي یە، چونکە لەسەر موسڵمانان واجبە ئیسلام بگەیەنن، بەمە هەستان لە بابەتی فرض الكفايە، واجبە لەسەر کاربەدەستان بانگخوازەکان بنێرن بۆ وڵاتان بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دەبێت بانگخواز شارەزا بێت بە حاڵی ئەو کەسەی کە بانگی دەکات بۆ ئیسلام و حەق، بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات و وەڵامی گومانەکانیان بداتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بە موعازی فەرموو: (تۆ دەڕۆیت بۆ لای قەومێک ئەهلی کتابن)، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تۆ دەچیتە لای خەڵکانێک شارەزان و خۆت ئامادە بکە، یان ئاماژەیە بۆ ئەوە کە تۆ لەسەر حەقی و ئاوڕ لە گومانەکانیان مەدەوە و بەردەوام بە لەسەر بانگەوازی حەق.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی پێی فەرموو لەبەر دوو شت:

- شارەزا بێت بە حاڵی ئەو کەسەی بانگەوازی لەگەڵ دەکات.

- خۆی بۆیان ئامادە بکات، چونکە ئەوان ئەهلی کتابن و زانستیان لە لایە)[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پێداگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر بڵاوکردنەوەی ئیسلام، هەر لەبەر ئەمەش بانگخوازی ناردووە بۆ وڵاتانی تر.

---

[1] فتح ذی الجلال والإكرام (٢١/٦).
[2] القول المفيد.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە یەکێک لە مەرجەکانی موسڵمان بوون وتنی وشەی شایەتوومانە بە زمان.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دووعای کافر قبووڵ دەبێت، چونکە دەفەرموویێت: (خۆت لە دوعای زوڵم لێکراو بپارێزە ئەگەر چی کافریش بێت).

زانایان دەڵێن دوو جۆر دوعامان هەیە:

جۆری یەکەم: (دعاء العبادة): وەک نوێژ یان ڕۆژوو یان ماڵ بەخشین یان هەر کردەوەیەکی تر، ئەمەیان قبوڵ نابێت.

جۆری دووەم: (دعاء المسألة): دوعا کردن لەخوا بۆ دونیا یان قیامەت، بۆ قیامەت چوونە بەهەشت قبول نابێت، بەڵام بۆ دونیا قبول دەبێت لەسەر وتەی زۆربەی زانایان.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دروستکراوەکان هەموویان داوا لە خوا دەکەن بە ئیماندار و کافرەوە، خوای گەورە وەڵامی دوعای کافر دەداتەوە کاتێک داوای رزق و ڕۆزی لە خوا دەکات)[١].

هەروەها دەفەرموویێت: (وەڵام دانەوەی دوعای دوعاکاران گشتییە، خوای گەورە وەڵامی دوعای لێ قەوماو ستەم لێکراو دەداتەوە ئەگەر کافریش بێت)[٢].

ئەوەی گرینگ بێت ئەوەیە هەرکەسێک لە دونیا ئەگەر دوعاکەی یەکسەر قبوول بێت نیشانەی ئەوە نییە کە ئەو کەسە باشە و ڕێگای ڕاستە، بەڵکو دەبێت سەیری بیروباوەڕو

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٠٦/١).
[٢] مجموع الفتاوى (٢٢٣/١).

کردەوەی بکەی، کە چەندین موسڵمان گومرا بوونە لەبەر قبوول بوونی دوعاکەی و دەڵێن ئەوە نەبوو دوعای قبوول بوو؟

ابن قيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (هەرکەسێک دوعای قبوول بێت نیشانەی ئەوە نییە خوای گەورە لێی ڕازییە و خۆشی دەوێت، چونکە خوای گەورە دوعای مرۆڤی باش و خراپ و موسڵمان و کافر قبوول دەکات)[1].

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (هەرکەسێک خوای گەورە ڕزقی پێدا و بە خۆشی ژیاندی, یان بە دوعا قبول کرد و سەری خست یان بێ دوعا سەری خست، مانای وا نییە کە خوای گەورە خۆشی دەوێت و پشگیری دەکات، بەڵکو خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی دەدات بە ئیماندار و کافر و باش و خراپ، دوعایان قبول دەکات و ئەوەیان پێ دەدات کە داوای دەکەن بۆ دونیا، بەڵام لە ئاخیرەت هیچ پاداشتێکیان بۆ نییە)[2].

لەوانەیە یەکێک بڵێت خوای گەورە دوعای کافریش قبول دەکات چۆن جمع دەکرێت لەگەڵ ئەم ئایەتە؟

وەڵام: خوای گەورە دوعای موسڵمان و کافر قبول دەکات، بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوانیان:

- خوای گەورە ئەم عیبادەتە کە دوعا کردنە لە موسڵمان وەردەگرێت و پاداشتی دەداتەوە، بەڵام کافر دوعا بکات ئەم عیبادەتە قبول نابێت، چونکە کوفر کردەوەی باش پوچ دەکات.

---

[1] إغاثة اللهفان (١٣/١).

[2] اقتضاء الصراط المستقيم لاپەڕە (٨٩).

- دوعای موسڵمان بۆ دونیا و قیامەت قبولە، بەڵام دوعا کافر تەنها بۆ دونیا قبولە.

پرسیار: بۆچی خوای گەورە دوعای کافر قبول دەکات کە تووشی شیرک بووە و حەڕامیش دەخوات، بەڵام هی موسڵمان قبول ناکات چونکە تەنها حەرامی خواردووە؟

وەڵام لە دوو ڕووەوەیە:

ـ فەرموودەی: (ثم ذكر الرجل يطيل السفر، أشعث أغبر، يمد يديه إلى السماء يا رب يا رب، ومطعمه حرام، ومشربه حرام، وملبسه حرام، وغذي بالحرام، فأنى يستجاب لذلك)[1].

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوە دوورە دوعای قبول بێت مادەم حەڕام دەخوات و تەوبە ناکات، بەڵام صریح نییە کە بە هیچ شێوەیەک دوعای قبول نابێت، چونکە (أنى) بەڵگەیە لەسەر ئەوە ئەگەر چی شایستەی ئەوەیە دوعای قبول نەبێت بەڵام دەکرێت خوای گەورە قبولیشی بکات بە فەزل و کەرەمی خۆی.

ـ زانایان دەڵێن خوای گەورە دۆستی ئیماندارانە و ئیمانداری خۆشی دەوێت، بۆیە نایەوێت موسڵمان حەڕام بخوات دوعای قبول ناکات تا بگەڕێتەوە ، بەڵام کافر بە پێچەوانەوە دوعای قبول دەکات کەچی کوفری کردووە و حەڕامیش دەخوات بۆ ئەوەی زیاتر ڕایبکێشیت هەستی پێی نەکات و سزای توندتر بێت.

هەروەها زانایان دەڵێن قبول نەبوونی دوعا یەکسەر مەرج نییە دوعاکە قبول نەبوو بێت، چونکە دوعای موسڵمان یان یەکسەر قبول دەبێت یان بەبەر بەلایەک دەکەوێت واتە بەلای پێ لادەچێت بەسەبەب دوعا یان بۆ قیامەت سوودی لێ دەبینێت.

---

(١) رواه مسلم.

**٦-** زۆربەی زانایان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە تەنها ئەم پێنج نوێژە واجبن، واتە ویتر و نوێژی جەژن و (تحية المسجد) و نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران هەموویان سوننەتن.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە زەکات لەسەر هەژار واجب نییە، بەڵکو لەسەر دەوڵەمەند واجبە.

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە زەکات تەنها بە هەژار بدرێت، مەرج نییە بدرێت بەو هەشت کەسانەی خوای گەورە لە قورئان باسیکردوون، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿۞إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾ [التوبة: ٦٠]

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە حەرامە زەکات بدەیت بە دەوڵەمەند، بەڵام خێری سوننەت دروستە پێی بدەیت بە یەک دەنگی هەموو زانایان.

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (خێری سوننەت بۆ دەوڵەمەند حەڵاڵە بێ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەنێوان زانایان، دروستە خێری پێ بدەیت و پاداشت بۆت هەیە، بەڵام بیدەیت بە کەسێکی پێویست باشترە)[١].

ابن قدامە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەموو ئەوانەی حەڕامە زەکاتیان پێ بدەیت لە دەوڵەمەند و نزیکەکان و کافر و بێجگە لە ئەمانە، دروستە خێری سوننەتیان پێ بدەیت)[٢].

---

[١] المجموع (٢٣٦/٦).
[٢] المغني (٢٧٦/٢).

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زەكات دەدرێت بە موسڵمانان و نابێت بدرێت بە كافر مەگەر لەو كەسانە بێت كە ئومێدی موسڵمان بوونی هەبێت و بۆ ئیسلام ڕایبكێشی، چونكە:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (تؤخذ من أغنيائهم فترد على فقرائهم)، واتە: لە دەوڵەمەندان وەردەگیرێت و دەدرێت بە هەژاران، مەبەست پێی دەوڵەمەند و هەژاری موسڵمانانە[1] .

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كە یەكێك لە مەرجەكانی واجب بوونی زەكات موسڵمان بوونە.

عبدالله ال بسام خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت : (زەكات بۆ واجب بوونی مەرجی هەیە، گرینگترینیان:

- ئیسلام: زەكات لە كافر وەرناگیرێت، كەچی مخاطبە و لەسەریشی سزا دەدرێت.

- موڵكی هەبێت و بگاتە حەدی نصاب، واتە: بگاتە حەدی زەكات دان.

- ساڵێكی بەسەردا تێپەڕ بووبێت، بەڵام ئەوەی لە زەوی دەردێت یان بەرهەم دێت لە كاتی بەدەست هێنانی زەكاتی لێ دەدرێت)[2].

**١٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كە واجبە زەكات لە ماڵی هەتیو بدەیت، كە ئەمە وتەی زۆربەی زانایانە.

**١٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە زەكات نەقل بكەیت لە شارێكەوە بۆ شارێكی تر.

---

[1] المنتقى من فتاوى الفوزان (٢/٣٣٣).

[2] توضيح الأحكام (٣/٢١٠).

ابن تيميه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دیارکردنی ماوەی دووری نوێژ کورت کردن کە نابێت زەکاتی بۆ ئەو شوێنە نەقل بکەیت هیچ بەڵگەی شەرعی لەسەری نەهاتووە)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (بەلێ دروستە زەکات نەقل بکەیت لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، بەڵام باشتر وایە بەسەر هەژارانی ئەو شارە دابەش بکرێت مەگەر نەقڵ کردنەکەی سوودی تێدا بێت، نموونە: نزیکەکانی لە شارێکی ترن و زەکاتیشیان پێ دەشێت، یان شارێکی تر زیاتر پێویستیان پێیەتی لە شارەکەی خۆیان و نەقلی دەکات، چونکە خەڵکی شارێکی تر پێویست ترن، ئەگەرنا باشتر وایە بەسەر هەژارانی شاری خۆیدا دابەشی بکات، لەگەڵ ئەمەش ئەگەر نەقڵ بکات بۆ شوێنێکی تر بێ ئەوەی بەرژەوەندی تێدا بێت و بگات بە خاوەنەکەی، ئەوە زەکاتی داوە و لەسەری لاچووە، چونکە خوای گەورە واجبی کردووە بۆ خاوەنی زەکات ببەیت (واتە: بۆ ئەو کەسەی کە زەکاتی پێ دەشێت)، مەرجی دانەناوە ئیلا بۆ ئەو فلانە شار)[٢].

**١٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دەبێت لە بانگەوازی کردن بە تەرتیب دەست پێ بکەیت، لە گرینگترین شت دەست پێ بکەیت و پاشان بچیت بۆ شتی تر.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر یەکێک بڵێت بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) باسی ڕۆژوو و حەجی نەکردووە، کەچی هەردووکیان ئەو کات واجب بوون،

---

[١] الإختيارات لاپەڕە (٩٩).

[٢] مجموع فتاوى و رسائل الشيخ محمد صالح العثيمين المجلد الثامن عشر- باب إخراج الزكاة.

ڕۆژوو لە ساڵی دوو واجب بوو و حەجیش لە ساڵی نۆ، کەچی موعاز لە ساڵی دەی کۆچی نێردراوە؟

وەڵام: دەڵێین لە بابەتی بانگەوازی کردندا خەڵکی بانگ دەکرێن بۆ شتی گرینگ گرینگ، کاتێک موعاز نێردرا بۆ یەمەن مانگی (ربیع الأول) بوو، بۆ ڕۆژوو پێنج مانگی کاتی مابوو، ئەگەر ئیمان لە دڵیان جێگیربوو ئەوە ئەو کات فەرمانیان پێ دەکرێت بۆ ڕۆژوو، واتە ئەو کات پێویستی نەدەکرد بانگیان بکات بۆ ڕۆژوو، هەروەها بۆ حەجیش هەمان شت دەڵێین، چونکە بۆ حەج هەشت مانگی مابوو، حیکمەت لە باس نەکردنی هەردووکیان کاتەکەیە، کاتی نەبوو و پێویستی نەدەکرد.

ئەگەر بوترێ: وەڵام بۆ ئێمە واجبی زەکات بۆچی باسکراوە کەچی هێشتا کاتی ماوە؟

وەڵام: زەکات لە کاتی موسڵمان بوون واجب دەبێت، لە ڕۆژی موسڵمان بوونەوە هەتا ساڵێکی تر زەکات لە ماڵی دەدات ئەگەر هەیبێت.

بۆ ئەوەی بزانن زەکات لە ماڵیان واجب دەبێت، تەواو بوونی ساڵ و سوڕانەوەی ساڵ مەرجە بۆ واجبی زەکات دان، بەڵام زەکات واجب دەبێت لەو ڕۆژەی نیساب تەواو دەبێت، هەروەها لەو ڕۆژەی موسڵمان دەبێت ئەگەر کافر بێت)[1].

**١٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک قەرزار بێت و ماڵی هەبێت و ماڵەکەی گەیشتبێتە حەددی نیساب و ساڵێکی بەسەردا تێپەڕ بووبێت، زەکاتی ماڵی خۆی دەدات ئەگەر قەرزاریش بێت، کە ئەمە وتەی ڕاستی زانایانە.

---

[1] فتح ذي الجلال والإكرام (٢٣/٦).

زانایان دەڵێن هەر کەسێک قەرزار بێت و ماڵی هەبێت، ئەوە واجبە زەکات بدات ئەگەر ماڵەکەی گەیشتبێتە حەددی نیساب و ساڵێکی بەسەردا تێپەڕ بووبێت، وە زەکات دان واجبە لە ماڵ نەک وەک قەرز واجب بێت لەسەر زیمەی قەرزار.

هەر کەسێک قەرزار بێت و ئێستا کاتی دانەوەی قەرزی بێت، هەروەها ماڵی هەبێت و زەکاتی لێ بکەوێت، لەم حاڵەتەدا قەرزەکە دەداتەوە و ئەوەی دەمێنێتەوە ئەگەر بگاتە حەددی نیساب زەکات دەدات ئەگەرنا زەکات نادات.

٤- هەر کەسێک قەرزار بێت بەڵام ئێستا کاتی دانەوەی قەرزی نەبێت، هەروەها ماڵی هەبێت و زەکاتی لێ بکەوێت لەم حاڵەتە هیچ ڕێگریەک نییە بۆ واجبی زەکات دان و دەبێت زەکاتی ماڵی خۆی بدات.

**١٦-** نابێت باشترین ماڵ لە خاوەنی زەکات وەربگیرێت، مەگەر خۆی بیەوێت باشترین ماڵ ببەخشێت.

**ولهما عن سهل بن سعد رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال يوم خيبر: (لأعطين الراية غدا رجلا يحب الله ورسوله، ويحبه الله ورسوله، يفتح الله على يديه). فبات الناس يدوكون ليلتهم أيهم يعطاها. فلما أصبحوا غدوا على رسول الله (ﷺ) كلهم يرجو أن يعطاها. فقال: (أين علي بن أبي طالب؟) فقيل: هو يشتكي عينيه، فأرسلوا إليه، فأتى به فبصق في عينيه، ودعا له، فبرأ كأن لم يكن به وجع، فأعطاه الراية فقال: (انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم، ثم ادعهم إلى الإسلام وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله تعالى فيه، فوالله لأن يهدي الله بك رجلا واحدا، خير لك من حمر النعم). يدوكون: يخوضون.** [١]

واتە: سەهلی كوڕی سەعد خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: كە لە ڕۆژی خەیبەر دا كە ساڵی (٧) ی كۆچی ڕوویدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (والله سبەینێ ئەم ئاڵای جەنگە دەدەم بە كەسێک كە خوا و پێغەمبەرەكەی خۆش دەوێت، خوا و پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت، لەسەر دەستی ئەو فەتحی خەیبەر دەكرێت)، ئەو شەوە خەڵكی كەوتنە گفتوگۆوە كە ئایا دەبێت ئەو كەسە كێ بێت كە ئاڵای پێ دەدرێت، كاتێ بەیانیان بەسەردا هات هەر زوو ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا هەموویان تەمەنناى ئەوەیان هەبوو كە ئالاكەیان پێ بدرێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (عەلی كوڕی ئەبو تالیب لە كوێیە؟

وتیان: ئازاری چاوی هەیە.

فەرمووی: (بنێرن بە شوێنی دا)

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٠٠٩،٣٧٠١)، ومسلم (٢٤٠٦).

چوون دەستیان گرت و هێنایان و تفی کردە هەردوو چاویەوە و دوعای شیفای بۆ کرد و یەکسەر چاک بوویەوە، هەروەک هەرگیز ئازاری نەبوو بێت، پاشان ئاڵاکەی دایە دەستی و فەرمووی: (لەسەر خۆ بڕۆ هەتا لە ساحەکەیاندا دادەبەزیت، ئینجا بانگیان بکە بۆ ئیسلام، خەبەری ئەوەشیان پێ بدە کە چییان لەسەر واجبە ئەوەی کە حەقی خوایە لەو ئیسلام بوونەدا، جا سوێند بە خوا ئەگەر بەهۆی تۆوە خوا هیدایەتی تەنها یەک کەس بدات ئەوە بۆ تۆ باشترە لە وشتری سوور).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(الراية):** واتە: ئالا، لەبەر ئەوە پێی دەڵێن (الراية) چونکە دەبینرێت.

**(فبات الناس يدوكون ليلتهم أيهم يعطاها):** واتە: ئەو شەوە خەڵکی کەوتنە گفتوگۆوە کە ئایا دەبێت ئەو کەسە کێ بێت کە ئاڵاکەی پێ دەدرێت.

**(حمر النعم):** نون سکونی لەسەر کۆی (أحمر)ە، واتە: ڕەنگی سۆر، ئەگەر میم ضمەی لەسەر بێت ئەوە کۆی (حمار)ە، واتە: گوێ درێژ.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دەبێت بانگەواز بۆ تەوحید بکرێت، هەروەها بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوە چی واجب کراوە لەسەریان لە حەقی خوای گەورە.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە خوای گەورە سیفەتی خۆشەویستی هەیە و بەندەی خۆش دەوێت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەهلی تعطیل ئینكاری سیفەتی خۆشەویستی دەكەن و دەڵێن: مەبەست لە خۆشەویستی خوا بۆ بەندە جێگیركردنیانە یان ویستی جێگیركردنیانە، خۆشەویستی بەندەش بۆ خوا خۆشەویستی پاداشتەكەیەتی، ئەم گۆڕینی وتەیە لەسەر ڕووكەشی خۆی پێچەوانەی یەك دەنگی هاوەڵان و تابعین و پێشەوایانە، خۆشەویستی خوا جێگیربووە بە حەقیقی و سیفەتی فعلی یە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ سیفەتی خۆشەویستی بۆ خوا، وەڵامە بۆ ئەوانەی نەفی ئەم سیفەتە دەكەن لە ئەشاعیرە و بێجگە لە ئەشعەریەكان)[2].

**٢-** بە تەنها بانگەوازی كردن بۆ ئیسلام بەس نییە، بەڵكو دەبێت ئەوەشیان بۆ باس بكرێت كە لەسەریان واجبە، بۆ ئەوەی پابەندی بن بەڵام بە تەرتیب هەروەك لە فەرموودەی ناردنی موعاز بۆ یەمەن باسكراوە.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كە هیدایەتی تەوفیق بەدەست خوایە، چونكە فەرمووی: (لأن یهدی) نەیفەرموو: (لأن تهدی).

زانایان دەڵێن جیاوازی هەیە لە نێوان هیدایەتی تەوفیق و (ارشاد):

هیدایەتی توفیق:

- واتە هیدایەت دانی دڵ بۆ ئیمان هێنان و قبوول كردنی حەق.

---

[1] القول المفيد (١٦٨/١).

[2] إعانة المستفيد (١٦٤/١).

- ئەم هیدایەت دانە تایبەتە بە خوا، تەنها خوای گەورە هیداتی مرۆڤەکان دەدات، واتە: هیدایەتی دڵیان دەدات بۆ ئیمان هێنان و قبوول کردنی حەق.

هیدایەتی ارشاد:

- ڕوونکردنەوەی حەق و گەیاندنیەتی بە مرۆڤەکان بە زمان.

- ئەم هیدایەتە پێغەمبەر و بانگخوازەکان دەیگەیەنن و ڕوونی دەکەنەوە بۆ خەڵک.

**٥-** ئەم فەرموودەیە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، بەجۆرێک باسی شتی داهاتووی کردووە هێشتا ڕووی نەداوە، هەروەها هاتەدی بەو شێوەیەی کە باسی کردبوو.

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی پاداشتی خەڵک موسڵمان کردن و خەڵک بە هیدایەت هێنان.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئایا مەبەست پێی هیدایەتی کوفرە بۆ ئیسلام، یان گشتی یە و هەموو هیدایەتێک دەگرێتەوە؟ دەڵێین: ئەوەی نێردراوە بۆ قەومێک بانگەوازیان دەکات بۆ ئیسلام، ئایا بڵێین: قەرینە بەڵگەیە داوای تایبەت کردن دەکات، کەسێک هیدایەتی کەسێک بدات و پیاوێک لەسەر دەستی بە هیدایەت بێت لە بابەتی فەرعی دین ئەو پاداشتەی بۆ نییە لەبەر قەرینە، چونکە عەلی خوا لێی ڕازی بێت نێردراوە بۆ قەومێکی کافر، بانگەوازییان دەکات بۆ ئیسلام. والله أعلم)[1].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پێداگیری هاوەڵان لەسەر خێر و چاکە و گرینگی دانیان بە ئاخیرەت، چونکە شەو ماونەتەوە و هەموویان ئومێدی بەدەست هێنانی ئەو خێرەیان هەبوو و حەزیان دەکرد.

---

[1] القول المفید (١٧١/١-١٧٢).

ئیمام عومەر خوا لێی ڕای بێت دەفەرموویت: (هیچ جار تەمەننای کاربەدەستیم نەکردووە مەگەر ئەم جارە و ئەم شەوە نەبێت).

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئیمان هێنان بە قەدەر، چونکە بۆ عەلی هاتەدی بێ ئەوەی هۆکار بگرێتەبەر.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەمە بەڵگەیە بۆ ئیمان هێنان بە قەدەر، لەبەر بەدەست هێنانی شتێک بێ ئەوەی هەوڵی بۆ بدات)[1].

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە تفی کردە ناو چاوی عەلی خوا لێی ڕازی بێت و چاک بووەوە، دواتریش دووبارە تووشی ئەم نەخۆشی یە نەبووەوە تا مردن.

تەبەڕوک کردن بە عەرەق و تفی پێغەمبەر (ﷺ) دروستە و ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەر، نابێت تەبەڕوک بە تفی پیاوچاکان بکرێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ)، بێجگە لە پێغەمبەر نابێت بە هیچ شتێک تەبەڕوک بکەیت، تەبەڕوک بە هیچ شتێکی وەلی و پیاو چاکان ناکرێت، ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەر، باشترینی ئەم ئوممەتە ئەبو بکرە دوای پێغەمبەر، لەگەڵ ئەوەش تەبەڕوک نەکراوە بە لیکاو و عەرەقەکەی)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (١/١٦٤-١٦٥).

[2] إعانة المستفيد (١٥٧-١٥٨).

**١٠-** ئەم فەرمووودەیە بەڵگەیە بۆ پەلە نەکردن و لەسەرخۆ ڕۆیشتن و دەنگ بەرز نەکردن، چونکە هێمنی و لەسەر خۆیی و پەلە نەکردن بەڵگەیە لەسەر ژیری و بیرکردنەوە لەو کارە.

**١١-** ئەم فەرمووودەیە بەڵگەیە کە بانگەواز کردن پێش شەڕ کردنە.

**١٢-** ئەم فەرمووودەیە بەڵگەیە دەبێت ئیمام هەنگاو و پلان بۆ سوپا دابنێت و ئامۆژگاریان بکات.

**١٣-** ئەم فەرمووودەیە بەڵگەیە بانگخواز بانگەوازی خەڵک دەکات بۆ ئیسلام و تەوحید و واجبەکان و شەرح کردنی دین بۆ خەڵک.

# باب تفسير التوحيد وشهادة أن (لا إله إلا الله)

وقول الله تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا٥٧﴾ [الإسراء: ٥٧]

وقوله: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ٢٦ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ ٢٧ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ٢٨﴾ [الزخرف: ٢٦-٢٨]

وقوله: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ٣١﴾ [التوبة: ٣١]

وقوله: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ﴾ [البقرة: ١٦٥]

**وفي (الصحيح) عن النبي (ﷺ) أنه قال: (من قال: لا إله إلا الله وكفر بما يعبد من دون الله، حرم ماله ودمه، وحسابه على الله عز وجل)[(١)].**

**وشرح هذا الترجمة: ما بعدها من الأبواب.**

**فيه أكبر المسائل وأهمها: وهي تفسير التوحيد،وتفسير الشهادة، وبينها بأمور واضحة:**

---

(١) أخرجه مسلم (٢٣).

**منها:** آية الإسراء، بين فيها الرد على المشركين الذين يدعون الصالحين، ففيها بيان أن هذا هو الشرك الأكبر.

**ومنها:** آية براءة، بين فيها أن أهل الكتاب اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله، وبين أنهم لم يؤمروا إلا بأن يعبدوا إلها واحدا، مع أن تفسيرها الذي لا إشكال فيه: طاعة العلماء والعباد في المعصية، لادعائهم إياهم.

**ومنها:** قول الخليل للكفار: ﴿إِنَّنِي بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ۝٢٦ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾ فاستثنى من المعبودين ربه، وذكر سبحانه أن هذه البراءة وهذه الموالاة: هي تفسير شهادة أن لا إله إلا الله. فقال: ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ۝٢٨﴾.

**ومنها:** آية البقرة: في الكفار الذين قال الله فيهم: ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ۝١٦٧﴾ [البقرة: ١٦٧]، ذكر أنهم يحبون أندادهم كحب الله، فدل على أنهم يحبون الله حبا عظيما، ولم يدخلهم في الإسلام، فكيف بمن أحب الند أكبر من حب الله؟! فكيف لمن لم يحب إلا الند وحده، ولم يحب الله؟!

**ومنها:** قوله (ﷺ): (من قال: لا إله إلا الله وكفر بما يعبد من دون الله حرم ماله ودمه، وحسابه على الله) وهذا من أعظم ما يبين معنى (لا إله إلا الله) فإنه لم يجعل التلفظ بها عاصما للدم والمال، بل ولا معرفة معناها مع لفظها، بل ولا الإقرار بذلك، بل ولا كونه لا يدعو إلا الله وحده لا شريك له، بل لا يحرم ماله ودمه حتى يضيف إلى ذلك الكفر بما يعبد من دون الله، فإن شك أو توقف لم يحرم ماله ودمه. فيالها من مسألة ما أعظمها وأجلها، ويالها من بيان ما أوضحه، وحجة ما أقطعها للمنازع.

## باب تفسير التوحيد و شهادة أن (لا إله إلا الله)

## ڕوون كردنەوەی تەوحيد و شەهادەتی (لا إله إلا الله)

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم بابەتە باسی تەفسیری ئەم وشەیە دەكات و ماناكەی ڕوون دەكاتەوە، چونكە ئەوەی بانگەواز بۆ شتێک دەكات و داوا لە خەڵک دەكات بیكەن بە كردەوە، دەبێت بۆیان ڕوون بكاتەوە بە ڕوونكردنەوەیەكی تەواو، ئەوە بە تەنها بەس نییە بە خەڵک بڵێیت بڵێن: (لا إله إلا الله)، یان بە خەڵک بڵێیت: داخلی ناو ئیسلام ببن، بەڵكو دەبێت مانای (لا إله إلا الله)یان بۆ ڕوون بكەیتەوە، دەبێت مانای ئیسلام و هەڵوەشێنەرەوەكانی ڕوون بكەیتەوە، ئەو ئیسلامەی كە بانگت كردوون بۆی، دەبێت ئەوانەی پێچەوانەی (لا إله إلا الله)ن لە جۆرەكانی هەڵگەڕانەوە و جۆرەكانی شیرک پیشانیان بدەیت، تاوەكو بانگەوازەكە بەرووبوومدار بێت و خەڵكەكەش سوود لە بانگەوازەكە وەربگرن، بانگەوازی كردن بۆ شتێكی موجمەل ئەمە بەس نییە)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (١٦٧/١).

**وقول الله تعالى:** ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا٥٧﴾ [الإسراء: ٥٧]

واته: بەو موشریکانە بڵێ دەی داوا بکەن لە هەموو ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن و هەموو جۆرە عیبادەتێکیان بۆ ئەنجام دەدەن، "زعمتم" واتە بەدرۆوە دەڵێن لای خوا تکامان بۆ دەکەن" تا بۆتان دەربکەوێت ئایا ئەوانە دەتوانن بەڵایەک بەتەواوی لابدەن لەسەرتان یان دەتوانن بەڵاکە بگۆڕن یان بیگوازنەوە بۆ شوێنێکی تر؟ دیارە کە ناتوانن، دەی بزانن ئەو پێغەمبەر و پیاوچاک و فریشتانەی کە ئێوە دەیانپەرستن و داوایان لێ دەکەن، ئەوانە بەندەیەکن وەک ئێوە و خۆیان بەدوای هۆکارێکدا دەگەڕێن کە لەخوا نزیکیان بکەنەوە، هەرچی کردەوەیەک لەخوا نزیکیان دەکاتەوە ئەنجامی دەدەن، دەی سەرنج بدە کامیان لە خواوە نزیکترە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بەتەمای ڕەحمەتی خوان و لە عەزابی خوا دەترسن.

**هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە:**

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا﴾: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە:

١- کۆمەڵێکی عەرەب کۆمەڵە جنۆکەیێکیان دەپەرست، جنۆکە و عەرەبەکان موسڵمان بوون و هەستیان بەمە نەکرد کە ئایەت دابەزی، ئەمە لە ابن مسعود نەقل کراوە خوا لێی ڕازی بێت.

٢- سەبارەت بە تیرەیەکی عەرەب دابەزی کە پەیکەری فریشتەیان دەپەرست.

٣- سەبارەت بە ئەهلی شیرک دابەزی، ئەهلی شیرک فریشتە و مەسیح و دایکی و عوزەیر و خۆریان دەپەرست.

خاوەنی تيسير العزيز الحميد دەفەرموویێت: (ابن تيمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ئەم وتانە هەموویان حەقن، چونکە ئایەتەکە گشتییە و هەموو پەرستراوێک دەگرێتەوە بێجگە لە خوا، جا لە فریشتە بێت یان جنۆکە یان لە مرۆڤ)[1].

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ﴾: واتە: بەو موشریکانە بلێ  دەی داوا بکەن لە هەموو ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن.

﴿يَبۡتَغُونَ﴾: واتە: داوای لێ دەکەن.

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لە باب (تفسير التوحيد و شهادة أن لا إله إلا الله) بریتییە لەوەی کە: تەوحید بەری بوون لە شیرک لەخۆ دەگرێتەوە، بەجۆرێک داوا لەکەس ناکات لەگەڵ خوا، نە داوا لە فریشتەیەکی نزیک دەکات، نە پێغەمبەرێکی نێردراو، ئەوانەی داوایان لە پێغەمبەر و فریشتەکان کرد بەری نەبوون لە شیرک، بەڵکو ئەوان تووشی بوون، ئەوەی سەیر بێت ئەوان داوایان لێ دەکەن لەکاتێکدا خۆیان بەندەیەکن وەک ئەوان و بەدوای هۆکارێکدا

[1] تيسير العزيز الحميد لاپەڕە (١٠٢).

دەگەڕێن کە لەخوا نزیکیان بکاتەوە، ئەوان بێ نیاز و دەوڵەمەند نین لە خوای گەورە بۆ نەفسی خۆیان، چۆن دەوڵەمەند دەبن بۆ کەسانی تر)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ﴾، بەڵگەیە کە نابێت دوعا لە پێغەمبەر و پیاو چاکان بکەیت، چونکە زۆربەی زانایان دەڵێن هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە باسی قەومێک بوو مەسیح و دایکی و عوزەیریان دەپەرست.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتە سەبارەت بە قەومێک دابەزی کە مەسیح و دایکی و عوزەیریان دەپەرست، خوای گەورە ڕوونی کردەوە ئەوانەی ئێوە داوای لێ دەکەن بۆ ئەوەی بەهاناتانەوە بێن ئەوانیش بەندەی منن، ئەوانیش هەژارن بۆ لای من و داوام لێ دەکەن، لێم نزیک دەبن بە گوێڕایەڵی کردن و عیبادەت کردن، ئەوانە بەندەیەکن لە بەندەکانی من، بەندە ناکرێت پەرستراو بێت، لە ئاسمان و زەوی کەس نییە ئیلا بەندەی خوایە)[2].

**٢-** جێگیرکردنی سیفەتی ڕەحم بۆ خوای گەورە، خوای گەورە سیفەتی ڕەحمی هەیە عەقڵ و نەقڵ بەڵگەن لەسەری، لەبەر وتەی: ﴿أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ﴾.

---

[1] القول المفيد (١/١٨٥).

[2] إعانة المستفيد (١/١٦٩-١٧٠).

**٣-** ئەم ئایەتە: ﴿أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ﴾، ئاماژەیە بۆ خۆشویستنی خوا و لەخوا ترسان و ئومێدبوون بە خوا، کە ئەم دووانە وەک دوو باڵ وان بۆ بەندە بۆ ئەوەی بگات بە خوای گەورە و گومڕا نەبێت.

**٤-** ئەم ئایەتە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ﴾، بەڵگەیە کە وەسیلە مەبەست پێی هەر عیبادەت و کردەوەیەکی باشە کە لە خوا نزیکت بکاتەوە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (وەسیلە: گوێڕایەڵی و عیبادەتە، فریشتە و عیسا و عوزەیر و پیاو چاکان هەموویان لەخوا نزیک دەبن بە گوێڕایەڵی و عیبادەت)[1].

تەوەسولی ڕاست و دروست ئەوەیە هۆکار گرتنەبەرە بە هۆکاری دروست کە بتگەیەنێتە داواکراو، وەک تەوەسل بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە، تەوەسل کردن بە ئیمان هێنان بە خوا و پێغەمبەر و کردەوەی باش و باسکردنی حاڵی خۆت، تەوەسل کردن بە باسکردنی حاڵی خۆی، تەوەسل کردن بە دوعای پیاوێکی باش کە زیندوو بێت و ئومێدی قبول بوونی دوعای هەبێت، چونکە هاوەڵان داوایان لە پێغەمبەر دەکرد دوعایان بۆ بکات بە شێوەیەکی گشتی، یان دوعای تایبەت.

تەوەسلی نادروست و هەڵە ئەویش ئەوەیە مرۆڤ تەوەسول بکات بە شتێک کە وەسیلە نییە و شەرع ڕێگەی نەداوە، چونکە تەوەسلی لەم جۆرە لەغوەیە و باطلە و پێچەوانەی عەقل و نەقلە، لەوانە تەوەسول بکات بە دوعای مردوو و داوای لێ بکات دوعا بۆی بکات لە خوا، ئەمە وەسیلەی شەرعی نییە، بەڵکو لە بێ عەقڵیە داوا لە مردوو بکەیت بۆ ئەوەی دوعات بۆ لە خوا بکات.

---

(١) إعانة المستفيد (١٧١/١).

لەوانەی کە تەوەسولی دروست نەبێت، تەوەسل کردنە بە جاهی پێغەمبەر (ﷺ).

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ابن تیمیه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: واستە هەیە هەر کەسێک ئینکاری بکات ئەوە تووشی کوفر بووە، واستە هەیە هەر کەسێک دانی پیا بنێت تووشی کوفر بووە.

ئەو واستەی ئینکاری بکەیت تووشی کوفر بوویت کامەیە؟

ئەوە واستەیە پێغەمبەرانن، ئەوان واستەن لە نێوان خوا و بەندەکانی بۆ گەیاندنی ڕیسالە و فەرمان و نەهی خوا، هەر کەسێک ئینکاری بکات تووشی کوفر بووە، چونکە ئینکاری ڕیسالەی پێغەمبەرانی کردووە.

واستە هەیە هەر کەسێک دانی پیا بنێت ئەوە تووشی کوفر بووە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ واستە لەنێوان خۆی و خوا دابنێت بۆ گەیاندنی پێویستی یەکانی و بەرزکردنەوەی دوعاکانی)[1].

**٥-** پێغەمبەران و پیاو چاکان هەژارن بۆ لای خوا، ئومێدی ڕەحمی خوایان هەیە و لە سزای دەترسن.

**٦-** واجبی خۆ پاراستن لە سزای خوا، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾.

---

[1] إعانة المستفيد (١/١٧٤-١٧٥).

**وقوله:** ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ٢٦ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ ٢٧ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ٢٨﴾ [الزخرف: ٢٦-٢٨]

خوای گەورە دەفەرموویێت: (باسی ئەوەش بکە کاتێک ئیبراهیم بە باوکی و قەومەکەی گوت: بە تەئکید من بەریم لە هەر چییەک کەئێوە دەیپەرستن، جگە لەو خوایەی کە دروستی کردووم، جا بەڕاستی هەر ئەویش هیدایەتم دەدات، کارێکی کرد کە ئەو وشەیە وشەی "یەکخواپەرستی" پاش خۆیشی لە نەوەکانییدا هەر بمێنێت، سا بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکان و ماناکەیان:**

﴿إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ٢٦ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي﴾: ئەم ئایەتە مانای (لا إله إلا الله) تێدایە، ﴿إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ﴾، ئەمە (لا إله)یە، ﴿إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي﴾، ئەمە (إلا الله)یە.

وتەی ئیبراهیم (عليه السلام) کە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ٢٦ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي﴾، نەیفەرموو: (إلا الله): ئەمەش دوو سوودی هەیە:

یەکەم: ئاماژەیە بۆ ئەوە عیلەتی بە تەنیا دانانی خوای گەورە لە عیبادەتدا، چونکە بە تەنیایە لە دروستکردن، دەبێت بە تەنیا دابنرێت لە بەندایەتیدا هەروەک چۆن بە تەنیا دادەنێن لە پەروەردگاریەتیدا.

دووەم: ئاماژەیە بۆ پوچ کردنەوەی عیبادەتی پەیکەر کردن، چونکە ئێوەی دروست نەکردووە تا بیپەرستن، نەفی کردنی عیبادەتی جگە لەخوای تێدایە و جێگیرکردنی تەنها عیبادەتی خوایە تێدایە، کە ئەمەش مانای (لا إله إلا اللّه).

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە، چونکە تەوحید نەفی و جێگرکردنە، دەبێت بەری بیت لە شیرک و تەنها خوا بپەرستیت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** فەزلی ئیبراهیم (علیه السلام) و مەدحی خوای گەورە بۆی کە بەری بووە لە شیرک و ئەهلی شیرک کاتێک ئەوان سوور بوون لەسەر شیرک، لەبەر وتەی: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ﴾.

**٢-** ئیخلاسی ئیبراهیم (علیه السلام) و عیبادەت کردنی خوای گەورە و شەریك بۆ بڕیار نەدانی، لەبەر وتەی: ﴿إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي﴾.

**٣-** واجبی ترسان لە شیرک و ئەهلی شیرک، شیرک و تەوحید هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە.

**٤-** جێگیرکردنی ئەوە تەنها خوای گەورە دروستکارە، لەبەر وتەی: ﴿إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي﴾، بەڵگەیە دەبێ مرۆڤ حوکم بە بەڵگە باس بکات، چونکە بەهێزترە.

**٥-** لە داواکراوی تەوحیدی پەروەردگاریەتی تەوحیدی بەندایەتی یە.

**٦-** بەهێزی ئومێدی ئیبراهیم (علیه السلام) و گومانی باشی بەخوای گەورە و هیدایەتی، لەبەر وتەی: ﴿إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ﴾، لە ئایەتی تر دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ۝٧٨﴾ [الشعراء: ٧٨]، وتەی: (یهدین) و (سیهدین)، بەڵگەیە بۆ بەردەوامی هیدایەتی لە ئێستا و داهاتوو.

**٧-** هدایەتی تەوفیق بەدەست خوای گەورەیە، بۆیە دەبێت تەنها ڕوو لەخوای گەورە بکرێت و داوای هیدایەت لەخوا بکرێت، گومانی باش بەخوای گەورە ببردرێت.

**٨-** فەزلی خوای گەورە بەسەر ئیبراهیم (علیه السلام) و نەوەکانی، بەجۆرێک تەوحید و ئیخلاس و تەنها خواپەرستی و بەری بوون لە شیرک و ئەهلی شیرک لەناو نەوەکانی هێشتەوە تا ڕۆژی قیامەت، لەبەر وتەی: ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾.

**٩-** هێشتنەوەی کەلیمەی تەوحید لەناو نەوەکانی ئیبراهیم بۆ ئەوەیە تا بگەڕێنەوە و تەوبە بکەن، لەبەر وتەی: ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾.

**١٠-** وەسیەتی ئیبراهیم (علیه السلام) بە کەلیمەی تەوحید بۆ نەوەکانی، دوعا بۆ کردنیان بەوە خوای گەورە لەشیرک دووریان خاتەوە، لەبەر وتەی: ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾.

**١١-** ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەسڵی دینی پێغەمبەران یەک دین بووە کە یەکخواپەرستی یە.

**١٢-** حەق گوتن بە ئاشکرایی سیفەتی پێغەمبەران بووە.

**١٣-** واجبە ئینکاری خراپە بکەیت ئەگەر چی نزیکی تۆش بێت.

**١٤-** واجبە بەری بیت لە شیرک و خاوەنی شیرک.

**وقوله:** ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴿٣١﴾﴾ [التوبة: ٣١]

واتە: لە دژی ئەوان بجەنگن، چونکە ئەو جوولەکە و گاورانە زاناکان و خواپەرستەکانی خۆیان کرد بە خوا و پەرستراوی خۆیان، مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردبوو بە پەرستراوی خۆیان، ئەوان هیچ فەرمانێکیان بەسەردا نەدرابوو تەنها ئەوە نەبێت کەتەنها خوا بپەرستن، هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە جگە لە الله، خوا پاک و دوورە لەو کارەی ئەوان شەریکیان بۆ داناوە.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:**

﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾: عن عدي بن حاتم: أنه سمع النبي (ﷺ) يقرأ هذه الآية: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ الآية. فقلت له: إنا لسنا نعبدهم قال: (أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلون ما حرم الله، فتحلونه؟) فقلت: بلى. قال فتلك: عبادتهم)[1].

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەم دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ الآية، منیش گوتم: ئێمە ئەمان پەرستوون، فەرمووی: (ئەی ئەوە نییە ئەوەی خوا حەڵاڵی کردوە ئەمان هاتوون حەرامیان کرد، ئێوەش یەکسەر بە حەرامتان دادەنا، ئەوەشی کە

---

[1] رواه أحمد، والترمذي وحسنه. أخرجه الترمذي (٣٠٩٤)، والطبراني في "الكبير (٩٢/١٧ رقم ٢١٨).

خوا حەڕامی کردوە ئەوان حەڵاڵیان دەکرد، ئێوەش یەکسەر بە حەڵاڵتان دادەنا؟) منیش گوتم: بەڵێ وایە، فەرمووی: (دەی ئەوە پەرستنی ئەوانە).

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ڕووی ئەم ئایەتە بۆ تەفسیری تەوحید و شایەتی (لا إله إلا الله) ئەوەیە خوای گەورە ئینکاریيانی لێ کردووە لەسەر ئەوەی کە زانا و خواپەرستەکانیان کردووە بە خوا، ئەم ئایەتە لە داهاتوو دانەری کتاب باسی دەکات، بابەتێکی تایبەتی باسکردووە لەسەر ئەمە)[1].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** بەندە چاکەکان و زاناکان کردنە خوا، شەریکیان لەگەڵ خوا بڕیار دەدا لە عیبادەت و گوێڕایەڵی، لەبەر وتەی: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾.

گوێرایەڵی کردنی زانایان ئەم چوار حاڵەتەیە:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر گوێ ڕایەڵی زانا بکات لە حەڕام کردنی حەڵاڵێك یان حەڵاڵ کردنی حەڕامێک، باوەڕی وابێت گوێڕایەڵی کردنی دروستە و بە قسەی ئەو حەڵاڵ حەڕام دەبێت، ئەمە شیرکی گەورەیە و شیرکە لە گوێڕایەڵی کردندا.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر گوێڕایەڵی زانا بکات لە حەڕام کردن و حەڵاڵ کردن، ئەگەر حەڕامەکەش حەڕام بێت یان حەڵاڵەکەش حەڵاڵ بێت هەر تووشی شیرکی گەورە بووە، چونکە زانای کردۆتە خوای خۆی لە دین و گوێڕایەڵی سەربەخۆی بۆ زاناکە داناوە.

---

[1] القول المفيد.

حاڵەتی سێیەم: ئەگەر گوێڕایەڵی زانا بکات لە حەڕام کردنی حەڵاڵێک یان حەڵاڵ کردنی حەڕامێک، بزانێت زانایەکە هەڵەیە بەڵام شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێ و گوێڕایەڵی بکات، ئەمە تەنها تاوانبارە، هەروەها هەندێ زانا دەڵێن تووشی شیرکی بچووک بووە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (ئەگەر ئەوەی گوێڕایەڵییان دەکات باوەڕی وابێت حەڕامە و دان بەوەدا دەنێت کە ئەمە هەڵەیە، بەڵام گوێڕایەڵیان دەکات لەبەر هەواو ئارەزووی خۆی، خۆیش دان بەوەدا دەنێت کە تاوانە، ئەمە شیرکی بچووکە)[1].

حاڵەتی چوارەم: ئەگەر گوێڕایەڵی زانا بکات لە حەڵاڵ کردنی حەڕام یان حەڕام کردنی حەڵاڵ، هەروەها نەزانێت فڵانە شت حەڵاڵە یان حەڕامە، گومانی وایە ڕاست دەکات، ئەمەیان عوزری هەیە و تاوانبار نابێت.

**٥-** شەریک بۆ خوا بڕیاردانی گاورەکان لەوە عیسایان کردووە شەریک لەگەڵ خوا لە عیبادەتدا، لەبەر وتەی: ﴿وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾.

**٦-** خوای گەورە حوجەی لەسەر ئەهلی کتاب لاداوە لە تەوراتو ئینجیل و زمانی پێغەمبەران، کە تەنها خوا بپەرستن و تەنها گوێڕایەڵی ئەو بکەن، لەبەر وتەی: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.

**٧-** هیچ پەرستراوی بەحەق نییە جگە لە (الله) نەبێت، دەبێت تەنها (الله) بپەرسترێت و گوێڕایەڵی ئەو بکرێت، لەبەر وتەی: ﴿لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾.

---

[1] اعانة المستفيد (٢/١٦٠).

**٨-** خوای گەورە نەفسی خۆی بە پاک داناوە لە شیرک و شەریک بۆ بڕیاردان، لەبەر وتەی: ﴿سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، هەروەها بەڵگەیە ئەهلی کتابیش موشریکن.

**٩-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر مانای (لا إله إلا الله).

**وقوله:** ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ﴾ [البقرة: ١٦٥]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویّت: (هەندێک لە خەڵکی هەن هاوتایان بۆ خوا داناوە لە خۆشەویستی دا، ئەوانەیان خۆش دەوێت وەک خۆشەویستی خوا، بەڵام ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە خۆشەویستیان بۆ خوا زۆر بەهێزترە لە خۆشەویستی کافران بۆ خوا "پەیکەرەکانیان").

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:

﴿وَمِنَ النَّاسِ﴾: پیتی (من) (للتبعيض)، واتە: هەندێک لە خەڵکی.

﴿أَنْدَادًا﴾: کۆی (ند)ە، واتە: شەریک و هاوتا.

﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ﴾: دوو وتە هەیە لەسەر مانای ئەم ئایەتە:

یەکەم: موشریکەکان هاوبەشەکانیان خۆش دەویست وەک خۆشەویستی خوا.

دووەم: موشریکەکان هاوبەشەکانیان خۆش دەویست وەک خۆشەویستی ئیمانداران بۆ خوا، وتەی ڕاست وتەیە یەکەمە، والله أعلم[1].

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویّت: (بزانە جۆرەکانی خۆشەویستی سێ جۆرن:

یەکەم: خۆشەویستی خوا کە بنچینەی ئیمان و تەوحیدە.

---

[1] بدائع التفسير (٣٧٢/١).

دووەم: خۆشەویستی لە ڕێگای خوا، وەک خۆشەویستی پێغەمبەرانی خوا و نێردراوەکانی و شوێن کەوتووەکانی، هەروەها خۆشویستنی ئەو شتانەی خوای گەورە خۆشی دەوێن لە کردەوە و کات و شوێن و شتی تر، ئەمانە تابعی خۆشەویستی خوان.

سێیەم: خۆشەویستی لەگەڵ خوا، کە خۆشەویستی موشریکەکان بۆ خواکانی خۆیان لە دار و بەرد و مرۆڤ و فریشتە و شتی تر، کە ئەمەش بنچینەی شیرکە.

پاشان دەڵێت جۆری چوارەمیش هەیە ئەویش خۆشەویستی سروشتی یە، وەک خۆشەویستی خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ و ژن هێنان و شتی تر)[١].

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (باس کردنی ئەم ئایەتە لەژێر ئەم ناو نیشانە ڕوون و ئاشکرا و دیارە، ئەویش ئەوەیە کە هاوبەش بڕیاردان لە خۆشەویستی نەفی تەواوی تەوحید دەکات، هەروەها لە ئەسڵەوە نەفی تەوحید دەکات، بەڵکو خوای گەورە حوکمی داوە بەوەی کە کردوونە بە پەرستراو)[٢].

## سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** خۆشەویستی خوای گەورە عیبادەتە، بەڵکو خۆشەویستی و بەگەورە دانانی بنچینەی عیبادەتە، بە خۆشەویستی فەرمانەکان جێ بەجێ دەکەیت، بە بەگەورە دانان خۆت لە قەدەغە کراوەکان دوور دەخەیتەوە، هەر لەبەر ئەمەش خۆش ویستنی بێجگە لەخوا وەک خوا دەبێتە شیرک.

[١] القول السدید لاپەڕە (٨٨).
[٢] التمهید لاپەڕە ٨٩.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (خۆشەویستی و ترس و ئومێد بنچینە و بناغەی عیبادەتن، ئەگەر ئەم سێ یە کۆبوونەوە ئەوا عیبادەتەکە دروستە، وەک: نوێژ و حەج و عیبادەتەکانی تر، بەڵام ئەگەر ئەم سێ یە نەبوون ئەوا مرۆڤ ئەگەر بەڕۆژوو بێت و نوێژ و حەجیش بکات، ئەوا عیبادەتی دروست نییە.

زانایان دەڵێن: (من عبد الله بالمحبة فقط فهو صوفي)، واتە: هەر کەسێک عیبادەتی خوا بکات تەنها لەبەر خۆشەویستی، ئەوە سۆفی یە، چونکە سۆفی دەڵێن ئێمە خوا دەپەرستین لەبەر ئەوەی تەنها خۆشمان دەوێت، هەروەها دەڵێن: ئێمە ناپەرستین لە ترسی ئاگر و ئومێد بە بەهەشتەکەی، بەڵکو دەیپەرستین چونکە خۆشمان دەوێت، ئەمەش گومڕاییە.

(ومن عبد الله بالرجاء فقط فهو مرجئ)، واتە: هەر کەسێک عیبادەتی خوای گەورە بکات تەنها لەسەر ئومێد بوون پێی، ئەوە مورجیئەیە، چونکە مورجیئە کردەوە دەردەهێنن لە ئیمان.

(ومن عبد الله بالخوف فقط فهو خارجي)، واتە: هەر کەسێک عیبادەتی خوا بکات تەنها لەبەر ترسان لەخوا، ئەوە خەوارجە، چونکە خەوارج ئیمانداران کافر دەکەن لەسەر تاوان.

مورجیئە تەنها لایەنی ڕەجایان گرتووە، سۆفی تەنها لایەنی خۆشەویستیان گرتووە، خەوارجیش تەنها لایەنی ترسیان گرتووە.

ئەهلی سوننە ئەم سێ شتانەیان تێدایە سوپاس بۆ خوا، خۆشەویستی و ترس و ئومێد بوون بەخوا و زەلیل و ملکەچ بوون و گوێڕایەڵی)[1].

**٢-** هەر کەسێک شەریک بۆ خوا بڕیار بدات لە خۆشەویستیدا، ئەوا ستەمکارە.

---

[1] إعانة المستفيد (٤٨/٢).

**٣-** ئیماندار خۆشەویستی یەکەی بۆ خوا زیاترە لە خۆشەویستی ئەوان بۆ پەیکەرەکانیان، لەبەر وتەی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾.

**٤-** بەندە چەند ئیمانی زیاد بێت خۆشەویستی یەکەی زیاتر دەبێت، چونکە زۆر خۆشویستنی خوای گەورەی پەیوەست کردووە بە ئیمان، لەبەر وتەی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾.

**٥-** واجبی پێش خستنی خۆشەویستی خوای گەورە بەسەر هەموو خۆشەویستەکان، چونکە خوای گەورە زەمی ئەوانەی کردووە کە هاوتاکانیان خۆش دەوێت وەک خوا، بە ستەم و شیرک وەسف کردووە.

**وفي (الصحيح) عن النبي (ﷺ) أنه قال: (من قال: لا إله إلا الله وكفر بما يعبد من دون الله، حرم ماله ودمه، وحسابه على الله عز وجل)[١].**

واته: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێک بڵێت: (لا إله إلا الله) لەگەڵ ئەوەشدا کافر بێت بە هەر شتێک کە دەپەرسترێت جگە لە خوا، ئەوا ماڵ و خوێنی حەڕام و پارێزراوە و حسابیشی لەلای خوای گەورەیە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لا إله إلا الله):** واتە: بە مەرجەکانیەوە (لا إله إلا الله) بڵێت.

**(وكفر بما يعبد من دون الله):** واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کافر بێت بە هەر شتێک کە دەپەرسترێت جگە لە خوا.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە مانای تەوحیدی ڕوونکردەوە، مانای (لا إله إلا الله)ی ڕوونکردەوە، ئەویش ئەوەیە وشەی شایەتوومان بهێنێت و کوفر بە عیبادەتی بێجگە لەخوا بکەیت و بەری بێت لێی)[٢].

### سوودەکانی فەرموودەکە:

١- بەڵگەیە کە تەنها وتنی (لا إله إلا الله) بەس نییە، بەڵکو دەبێت کوفر بە عیبادەت کردنی بێجگە لەخوا بکەیت.

---

[١] أخرجه مسلم (٢٣).

[٢] إعانة المستفيد.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی ئیسلام کە خوێن و ماڵ دەپارێزێت.

**٣-** واجبە واز لە کافر بهێنیت ئەگەر هاتە ناو ئیسلام، ئەگەر چی لەکاتی جەنگیش دابێت.

**٤-** واجبە حوکم بە ڕووکەش بکرێت لە دونیا، لە قیامەتیش بە گوێرەی نییەت حسابی لەگەڵ دەکرێت.

**٥-** مەرجی هاتنە ناو ئیسلام ئەوەیە دەبێت بەزمان شایەتوومان بڵێیت، تەنها بە دڵ بەس نییە، هەروەها تەنها بە زمانیش گوتن هیچ سوودی نییە ئەگەر دڵی لەگەڵ نەبێت.

## باب من الشرك لبس الحلقة والخيط ونحوهما لرفع البلاء أو دفعه

**وقول الله تعالى:** ﴿قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَـٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴿٣٨﴾﴾ [الزمر: ٣٨]

**عن عمران بن حصين رضي الله عنه، أن النبي (ﷺ) رأى رجلا في يده حلقة من صفر، فقال: (ما هذه)؟ قال: من الواهنة فقال: (انزعها فإنها لا تزيدك إلا وهنا، فإنك لو مت وهي عليك، ما أفلحت أبدا) رواه أحمد بسند لا بأس به[١].**

**وله عن عقبة بن عامر رضي الله عنه مرفوعا: (من تعلق تميمة فلا أتم الله له، ومن تعلق ودعة فلا ودع الله له)[٢].**

**وفي رواية: (من تعلق تميمة فقد أشرك)[٣].**

**ولابن أبي حاتم عن حذيفة أنه رأى رجلا في يده خيط من الحمى فقطعه، وتلا قوله:** ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴿١٠٦﴾﴾ [يوسف: ١٠٦] [٤].

---

[١] أخرجه أحمد (٤٤٥/٤ رقم ٢٠٠٠٠)، وابن حبان (٤٤٩/١٣ رقم ٢٣٣)، وابن ماجه (٣٥٣١)، ضعفه الألباني في "الضعيفة" (١٠٢٩).

[٢] أخرجه أحمد (١٥٤/٤ رقم ١٧٤٠٤)، وابن حبان (٤٥٠/١٣ رقم ٦٠٨٦)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (١٢٦٦).

[٣] أخرجه أحمد (١٥٦/٤ رقم ١٧٤٢٢)، والحاكم (٢١٩/٤)، صححه الألباني في "الصحيحة" (٤٩٢).

[٤] تفسير ابن أبي حاتم (٢٢٠٨/٧ رقم ١٢٠٤٠).

**فيه مسائل:**

**الأولى:** التغليظ في لبس الحلقة والخيط ونحوهما لمثل ذلك.

**الثانية:** أن الصحابي لو مات وهي عليه ما أفلح. فيه شاهد لكلام الصحابة: أن الشرك الأصغر أكبر من الكبائر.

**الثالثة:** أنه لم يعذر بالجهالة.

**الرابعة:** أنها لا تنفع في العاجلة بل تضر، لقوله: (لا تزيدك إلا وهنا).

**الخامسة:** الإنكار بالتغليظ على من فعل مثل ذلك.

**السادسة:** التصريح بأن من تعلق شيئاً وكل إليه.

**السابعة:** التصريح بأن من تعلق تميمة فقد أشرك.

**الثامنة:** أن تعليق الخيط من الحمى من ذلك .

**التاسعة:** تلاوة حذيفة الآية دليل على أن الصحابة يستدلون بالآيات التي في الشرك الأكبر على الأصغر، كما ذكر بن عباس في آية البقرة.

**العاشرة:** أن تعليق الودع عن العين من ذلك.

**الحادية عشرة:** الدعاء على من تعلق تميمة، أن الله لا يتم له، ومن تعلق ودعة، فلا ودع الله له، أي لا ترك الله له.

## بـاب من الشرك لبس الحلقة والخيط و نحوهما لرفع البلاء أو دفعه

## یەکێک لە جۆرەکانـی شیـرک: بەکارهێنانی بازن و ئەڵقە و دەزو و هاوشێوەکانیانە بە مەبەستـی لابردنی بەڵا یـان گێڕانەوەی بەڵا

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (دانەری کتاب بە درێژی بەم بابەتە دەستی پێ کردووە و جۆرەکانی شیرکی بچووکی ڕوونکردۆتەوە کە زۆربەی خەڵکی تێی کەوتوون، لە شیرکی بچووکەوە دەستی پێکردووە پێش شیرکی گەورە وەک نەقل بوون لە بچووکەوە بۆ گەورە، چونکە گومان بۆ بچووکەکە لاوازە، بە پێچەوانەی گومانەکانیان بۆ گەورەکان کە لاوازترن.

دانەری کتاب سەرەتا بە شیرکی بچووک دەستی پێکردووە نەقل بوون لە نزم بۆ بەرز، تا بەهێزتر بێت بۆ بەڵگە و بۆ نەفس، لەڕووی گرنگی پەیوەست بوون بەخوا و پووچ کردنی پەیوەست بوون بە بێجگە لە خواوە.

**(لرفع البلاء أو دفعه):** چونکە دوو حاڵەت هەیە، هەیە حەلقە و دەزوو یان شتی تر هەڵدەواسێت پێش ڕوودانی بەڵا بۆ لادانی، گومانی تێدا نییە ئەمەیان تاوانی گەورەترە لەوەی هەڵیدەواسێت بۆ هەڵگرتنی بەڵا دوای هاتنی، چونکە گومانی وایە ئەم شتە پیسانە قەدەری خوا لادەبەن.

بنچینە لەم بابەتە: جێگیرکردنی هۆکاری کاریگەر و بە هۆکار دانانیان نابێت مەگەر لە ڕووی شەرعەوە بێت، نابێت هۆکار جێگیر بکەیت مەگەر هۆکارەکە شەرعی بێت، یان

هۆکارێک بێت بە تاقیکردنەوە کاریگەری هەبێت، کاریگەریەکی ڕوون و ئاشکرا نەک شاراوە)[١].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ((من الشرك) من لێرە بە مانای هەندێک دێت، واتە: ئەمە هەندێک جۆری شیرک، نەک هەمووی شیرک بێت، شیرک (اسم جنس)ە شیرکی گەورە و بچووک دەگرێتەوە، لەبەرکردنی یان لەدەست کردنی ئەم جۆرە شتانە جار وایە شیرکی بچووکە و جار وایە شیرکی گەورەیە، بە گوێرەی نییەتی ئەو کەسەیە کە لەبەری کردووە، لەبەر کردنی ئەم شتانە لە شیرکە، هەر شتێک بکەیتە هۆکار، خوای گەورە بە هۆکاری دانەنابێت نە هۆکاری شەرعی و نە هۆکاری قەدەری، ئەوا نەفسی خۆی کردووە بە شەریک لەگەڵ خوا.

خەڵک لە هۆکارەکان دوو لایەن و مام ناوەند هەن:

یەکەم: کەسانێک هەن ئینکاری هۆکار دەکەن، ئەوانە هەموو ئەو کەسانەن کە نەفی حیکمەتی خوا دەکەن، وەک جەبری و ئەشعەری.

دووەم: هەیانە زیادەڕەوی دەکات لە جێگیرکردنی هۆکار، تەنانەت شتێک هۆکاریش نەبێت دەیکەن بە هۆکار، ئەوانە زۆرینەی خورافییەکان و سۆفییەکان و کەسانی تری وەک ئەوانن.

سێیەم: هەیە ئیمانی بە هۆکار و کاریگەرییەکەی هەیە، بەڵام هۆکارەکان جێگیر ناکەن مەگەر ئەو هۆکارانە بن کە خوا و پێغەمبەر جێگیریان کردووە، جا هۆکاری شەرعی بێت یان هۆکاری کەونی.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٩٥-٩٦).

لەبەر کردنی دەزوو و ئەلقە و بازن و هاوشێوەکانی:

- ئەگەر ئەوەی لە دەستی کردووە باوەڕی وابێت خودی بازنەکە کاریگەری هەیە و کارایە، ئەوا شیرکی گەورەیە و شیرکە لە تەوحیدی پەروەردگاریەتی دا، چونکە باوەڕی وایە لەگەڵ خوا دروستکارێکی تر هەیە.

- ئەگەر باوەڕی وابێت ئەوە هۆکارە بەڵام خودی شتەکە کاریگەری نییە، ئەوە شیرکی بچووکە، چونکە باوەڕی وایە ئەو شتە هۆکارە کەچی هۆکار نییە، بەژداری لەگەڵ خوای گەورە کرد لە حوکم بۆ ئەو شتە کە هۆکارە و کەچی خوای گەورەش بە هۆکاری دانەناوە.

(لرفع البلاء أو دفعه) جیاوازی نێوانیان: (رفع) دوای هاتنی بەڵایە، (دفع) پێش دابەزین یان هاتنی بەڵایە.

شیخ محمد بن عبدالوهاب ئینکاری هۆکاری ڕاست ناکات بۆ هەڵگرتن و لادانی بەڵا، بەڵکو ئینکاری هۆکاری نادروست دەکات)[١].

پوختەی وتەی زانایان:

لەدەست کردن یان لەبەر کردنی ئەڵقە و دەزوو و شتی تر هاوشێوەی ئەمانە ئەم سێ حاڵەتانە:

یەکەم: هەر کەسێک دەزوو یان ئەڵقە لەبەر بکات و باوەڕی وابێت خودی دەزووەکە یان حەڵقەکە سوود یا زیان یان بەڵا لادەدات، ئەوا تووشی شیرکی گەورە بووە، شیرک لە پەروەردگارییێتیدا.

---

[١] القول المفيد (٢٠٤/١-٢٠٩).

دووەم: هەرکەسێک دەزوو یان ئەڵقە لەبەر بکات و باوەڕی وابێت خودی دەزووەکە یان ئەڵقەکە تەنها هۆکارە و لادانی بەڵا و ناخۆشی بەدەست خوایە، ئەوا تووشی شیرکی بچووک بووە.

سێیەم: هەر کەسێک دەزوو یان ئەڵقە لەبەر بکات، هیچ مەبەستی نەبێت تەنها بۆ جوانی، دەڵێن ئەگەر شتێکی ڕوون و ئاشکرا بوو بەوانە بچێت کە بۆ لادانی بەڵا یان هەڵگرتنی بەڵا لەبەر دەکەن، ئەوا حەڕامە، چونکە خۆ چوواندنە بە ئەهلی شیرک حەڕامە ئەگەر چی نییەتی خۆ چوواندنیشی نەبێت.

دەزوو یان ئەڵقە لەبەر کردن یان لە دەست کردن بۆ لادان یان هەڵگرتنی بەلا یان ناخۆشی دوو حاڵەتە:

یەکەم: یان بۆ هەڵگرتنی بەڵا، واتە دوای ئەوەی تووشی نەخۆشی یان بەلا دەبێت ئینجا لە دەستی دەکات.

حاڵەتی دووەم: بۆ لادانی بەڵا، واتە: هێشتا تووشی بەڵا و نەخۆشی نەبووە و دەزوو یان ئەڵقەکە لە دەست دەکات.

زانایان دەڵێن لەدەست کردنی دەزوو یان ئەلقە بۆ لادانی بەلا و ناخۆشی تاوانی گەورەترە لە هەڵگرتنی بەلا، چونکە تووشی گومانی خراپیش بووە و باوەڕی وایە بەو کردەوەیە قەدری خوای گەورە ڕەت دەکاتەوە.

بەستنی دەزوو یان ئەلقە بە دوو مەرج دەبێتە شیرکی بچووک:

١- بە شەرع و تەجروبە جێگیر بووبێت کە هۆکارەکە سوودی نییە.

٢- پەیوەست بێت بە خودی شتەکە کە سوودی هەیە (واتە: هۆکارە) وە خودی شتەکە زیان و بەلا لانادات، بەڵکو هۆکارە بۆ ئەوەی خوای گەورە لایبدات.

بەستنی دەزوو یان ئەلقە بە دوو مەرج دەبێتە شیرکی گەورە:

١- بە شەرع و تەجروبە جێگیر بووبێت هۆکارەکە سوودی نییە.

٢- پەیوەست بێت بە هۆکارەکە و باوەڕی وابێت خودی شتەکە زیان و بەڵا لادەدات وەک خوا.

**وقول الله تعالى:** ﴿قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ٣٨﴾ [الزمر: ٣٨]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (ئەی پێغەمبەر بەو موشریکانە بڵێ: مادام دان بەوە دەنێن کە تەنها خوا دروستکارە، دەی پێم بڵێن ئەوانەی کە ئێوە داوایان لێ دەکەن و پەرستنیان بۆ دەکەن جگە لە خوا، ئەگەر خوا ویستی هەر حاڵەتێکی خراپ بهێنێت بەسەرم دا وەک "نەخۆشی یان هەژاری یان هەر بەڵایەکی تر"، ئایا ئەوانە دەتوانن ئەو حاڵە نالەبارە لابدەن کە خوا هێناویەتی؟ یان ئەگەر ویستی هەر جۆرێک لە ڕەحمەتی خۆییم پێ ببەخشێت ئایا ئەوان دەتوانن ڕەحمەتەکەی بگەڕێننەوە؟ دەی تۆش بڵێ تەنها خوا بەسە، ئەوانەش کە دەیانەوێت پشتیوانێکی بەهێزیان هەبێت تەنها پشت بەخوا دەبەستن).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:

﴿قُلْ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ﴾: (تدعون): مەبەست پێی دوعای عیبادەت و دوعای (مسألة)یە، ئەوان دوعایان دەکرد بە دوعای عیبادەت بۆ ئەم پەیکەرانە، دەیانپەرست بە نەزر و سەر بڕین و ڕکوع و سوجدە، هەروەها دوعایان لێ دەکرد بۆ لادانی زیان و ڕاکێشانی سوود، خوای گەورە ئەگەر ویستی زیان بە بەندە بگەیەنێت کەس ناتوانێت لەسەری هەڵبگرێت و لایبدات، ئەگەر ویستی ڕەحمی پێ بکات کەس ناتوانێت ڕەحمی بگرێتەوە، ئەو پەیکەرانە ناتوانن زیان لابدەن و ڕێگری سوود بکەن، ئەی بۆ دەیپەرستن؟!

﴿كَاشِفَاتُ﴾: هەڵگرتن و لادانی ناخۆشی و بەڵا دەگرێتەوە، ناتوانن زیان لابدەن و دووری بخەنەوە و ناتوانن هەڵیبگرن و نەیهێڵن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم ئایەتە لەم بابە: ئەم پەیکەرانە سوودیان بۆ خاوەنەکەی نییە، نە بە ڕاکێشانی سوود و نە بەلادانی زیان، هۆکاریش نین بۆ ئەمە، هەموو شتێک گەر هۆکاری شەرعی یان قەدەری نەبێت لەسەر ئەمە قیاس دەکرێت، بە هۆکاریشی دابنێیت شیرکە بۆ خوا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر زیرەکی و بەهێزی بەڵگەکەی دانەری کتاب، ئەگەرنا بێ گومان ئایەتەکە باسی شیرکی گەورەیە کە پەیکەریان دەپەرست، بەڵام قیاسەکە زۆر ڕوونە، ئەم پەیکەرانە هۆکار نین تاوەکو سوودیان هەبێت، هەموو شتێک لەسەری قیاس دەکرێت هۆکار نەبێت، بەشیرک دادەنرێت.

ڕوویەکی تریشی هەیە بۆ هێنانەوەی ئەم ئایەتە لەم شوێنە وتەی: ﴿حَسْبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴿٣٨﴾﴾، ئەوەی تێدایە کە خوای گەورە بەسە و پێویست ناکات پشت بە هۆکاری وەهمی ببەستیت، بەڵام هۆکاری حەقیقی نەفی تەوەکل ناکات و بەڵکو بەندە پشتی بەخوا بەستووە و کارەکانی خۆی تەسلیمی خوای گەورەی کردووە، چونکە ئەم هۆکارە حەقیقی یە لە لای خواوەیە)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- ئینکاری کردنی موشریکەکان چۆن خوا بەتەنیا دادەنێن لە پەروەردگاریەتیدا و شەریکی بۆ بڕیار دەدەن لە بەندایەتیدا، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾.

---

[1] القول المفيد (١/٢٠٨-٢١٢).

**٢-** جێگیرکردنی ویستی کەونی بۆ خوا، لەبەر وتەی: ﴿إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ﴾.

**٣-** ئەوەی موشریکەکان دەیپەرستن ناتوانن زیان لەسەر بەندە لابدەن ئەگەر خوا ویستی لێ بێت، ناتوانن ڕێگری ڕەحمەتی بکەن ئەگەر خوا ویستی لێ بێت، لەبەر وتەی: ﴿إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ﴾.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەو ئایەتانەی هاتوون سەبارەت بە شیرکی گەورە، بەڵگەن لەڕووی ماناوە لەسەر واجبی پەیوەست بوون بە خوا و پووچ کردنی پەیوەست بوون بە بێجگە لە خواوە، ئەم مانایەش لە شیرکی بچووکدا هەیە، لەبەر ئەوە پێشینەکان ئایەتی شیرکی گەورەیان بۆ شیرکی بچووکیش باس دەکرد، چونکە هەردوو شیرکەکان پەیوەست بوون بە بێجگە لە خوای تێدایە، ئەگەر پەیوەست بوون بە گەورەکە پووچ بکرێت هی بچووکتر لەپێش ترە پووچ بکرێت.

ڕووی دووەم: ئەم ئایەتە باسی شیرکی گەورەیە، بەڵام ماناکەی لەسەر ئەوەیە کە هەموو کەسێک بێجگە لەخوا هیچ شتێکی بە دەست نییە، ناتوانن زیان و بەڵا لابدەن، ناتوانن ڕێگری ڕەحمەت و فەزڵی خوای گەورە بکەن ئەگەر ویستی لێ بێت، ئەوە ماناکەیەتی کە پەیوەست بوونە بەوەی کە زیانی دەگەیەنێت یان سوود، ئەوە شیرکە و شیرکی بچووکیش هەمان شت)[١].

**٤-** خوای گەورە بەسە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سەرخستن و پشتگیری کردنی، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ﴾.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (١٠١-١٠٢).

**٥-** واجبی تەوەکول خستنەسەر خوای گەورە و پشت پێ بەستنی و متمانەی تەواو بەخوای گەورە، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾.

**٦-** دان پێدانانی موشریکەکان بە تەوحیدی پەروەردگاریەتی.

**٧-** واجبە خوای گەورە بەتەنیا دابنرێت لە پشت پێ بەستن دا (توكل).

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (﴿عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾، پشت بە ئەلقە و دزوو و گۆڕ و وەلی و شتی تر نابەستن، بەڵکو ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێت و شیاو بێت خوای گەورەیە، چونکە هەموو شت بەدەست ئەوە)[1].

**٨-** جێگیر کردنی ویست بۆ خوای گەورە.

**٩-** خوای گەورە مرۆڤ تاقی دەکاتەوە بە خۆشی و ناخۆشی و بەڵا و ڕەحمەت.

**١٠-** شیاوترین و حەقترین کەس بۆ پشت پێ بەستن خوای گەورەیە.

**١١-** ئەوەی دەپەرسترێت بێجگە لەخوا سوود و زیانی بۆ خاوەنەکەی نییە.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (هەندێ زانا دەڵێن: ئەم ئایەتەی دانەری کتاب هێناویەتی باسی شیرکی گەورەیە، بۆچی لێرە باسیکردووە کەچی ئەم بابە باسی شیرکی بچووک دەکات؟

وەڵام بۆ ئەمە لە دوو ڕووەوەیە:

---

[1] إعانة المستفيد (١٨٨/١).

ڕووی یەکەم: ئەو ئایەتانەی هاتوون سەبارەت بە شیرکی گەورە، بەڵگەن لەڕووی ماناوە لەسەر واجبی پەیوەست بوون بە خوا و پووچ کردنی پەیوەست بوون بە بێجگە لە خواوە، ئەم مانایەش لە شیرکی بچووک دا هەیە، لەبەر ئەوە پێشینەکان ئایەتی شیرکی گەورەیان بۆ شیرکی بچووکیش باس دەکرد، چونکە هەردوو شیرکەکان پەیوەست بوون بە بێجگە لە خوای تێدایە، ئەگەر پەیوەست بوون بە گەورەکە پووچ بکرێت هی بچووکتر لەپێش ترە پووچ بکرێت.

ڕووی دووەم: ئەم ئایەتە باسی شیرکی گەورەیە، بەڵام ماناکەی لەسەر ئەوەیە کە هەموو کەسێک بێجگە لەخوا هیچ شتێکی بە دەست نییە، ناتوانن زیان و بەڵا لابدەن، ناتوانن ڕێگری ڕەحمەت و فەزڵی خوای گەورە بکەن ئەگەر ویستی لێ بێت، ئەوە ماناکەیەتی کە پەیوەست بوونە بەوەی کە زیانی دەگەیەنێت یان سوود، ئەوە شیرکە و شیرکی بچووکیش هەمان شت)[1].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (١٠١-١٠٢).

**وعن عمران بن حصين أن النبي (ﷺ) رأى رجلا في يده حلقة من صفر فقال ما هذه؟ قال: من الواهنة. قال: انزعها فإنها لا تزيدك إلا وهنا; فإنك لو مت وهي عليك ما أفلحت أبدا" رواه أحمد بسند لا بأس به.**

عیمرانی کوڕی حوصەین خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی بینی ئەلقەیەکی صفری لەدەست دابوو، فەرمووی: ئەوە چییە؟

پیاوەکە وتی: ئەوە بۆ چارەسەری لاوازی و ئازاری قۆڵە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لایدە و فڕێیدە، چونکە ئەوە جگە لە جۆرەکانی لاوازی هیچی ترت بۆ زیاد ناکات، ئەگەر بمریت و ئەوەشت پێوە بێت، ئەوە هەرگیز دەرباز و سەرفەراز نابیت)

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(رأى رجلا):** واتە: پیاوێکی بینی، پیاوەکە دیار نییە کێ بووە، بەڵام ڕیوایەت هاتووە عیمران خۆی بووە.

**(من الواهنة):** واتە: ئەوە بۆ چارەسەری لاوازی و ئازاری قۆڵە.

**(فإنك لو مت وهي عليك ما أفلحت أبدا):** واتە: ئەگەر بمریت و ئەوەشت پێوە بێت و تەوبەت نەکردبێت، ئەوە هەرگیز دەرباز و سەرفەراز نابیت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئەلقە لە دەست کردن دروست نییە و شیرکە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** دەبێت ئەوەی ئینکاری خراپە دەکات سەرەتا لە حاڵی کەسی بەرامبەر بپرسێت، چونکە شت هەیە دەیبینێت خراپەیە لە ڕووەکەشدا کەچی خراپە نییە و کەسەکە مەبەستێکی تری هەیە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەمە بەڵگەیە واجبە ئینکاری خراپە بکەیت و بەڵگەیە مرۆڤ نابێت ئینکاری شتێک بکات هەتا مەبەستی کەسەکە نەزانێت ئەگەر شتەکە ئەگەری مەبەستی خراپەی هەبێت دەبێت ئینکاری بکرێت)[١].

**٢-** واجبە ئینکاری خراپە بکەیت، ئەسڵ وایە یەکسەر ئینکاری بکرێت مەگەر سوود لە دواخستنی هەبێت، ئەگەر سوودی هەبێت ئەو کات دوادەخرێت.

**٣-** هۆکارەکە ئەگەر شەرعی نەبێت و بە تەجروبە سوودی نەبێت، ئەوە سوودی بۆ مرۆڤ نییە.

**٤-** لەبەرکردنی ئەلقە و دەزوو بۆ لادان و هەڵگرتنی بەڵا شیرکە، چونکە دەفەرموویت: (هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنیت)، بەڵام ئایا ئەمە شیرکی گەورەیە یان بچووکە؟ پێشتر باسمان کرد بەگوێرەی بیروباوەڕی کەسەکەیە[٢].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە هەموو کردەوەیەک گرینگ کۆتاییەکەیەتی.

**٦-** هەندێ زانا ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە شیرکی بچووک خوای گەورە لێی خۆش نابێت ئیلا لەسەری سزا دەدرێت.

---

[١] إعانة المستفيد (١٩٠/١).

[٢] القول المفيد.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەگەر بمرێت و تەوبەی نەکردبێت هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، ئەمە بەڵگەیە کە خوای گەورە لە شیرک خۆش نابێت تەنانەت ئەگەر شیرکی بچووکیش بێت لەسەری سزا دەدرێت، بەڵام وەک شیرکی گەورە سزا نادرێت و لە ئاگر هەتا هەتایی نابێت، بەڵام سزا دەدرێت بەگوێرەی تاوانەکەی.

دانەری کتاب لە مسائلەکان دەڵێت: "بۆ ئەمە پاڵ پشتی لە وتەی صحابە هەیە: "شیرکی بچووک گەورەترە لە تاوانە گەورەکان"، چونکە تاوان ئەگەر چی گەورە بێ بەڵام ئەگەر شیرکی تێدا نەبێ ئەوا دیارە کەم وکورتی لە عەقیدە نییە، بەڵام ئەگەر شیرکی بچووکی هەبوو ئەوە خەلەل لە عەقیدەیە، هەروەها لێ خۆش بوونی بۆ نییە لەسەر وتەی ڕاست، بەڵام تاوانی گەورە لێ خۆش بوون بۆی هەیە)[١].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) غەیب نازانێت، چونکە پرسیاری ئەوەی لێ کردووە ئەمە چییە.

حامد بن محمد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەمە بەڵگەیە کە کەس غەیب نازانێت مەگەر خوا نەبێت، پاشان دەڵێت ئەمە بەڵگەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) حوکم دەرناکات مەگەر دوای زانست و یەقین نەبێت)[٢].

**٨-** هەندێک ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە عوزر بە نەزانین نییە لە بابەتی بیروباوەر، کەسەکە نەیزانیووە و پێی وترا: (هەر گیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنی)، بەڵام وتەی ڕاست عوزر بە نەزانین تەفسیلی تێدایە.

---

[١] إعانة المستفيد (١٩١/١).

[٢] فتح الله الحميد المجيد لاپەڕە (١٩٨-١٩٩).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (عوزری لێ وەرنەگیرا بە نەزانین ئەمە جێگای تێڕوانینە، چونکە وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (ئەگەر بمری ئەمەت بە دەستەوە بێت هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنی)، ئەمەیان ڕوون و ئاشکرا نییە کە بمرێت پێش زانین، بەڵکو ڕووکەشی فەرموودەکە: (لو مت وهي عليك ما أفلحت أبدا)، واتە: دوای ئەوەی زانیت و فەرمانت پێکرا بە لێکردنەوەی، ئەم بابەتە پێویستی بە تەفسیل هەیە، دەڵێین: نەزانین دوو جۆرە:

نەزانین هەیە مرۆڤ عوزری هەیە، نەزانینیش هەیە مرۆڤ عوزری نییە، ئەگەر لە شوێنێک بێت کەمتەرخەمی بکات لە پرسیارکردن و فێربوون، ئەوا عوزری بۆی نییە، جا کوفر بێت یان تاوان، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بێت و کەمتەرخەمی نەکردبێت و هەوڵی دابێت، بەڵام شتەکە خەیاڵیدا نەهاتبێت کە حەڕامە، ئەوا عوزری لێ وەردەگیرێت، ئەگەر موسڵمان بێت زیانی بۆی نییە، ئەگەر کافر بێت ئەوا لە دونیا حسابی کافری لەگەڵ دەکرێت و لە قیامەتیش کارەکەی بۆ لای خوای گەورەیە لەسەر وتەی ڕاست تاقی دەکرێنەوە، ئەگەر گوێڕایەڵیان کرد دەچنە بەهەشت، ئەگەر سەرپێچی یان کرد دەچنە ناو ئاگر)[1].

کەواتە زانایان دەڵێن هەر کەسێک لەسەر کوفر بێت لەم دوو حاڵەتانە دایە:

حاڵەتی یەکەم: کەسێک لەسەر ئایینی بێجگە لە ئیسلامە و دەزانێت و بۆی ڕوون بۆتەوە کە دینی ئیسلام ڕاستە، بەڵام ئیمان ناهێنێت، ئەمەیان کافرە و ئەگەر بمرێت لەسەر ئەم بیروباوەڕە ئەوە لە ئاگری دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت.

---

[1] القول المفيد.

حاڵەتی دووەم: کەسێک لەسەر ئایینی بێجگە لە ئیسلامە، نازانێت دینی ئیسلام هەیە یان دەزانێت ئیسلام هەیە بەڵام ئیسلامی بە جوانی پێی نەگەیشتووە، ئەم کەسە ڕاستگۆیە ئەگەر بزانێت ئیسلام هەیە یان ئیسلام ڕاستە بێگومان موسڵمان دەبێت، ئەمەیان لەدونیا مەمەڵەی کافری لەگەڵ دەکەین بەڵام لە قیامەتدا دۆزەخی نییە و خوای گەورە تاقی دەکاتەوە.

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە گۆڕینی خراپە بە زمان دەبێت ئەگەر کەسەکە گوێڕایەڵیت بکات، پێویست بە گۆڕینی خراپە ناکات بە دەست.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: ("انزعها" ئەمە فەرمانە، بەڵگەیە کە گۆڕینی خراپە بە زمان دەبێت، ئەگەر فەرمان پێکراو گوێڕایەڵی فەرماندەر بێت، ئەمەیان بەسە و پێویست بە گۆڕینی خراپە ناکات بە دەست، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) حەقی ویلایەتی هەیە، دەکرا بەدەست بیگۆڕێت، بەڵام حاڵی کەسەکەی زانیووە کە گوێڕایەلی دەکات، پێی فەرموو: (انزعها) پێچەوانە نییە لە نێوان ئەمە و ئەوەی دواتر کە حوزەیفە دەزووی پچڕاندووە لە دەستی کەسێک، ئەوە بنیات نراوە لەسەر حاڵەتێکی تر)[1].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (١٠٣).

**عن عقبة بن عامر قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (من تعلق تميمة فلا أتم الله له، ومن تعلق ودعة فلا ودع الله له)**[(١)].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک چاوەزارێک هەڵبواسێت بە هەر شتێکەوە، یان دڵی بەو شتەوە پەیوەست بێت، دەک خوا کاری ڕاست نەهێنێت و مەبەستی نەهێنێتە دی، هەر کەسێک گوێچکەی ماسی هەڵبواسێت، یان دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە، دەک خوای گەورە ئارامی و ئیسراحەتی پێ نەدات.)

**وفي رواية: (من علق تميمة فقد أشرك)**[(٢)].

واتە: (هەر کەسێک چاوەزارێک هەڵبواسێت، ئەوا بە تەئکید شەریکی بۆ خوا داناوە).

**ولابن أبي حاتم عن حذيفة رضى الله عنه: أنه رأى رجلا في يده خيط من الحمى، فقطعه وتلا قوله تعالى:** ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ [يوسف: ١٠٦]

واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێت پیاوێکی بینی کە دەزووی لەدەست کردبوو بۆ لادانی تاداری "واتە: نەخۆشی تا"، یەکسەر بە دەستی خۆی پساندی و ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ [يوسف: ١٠٦]، واتە: زۆرینەیان کە ئیمان بەخوا دەهێنن لە هەمان کات دا، ئیلا شەریک بۆ خوا دادەنێن.

---

(١) رواه أحمد ( ١٦٩٥١ )، والحديث: ضعفه الشيخ الألباني في "ضعيف الجامع" ( ٥٧٠٣ ).

(٢) رواه أحمد ( ١٦٩٦٩ )، والحديث: صححه الشيخ الألباني في "السلسلة الصحيحة" ( ٩٤٢ ).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە ئەم ئەثەرەکە:**

**(من تعلق تميمة):** واتە: هەر کەسێک چاوەزارێک هەڵبواسێت بە هەر شتێکەوە، یان دڵی بەو شتەوە پەیوەست بێت.

**(ومن تعلق ودعة فلا ودع الله له):** واتە: هەر کەسێک گوێچکەی ماسی هەڵبواسێت، یان دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە، دەک خوای گەورە  ئارامی و ئیسراحەتی پێ نەدات.

**(رأى رجلا في يده خيط من الحمى):** واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێت پیاوێکی بینی دەزووی لەدەست کردبوو بۆ لادانی تاداری واتە: (نەخۆشی تا).

**هۆکاری باسکردنی فەرموودەکە و ئەثەرەکە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودە و ئەثەرەی باسکردووە، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئەلقە لە دەست کردن دروست نییە و شیرکە.

**سوودەکانی فەرموودەکە و ئەم ئەثەرەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە هەر کەسێک تەمیمە هەڵبواسێت تووشی شیرک بووە بە گوێرەی بیروباوەڕی کەسەکە، حاڵەت هەیە شیرکی بچووکە و حاڵەتیش هەیە شیرکی گەورەیە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەڵواسینی تەمیمە حەڕامە، چونکە دەفەرموویێت: (فلا أتم الله له)، چونکە ئەگەری هەڵگرتنی دوو مانای هەیە:

١- هەندێک دەڵێن ڕستەی خەبەری یە بە مانای دوعا دێت.

٢- هەندێک دەڵێن تەنها خەبەرە.

هەردوو ماناکە بەڵگەن لەسەر حەڕامی هەڵواسینی تەمیمە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ((من تعلق تميمة) واتە: دڵی پەیوەست بێت پێی و پشتی پێ ببەستێت بۆ ڕاكێشانی سوود و لادانی زیان، تەمیمە شتێكە هەڵدەواسرێت بە منداڵەوە لە مۆری و شتی تر بۆ پاراستنی لە چاو.

وتەی: (فلا أتم الله له) ڕستەی خەبەری یە بەمانای دوعا دێت، لەوانەیە تەنها خەبەر بێت، هەردوو ئەگەرەكان بەڵگەن كە تەمیمە حەڕامە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كە ئەوانەی تەمیمە هەڵدەواسن بەردەوام لە قەلەق و وەسواس دان، زۆرینەیان كارەكانیان سەر ناگرێت.

**٤-** واجبە ئینكاری خراپە بكەیت و بیگۆڕی بە دەست ئەگەر بە زمان سوودی نەبوو.

**٥-** دروستە ئایەتێك بكەیتە بەڵگە بۆ شیركی بچووك كەچی هۆكاری دابەزینی ئەو ئایەتە یان ئەو ئایەتە باسی شیركی گەورەیە.

**٦-** ئەمە بەڵگەیە كە هاوەڵان نەرمییان نەنوواندووە بۆ شیرك و سوور بوون لەسەر نەهێشتنی شیرك بەهەموو جۆرەكانییەوە.

---

[1] القول المفيد.

# باب ما جاء في الرقي والتمائم

في (الصحيح) عن أبي بشير الأنصاري رضي الله عنه أنه كان مع رسول الله (ﷺ) في بعض أسفاره، فأرسل رسولا أن لا يبقين في رقبة بعير قلادة من وتر أو قلادة إلا قطعت[١].

وعن ابن مسعود رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إن الرقى والتمائم والتولة شرك) [رواه أحمد وأبو داود][٢].

التمائم: شيء يعلق على الأولاد من العين، لكن إذا كـان المعلـق من القرآن، فرخص فيه بعض السلف، وبعضهم لم يرخص فيه، ويجعله من المنهي عنه، منهم ابن مسعود.

والرقى: هي التي تسمى العزائم، وخص منه الدليل ما خلا من الشرك، فقد رخص فيه رسول الله صلى الله عليه وسلم من العين والحمة.

والتولة شيء يصنعونه يزعمون أنه يحبب المرأة إلى زوجها، والرجل إلى امرأته.

وعن عبد الله بن عكيم مرفوعا: (من تعلق شيئا وكل إليه). [رواه أحمد والترمذي][٣].

---

[١] أخرجه البخارى (٣٠٠٥) ، و مسلم (٢١١٥).

[٢] أخرجه أحمد (٣٨١/١ رقم ٣٦١٥)، وأبو داود (٣٨٨٣)، وابن ماجه (٣٥٣٠)، وابن حبان (٤٥٦/١٣ رقم ٦٠٩٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣٣١).

[٣] رواه أحمد (٣١٠/٤ رقم ١٨٧٨١)، والترمذي (٢٠٧٢)، والحاكم (٢١٦/٤)، والطبراني في "الكبير" (٣٨٥/٢٢ رقم ٩٦٠)، وحسنه الألباني في "غاية المرام" رقم (٢٩٧).

**وروى أحمد عن رويفع قال: قال لي رسول الله (ﷺ): (يا رويفع! لعل الحياة تطول بك، فأخبر الناس أن من عقد لحيته، أو تقلد وترا، أو استنجى برجيع دابة أو عظم، فإن محمدا بريء منه)**[1].

**وعن سعيد بن جبير، قال: (من قطع تميمة من إنسان كان كعدل رقبة) [رواه وكيع]**[2].

**وله عن إبراهيم قال: كانوا يكرهون التمائم كلها، من القرآن وغير القرآن**[3].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الرقي والتمائم.

**الثانية:** تفسير التولة.

**الثالثة:** أن هذه الثلاثة كلها من الشرك من غير استثناء.

**الرابعة:** أن الرقية بالكلام الحق من العين والحمة ليس من ذلك.

**الخامسة:** أن التميمة إذا كانت من القرآن فقد اختلف العلماء هل هي من ذلك أم لا؟.

**السادسة:** أن تعليق الأوتار على الدواب عن العين، من ذلك.

---

[1] أخرجه أحمد (١٠٨/٤ رقم ١٦٩٩٥)، وأبود داود (٣٦)، والنسائي (٥٠٦٧)، وصححه الألباني في صحيح سنن أبو داود (٦٦/١-٦٧).

[2] أخرجه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦/٥ رقم ٢٣٤٧٣).

[3] أخرجه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦/٥ رقم ٢٣٤٦٧)، وأبو عبيد في فضل "فضائل القرآن" (٢٧٢/٢).

**السابعة:** الوعيد الشديد على من تعلق وترا.

**الثامنة:** فضل ثواب من قطع تميمة من إنسان.

**التاسعة:** أن كلام إبراهيم لا يخالف ما تقدم من الاختلاف، لأن مراده أصحاب عبد الله بن مسعود.

# باب ما جاء في الرقى و التمائم

## باسی حوكمی دوعای شیـفا و هەڵواسینی شـت بـۆ چـاوەزار

(الرقى): كۆی روقیەیە، كە بەمانای خوێندنەوە دێت.

(التمائم): تمائم كۆی تمیمەیە، لەبەر ئەوە پێی دەڵێن تەمیمە چونكە بە هەڵواسینی وای دەبینن كە كارەكەیان بۆ تەواو دەبێت و چاوەزار لادەچێت.

پرسیار: بۆچی خاوەنی ئەم كتابە باسی ڕوقیەی كردووە ئایا هیچ پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە؟

وەڵام: زانایان دەڵێن ڕوقیە پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە:

یەكەم: هەندێ ڕوقیە پەناگرتن بە بێجگە لە خوا و پەناگرتن بە جن و مرۆڤی تێدایە.

دووەم: خەڵكی هەندێكیان پشت بە ڕوقیە دەبەستن بە پشت پێبەستنێكی تەواو، باوەڕیان وایە خودی ڕوقیەكە كاریگەرە.

سێیەم: هەندێك لە خەڵك وا گومان دەبەن كە ڕوقیە شافی یە، كە ئەمەش پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕە ڕاستەیە كە خوای گەورە باسیكردووە و فەرموودەش ئاماژەی بۆ كردووە.

چوارەم: هەندێ زانا دەڵێن باش نییە داوای ڕوقیە لە خەڵك بكەیت، هەروەك فەرموودە هاتووە باسی ئەوانە دەكات كە بە بێ سزا و حساب دەچنە بەهەشت، ئەوانەن كە: (لا یسترقون)، واتە: (داوای ڕوقیە لە خەڵك ناكەن).

حوكمی ڕوقیە كردن:

ابن حجر عسقلانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمویت: (هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی کە دروستە ڕوقیە بکرێت کاتێک ئەم سێ مەرجەی تێدا کۆ ببێتەوە:

١- ڕوقیە بە قسەی خوای گەورە بکرێت یان بە ناو و سیفەتەکانی.

٢- بەزمانی عەرەبی بێت یان مانای بزانرێت.

٣- هەروەها باوەڕی وابێت کە ڕوقیەکە خۆی کاریگەری نییە، بەڵکو خوای گەورەیە)[١].

---

[١] فتح الباری (١٠/١٩٥).

**في (الصحيح) عن أبي بشير الأنصاري رضى الله عنه أنه كان مع رسول الله (ﷺ) في بعض أسفاره، فأرسل رسولا أن لا يبقين في رقبة بعير قلادة من وتر أو قلادة إلا قطعت.**

واتە: ئەبو بەشیری ئەنصاری خوای لێ رازی بێت دەگێڕێتەوە کە خۆی لەگەڵ پێغەمبەر دابوو (ﷺ) لە یەکێک لە سەفەرەکانیدا، نێردراوێکی نارد کە بانگەواز بکات: هیچ ملوانکەیەک کە لە پەتە کۆنەکەی دروستکراوە یان گوتی هیچ ملوانەکەیەک لە ملی هیچ وشترێکدا نەمێنێت ئیلا دەبێت بقرتێنرێت و لێ بکرێتەوە.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(أسفاره):** السفر: واتە جیابوونەوە لە شوێنی نیشتەجێ بوون، پێی دەڵێن سەفەر لەبەر دوو شت:

یەکەم: (حسي)، واتە: بەرجەستە، ئەویش ئەوەیە کە مسافر بەدیار دەکەوێت لەشارەکەی لەبەر دەرچوونی لە ماڵەوەی.

دووەم: (معنوي)، واتە: نابەرجەستە، ئەویش ئەوەیە ڕەوشتی پیاو بەدیار دەکەوێت، خەڵک زۆر ڕەوشت و داب و نەریت و سروشتی ناناسێ مەگەر بەسەفەر نەبێت[1].

**(فأرسل رسولا):** واتە: نێردراوێکی نارد.

**(بعير):** واتە: وشتر، وشتری باسکردووە چونکە ئەو کات بەربڵاوبوو، ئەم قەیدە بۆ واقعە وەک تمثیل، نەک بۆ تایبەت کردن بێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

[1] القول المفيد (٢٢٥/١).

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە دروست نییە ملوانکە لە ملی وشتر بکرێت بۆ ڕاکێشانی  سوود و لادانی زیان.

## سوودەکانی فەرمووده‌کە:

**١-** نابێت شت بە ملی ئاژەڵەوە هەڵبواسی بە مەبەستی ئەوەی کە هۆکارە بۆ لادانی زیان و ڕاکێشانی سوود، چونکە شیرکە جا هەڵواسینەکە لە مل یان لە دەست یان لە قاچ بێت، ئەوا هەمان حوکمی هەیە.

کەواتە نابێت ئەم شتانە هەڵبواسی بە ئاژەڵەوە بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە چاوەزار، بەڵام ئایا چارەسەر هەیە یان دەتوانی ڕوقیە لەسەر ئاژەل بخوێنیت بۆ ئەوی پارێزراو بێت لە چاوەزار؟

وەڵام: زانایان دەڵێن دروستە قورئان بخوێنی لەسەر ئاژەڵ بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە چاوەزارو حەسودی، ئەو بەڵگانەی هاتوون گشتین مرۆڤ و ئاژەڵ دەگرێتەوە.

صالح ال شیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ڕوقیە دەرمانە و چارەسەرە تایبەت نییە بە موسڵمان و ذمي (واتە: ئەو کافرەی لە ناو موسڵمانان دا دەژیت سەرانە "جزية" دەدات)، ئەگەر ڕوقیە لەسەر کافرێک بکرێت هیچی تێدا نییە، هەروەها ئەگەر ڕوقیە بۆ ئاژەڵیش بکەیت هیچی تێدا نییە، ئەوە دەرمانە و چارەسەرە)[1].

ابن حجر عسقلانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ابن الجوزی دەڵێت: سەبارەت بە مانای الأوتار چەند لێکدانەوە هەیە:

---

[1] شرح العقيده الطحاوية (١٢٠/٢).

یەکەم: ئەوان پەتیان بە وشتر هەڵدەواسی بۆ ئەوەی تووشی چاوەزار نەبێت، فەرمانی کرد بە بڕینی وەک دیاریکردن بۆ ئەوە کە ئەم هەڵواسینە هیچ لە کاری خوا ناگێڕێتەوە، ئەمە وتەی ئیمام مالیکە.

دووەم: لەبەر ئەوە ڕێگری کراوە بۆ ئەوەی ئاژەڵ نەخنکێت)[1].

زانایان دەڵێن ئەگەر ملوانکەی بێجگە لە پەت بێت و بۆ لێخۆڕینی ئاژەڵ بێت دروستە، لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی پووچی تێدا نییە.

**٢-** ئیمام دەبێت کەسێک بنێریت بۆ گۆڕین یان لادانی خراپە، مەرج نییە مەگەر خۆی بڕوات و لای بدات ئەگەر چی خراپەکە بیروباوەڕیش بێت.

**٣-** واجبە لەسەر ئەو کەسەی دەتوانێت خراپە بە دەست بگۆڕێت بە دەست بیگۆڕێت.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئینکاری کردنی خراپە بە دەست دەبێت بۆ ئەو کەسانەی کە توانایان هەیە، وەک: کاربەدەستان و دەستەیەکی تایبەت بە گۆڕینی خراپە و هەروەها مرۆڤیش لە ماڵی خۆی ئەوەی لە توانای دایە، بەڵام ئەوەی توانای نییە یان ئەگەر بیگۆڕێت بە دەست فیتنەی زیاترە و کێشە دروست دەبێت، ئەمەیان نابێت بە دەست بیگۆڕێت بەڵکو بەزمان بەسە بۆ ئەوەی تووشی خراپەیەکی خراپتر نەبێت لەوەی کە ئینکاری دەکات)[2].

---

[1] فتح الباری (٦/١٦٤-١٦٥).

[2] مجموعة فتاوی ابن باز (٦/٦٤).

**عن ابن مسعود رضى الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إن الرقى و التمائم و التولة شرك) رواه أحمد و أبو داود.**

واته: له ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: گوێم له پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (به تەئكید ئەم روقیه و چاوزارانه و نوشته جۆرێكی شیركن).

## ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(إن الرقى):** ئەلیف و لامی چووەته سەر (الرقى) به مانای گشتی دێت، واته: هەموو ڕوقیەیەک شیركە، هەموو تەمیمەیەک شیركە، هەموو تیوەلەیەک شیركە، كەواته: ئەم جۆرانه هەموویان شیركن، ئەم عمومه تایبەت كراوه بەوەی كه بەڵگەی لەسەر هاتووه دروسته.

**(والتولة):** واته: چاوەزار.

## هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیه لەم بابه:

دانەری كتاب ئەم فەرموودەیەی باسكردووه بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوه هەندێک ڕوقیه و تەمیمه هەن شیركن.

## سوودەكانی فەرموودەكە:

١- هۆكاری گوتنی فەرموودەكە: زەینەبی خێزانی دەڵێت: عبدالله هاته ژوورەوه له پاڵم دانیشت، پاشان دەزوویەكی بینی له گەردەنم دا، گوتی: (ئەمه چییه)؟ گوتم: (دەزوویەكە، دوعایان خوێندووه بۆم بەسەریدا)، ئەویش گرتی و قرتاندی و پاشان گوتی: ئەڵبەته بنەماڵەی عبدالله پێویستیان به شیرک نییه، خۆم گوێ بیستی پێغەمبەری خودا بووم (ﷺ) دەیفەرموو: (به تەئكید ئەم ڕوقیه و چاوزارانه و نوشتەیه جۆرێكی شیركن)

زەینەب دەڵێت: بە عبداللەم گوت چۆن وا دەڵێیت چاوم شت فڕێ دەدا وەک فرمێسک منیش دەچووم بۆ لای ئەو جوولەکەیە، دوعای بۆ دەخوێندم، دواى ئەوە چاوم ئارام دەبوو.

عبدالله وتی: ئەوە تەنها کاری شەیتانە بە دەستی تێی دەژەنێ کاتێ ئەو جۆرە دوعایە بە کاردەهێنێ لێی دەگەڕێت، بەڵکو هەر ئەوەندە بەس بوو کە وەک پێغەمبەری خودا (ﷺ) بڵێیت: (إذهب الباس رب الناس اشف أنت الشافي لا شفاء إلا شفاؤك شفاء لا يغادر سقما).

واتە: (ئەم ناڕەحەتییە لابدە ئەی پەروەردگاری خەڵکی، شیفا ببەخشە تەنها خۆت شیفا دەریت، هیچ شیفایەک نییە مەگەر شیفایەک خۆت بینێریت، شیفایەک بنێرە کە هیچ شوێنەوارێکی نەخۆشیەکە بەجێ نەهێڵێت).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەموو جۆرەکانی ڕوقیە شیرکن، بەڵام فەرموودە هاتووە تایبەتی کردووە.

ابن عثيمين رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: ((إن الرقى) لەسەر عموم نییە، بەڵکو عام مەبەست پێی خاصە، ئەویش ئەو جۆرە روقیەیە شیرکە کە شەرع ڕێگەی نەداوە، ئەوەی شەرع ڕێگەی دابێت شیرک نییە و دروستە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (بەڵام بۆ تمائم هیچ بەڵگە نەهاتوون تایبەتی کردبێت وەک ڕوقیە، کەواتە هەموو جۆرەکانی تمائم شیرکن، لەبەر ئەوەی بەڵگە نەهاتووە ڕێگەی دابێت بە هەندێک جۆریان، ئەسڵ وایە عام لەسەر عمومی ماوە، وە

---

[1] القول المفيد (١/٢٢٦-٢٢٧).

ڕێگەدان و تایبەت کردنی دەبێت بە شەرع بێت، بەڵگە نەهاتووە، کەواتە لەسەر ئەسڵ دەمێنێتەوە)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروستە ڕوقیە بکرێت بە سێ مەرج:

١- دەبێت بە زمانێکی ڕوون و ئاشکرابێت، مانای ئایەت و دوعایەکان زانراو بێت.

٢- پێچەوانەی شەرع نەبێت.

٣- باوەڕی وانەبێت سوود دەگەیەنێت بەهۆی خودی روقیەکە)[٢].

عبدالله بن محمد بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (روقیە سێ جۆرن (بەشن):

١- بەشێکیان حەڕامە و هەندێک جار دەگاتە شیرک.

٢- بەشێکیان دروستە و جیاوازی نییە لەنێوان زانایان.

٣- بەشێکیان جیاوازی هەیە لەسەری لە نێوان زانایان ئایا دروستە یان نا؟ وتەی ڕاست دروست نییە.

روقیە دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

یەکەم: ڕوقیەی ڕێگری کراو: وەک هەڵواسینی پەت یان دەزوو یان شتی تری هاو شێوەی ئەمانە، ئەگەر باوەڕی وابێت هۆکارە بۆ ڕاکێشانی چاکە و بەرەکەت و ڕێگرە لە چاوەزار.

---

[١] التمهيد لاپەرە (١١٤-١١٥).

[٢] شرح كتاب التوحيد.

دووەم: روقیە بە قورئان و سوننەت، ئەمەیان دروستە و هیچ جیاوازی نییە لە نێوان زانایان.

سێیەم: ئەو ڕوقیەیەی کە جیاوازی لەسەری هەیە لەنێوان زانایان ئەوەیە کە قورئان بنوسرێ و هەڵبواسرێ بە نەخۆش، جا چ ئایەت بێت یان دوعا یان زیکر یان ئەوانەی کە فەرموودە باسی کردووە کە شیرکی تێدا نەبێت، ئەم جۆرەیان جیاوازی هەیە هەندێک دەڵێن دروستە و هەندێکیش دەڵێن نابێت، لەوانە ابن مسعود و هاوەڵانی دەڵێن نابێت کە ئەمە وتەی ڕاستە)[1].

**(التمائم): شيء يعلق على الاولاد يتقون به العين، لكن إذا كان المعلق من القرآن فقد رخص فيه بعض السلف، وبعضهم لم يرخص فيه، ويجعله من المنهى عنه، منهم ابن مسعود رضى الله عنه.**

واتە: تەمیمە شتێکە بە منداڵەوە یان بێجگە لە منداڵ هەڵدەواسرێت بۆ لادانی چاوپیسی، بەڵام ئەگەر هەڵواسراوەکە ئایەتی قورئان بوو ئەوا هەندێک لەپێشینەکان ڕوخسەتیان داوە وهەندێکیشیان ڕووخسەتیان نەداوە و نەهیان کردووە، لەوانە ابن مسعود خوا لێی ڕازی بێت.

کەواتە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە هەڵواسینی قورئان و زیکر، بۆ ئەمەش سێ وتە هەیە:

یەکەم: هەندێ زانا دەڵێن هەڵواسینی قورئان و زیکر و دوعا داخلی تەمیمە نابێت و دروستە هەڵیبواسی، کە ئەمە وتەی سعيد بن المسبب ، عطاء، مالك، وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد، ابن عبدالبر، البیهقی، قرطبی، ابن تیمیە، ابن قیم، ابن حجر، ...هتد.

[1] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (١٦٣-١٦٥).

دووەم: هەندێ زانای تر دەڵێن نابێت، کە ئەمە وتەی ابن مسعود و ابن عباس و حذیفة و ابراهیم النخعی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و ابن العربی و عبدالرحمن بن السعدی و الألبانی و ابن باز، ...هتد.

سێیەم: هەندێ زانای تر دەڵێن باشتر وایە ئەمە نەکرێت، ناڵێین حەرامە بەڵکو دەوەستین بۆ حەرام کردن، کە ئەمە وتەی ابن عثیمینە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموێت: (نزیکترین وتە ئەوەیە کە بوترێت ئەمە نەکرێت، بلێی دەگاتە پلەی حەڕامی من دەوەستم لە حەڕام کردنی، بەڵام ئەگەر شتێکی قەدەغە کراوی تێدابوو ئەوە حەڕام دەبێت بەهۆی شتە قەدەغە کراوەکە)[1].

بەڵگەکانی وتەی یەکەم کە دەڵێن دروستە و داخلی تەمیمە نابێت:

١- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ٨٢﴾ [الإسراء: ٨٢]، بەشێوەیەکی گشتی قورئان شیفایە و دروستە هەڵیبواسی.

٢- عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمویت: (أن التميمة ما علق قبل البلاء لا بعده)، واتە: تەمیمە ئەوەیە کە هەڵدەواسرێ پێش هاتنی بەڵا نەک دوای بەڵا.

بەڵگەکانی وتەی دووەم کە دەڵێن حەڕامە و داخلی تەمیمە دەبێت:

١- ئەو فەرموودەیەی نەهی کردووە گشتی یە، هیچ بەڵگە نەهاتوون هەڵواسینی قورئانی تایبەت کردبێت کە دروست بێت.

---

[1] القول المفيد (٢٣٣/١-٢٣٤).

٢- ڕێگری دەکەین بۆ داخستنی دەرگای خراپە و شیرک، چونکە ئەگەر ریگە بدەین بۆ هەڵواسینی قورئان دەرگا دەبێتەوە بۆ هەڵواسینی تەمیمەی شیرکی.

٣- هەڵواسینی قورئان ئەگەری ئەوەی هەیە تووشی بێ ریزی ببێت، چونکە بە منالەوە هەڵدەواسرێت منالّ خۆی لە پیسایی و شوێنی پیس ناپارێزێت، هەروەها نەزانیش بە هەمان شێوە.

٤- ڕێگەدان بە تەمیمەی قورئان ڕێگری کردن لە تەمیمەی شیرکی لاواز دەکات، چونکە ئەگەر بڵێیت هەڵواسینی قورئان دروستە، کەس هەیە دەوەستێت و دەڵێت لەوانەیە قورئان بێت بۆچی ڕێگری لێ بکەم.

٥- هەروەها هەڵواسینی قورئان وا لە موسڵمان دەکات سوننەت پشت گوێ بخات، کە ڕوقیە بەشێوەی خوێندنەوەیە، ئەو دەڵێت ئەمە بەسە تەمیمەم هەڵواسیوە.

صالح ال شیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (هەڵواسینی تەمیمە بەهەموو جۆرەکانیەوە نابێت، ئەگەر لە قورئان بێت ئێمە دەڵێین: وتەی ڕاست ئەوەیە حەڕامە و نابێت، دەبێت ئینکاری لێ بکرێت، ئەگەر بێجگە لە قورئان بێت دەڵێین شیرکە)[1].

کەواتە زانایان دەڵێن هەڵواسینی قورئان ئەگەر بڵێیت حەڕامە شیرک نییە، چونکە قورئان سیفەتی خوای گەورەیە، پەیوەست بوون بە سیفەتی خوای گەورە وەک پەیوەست بوون نییە بە دروستکراوەکانەوە، چونکە قورئان دروستکراو (مخلوق) نییە، بەڵام بێجگە لە قورئان شیرکە چونکە مخلوقن (دروستکراون).

---

[1] التمهيد لاپەرە (١١٩).

**و (الرقى) هي التي تسمى: العزائم، وخص منهما الدليل، ما خلا من الشرك فقد رخص فيه رسول الله (ﷺ) من العين و الحمة.**

واتە: ئەو دوعا و زیکرانەیە کە بە زارەکی دەگوترێت، ئەگەر شیرکی تێدا نەبێت ئەوە دروستە و بەڵگەی تایبەتی لەسەرە، کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ڕوخسەتی پێ داوە بۆ لادانی چاو پیسی یان بۆ چارەسەرکردنی پێوە دراوی دووپشک و مار یان بۆ خۆپاراستن لێیان.

**و(التولة) شيء يصنعونه يزعمون أنه يحبب المرأة إلى زوجها، والرجل إلى إمرأته.**

واتە: شتێکە لای خۆمان پێی دەڵێن "نوشتەی شیرینی" بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ژن لەلای پیاو خۆشەویست دەکات پیاویش لای ژنەکەی خۆشەویست دەکات.

زانایان دەڵێن ڕوقیەی دروست دەبێت بەم شێوەیە بێت:

١- نابێت ڕوقیەی شیرکی بێت.

٢- نابێت ڕوقیەی سیحر بێت.

٣- نابێت ڕوقیە لە لای عەرِاف و کاهن بکرێت ئەگەر چی ساحیریش نەبێت.

٤- دەبێت ڕوقیە وشە و ماناکەی ڕوون بێت.

٥- نابێت ڕوقیە بۆ کەسێک بکەی لە حاڵەتی لەشگرانی یان حیض ونفاسدا بێت، لە ڕۆژگاری خۆمان ئێستا ئافرەتان دەچن بۆ لای هەندێک لە دەجالەکان بۆ ڕوقیە، پێیان دەڵێن بگەڕێوە ئەو کاتە وەرە کە تووشی حیض یان نفاس یان لەشگرانی بووی.

٦- نابێت ڕوقیە بکەیت بە وشەی حەرام وەک جنێو دان و قسەی خراپ و ناخۆش و نەفرەت کردن.

٧- ئەوەی ڕوقیە دەکات و ئەوەی روقیەی بۆ دەکرێت نابێت باوەڕیان وابێت خودی ڕوقیەکە چارەسەرە و نەخۆشی **لا** دەدات.

٨- نابێت ڕوقیە بکەیت لەلای بێجگە لە موسڵمان، لەسەر وتەی هەندێک زانا.

**عن عبدالله بن عكيم مرفوعا: (من تعلق شيئا وكل إليه).**

واتە: عبداللەی کوری عوکەیم دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (هەرکەسێک شتێک هەڵبواسێت بۆ لادانی زیانێک یان بۆ هێنانی سوودێک یان دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە، ئەوا خوای گەورە لێی دەگەڕێت و پشتی بەردەدات و دەیداتە دەست ئەو شتەی پشتی پێی بەستووە).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(من تعلق شيئا):** واتە: هەرکەسێک شتێک هەڵبواسێت بۆ لادانی زیانێک یان بۆ هێنانی سوودێک یان دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە.

نەناسراو هاتووە لە ڕستەی مەرج هەموو شتێک دەگرێتەوە.

**(وكل إليه):** واتە: ئەوا خوای گەورە لێی دەگەڕێت و پشتی بەردەدات و بەتەمای ئەو شتە دەیهێڵێتەوە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە هەر کەسێک شتێک هەڵبواسێت بۆ لادانی زیانێک یان بۆ هێنانی سوودێک یان دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە، ئەوا خوای گەورە لێی دەگەڕێت و پشتی بەردەدات.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک شتێک هەڵبواسێت بۆ لادانی زیانێک یان بۆ هێنانی سوودێک یان دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە، ئەوا خوای گەورە لێی دەگەڕێت و پشتی بەردەدات.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمویت: ((شيئا)): نەناسراوە و ڕستەکە ڕستەی مەرجە، مانای گشتی هەڵدەگرێت، کەواتە هەموو شتێک دەگرێتەوە.

جۆرەکانی پەیوەست بوون بە بێجگە لە خوا:

یەکەم: (دژی بنچینەی یەکخواپەرستی): ئەویش ئەوەیە کە پەیوەست بێت بە شتێک ئەو شتە کاریگەری نییە و پشتی پێ ببەستی بە جۆرێک پشت لەخوا بکەیت، وەک: پەیوەست بوونی گۆڕپەرستان کاتی ناخۆشی، لەبەر ئەوە ئەگەر ناخۆشیەکی توونديان بەسەر بێت دەڵێن: ئەی فلانە کەس ڕزگارمان بکە، گومانی تێدا نییە ئەمە شیرکی گەورەیە و لە دین دەردەچێت.

دووەم: (دژی تەواوی یەکخواپەرستی یە): ئەویش ئەوەیە پشت بە هۆکارێکی ڕاستی شەرعی ببەستی لەگەڵ ئەوەش بێ ئاگا بێت لەوەی کە ئەوەی هۆکاری بۆت ڕەخساندووە خوایە، هەروەها دڵت بۆ لای ئەو نەچوو بێت، ئەمەیان جۆرێکی شیرکە، ئێمە ناڵێین شیرکی گەورەیە، چونکە ئەمە هۆکارێکە خوای گەورە دایناوە و کردوویەتیە هۆکار بۆ ئەوەی بیگریتەبەر.

سێیەم: (پەیوەست دەبێت بەهۆکار پەیوەست بوونێک  تەنها وەک هۆکار): لەگەل ئەمە پشتی خۆی بە تەواوی بە خوا بەستووە، باوەڕی وایە ئەم هۆکارە لە خواوەیە، خوای گەورە ئەگەر بیەوێت پووچی دەکاتەوە و ئەگەر بیەوێت دەی هێڵێتەوە و هیچ کاریگەری لەسەر هۆکار نییە مەگەر بە ویستی خوا نەبێت، ئەمەیان نەفی تەواوی یەکخواپەرستی و بنچینەی یەکتخواپەرستی ناکات، لەسەر ئەمە تاوانی تێدا نییە

له فەرموودەکە هاتووە: (من تعلق) نەی وتووە: (من علق)، چونکە متعلق بوون بە شتێک متعلق بوونی بە دڵ و نەفسی لەگەل دایە)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە پشت بە خوا ببەستیت و نەهی کراوە پشت بە بێجگە لە خوا ببەستیت بۆ ڕاکیشانی خێر و لادانی زیان[٢].

---

[١] القول المفيد (١/٢٣٠).

[٢] إعانة المستفيد (١/٢٠٣).

**وروى أحمد عن رويفع قال: قال لي رسول الله (ﷺ): (يا رويفع، لعل الحياة ستطول بك، فأخبر الناس أن من عقد لحيته، أو تقلد وترا، أو استنجى برجيع دابة، أو عظم، فإن محمدا برئ منه)[1].**

واتە: ڕوەیفع خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە منی فەرموو: (ئەی ڕوەیفع ئۆمێد هەیە تەمەنت درێژ بێت ئەو کاتە خەڵکی ئاگادار بکەوە کە هەر کەسێک ڕیشی گرێ بدات (بۆ فەخر و شانازی یان لە ترسی چاو) یان پەتی تیر و کەوانەکەی بکاتە ملی وشتر، یان بە پاشەڕۆی ئاژەڵ یان بە ئێسقان خۆی پاک بکاتەوە لە پیسایی، ئەوە ڕای بگەینە کە محمد (ﷺ) لەو کەسە بەرییە.)

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(من عقد لحيته):** واتە: هەر کەسێک ڕیشی گرێ بدات بۆ فەخر و شانازی یان لە ترسی چاو.

**(تقلدا وترا):** واتە: پەتی تیر و کەوانەکەی بکاتە ملی وشتر.

**(استنجى برجيع دابة، أو عظم):** واتە: بە پاشەڕۆی ئاژەڵ یان بە ئێسقان خۆی پاک بکاتەوە لە پیسایی.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

---

[1] رواه احمد (١٦٩٩٥)، وابو داود(٣٦)، والنسائي(٥٠٦٧).

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە پەتی تیر و کەوانە لە ملی وشتر کردن لە تاوانە گەورەکانە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت ڕیش گرێ بدرێت بۆ فەخر و شانازی یان لە ترسی چاو.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ڕیش لە لای عەرب نە کورت دەکرا نە دەتاشرا، هەر وەک چۆن ئەمە سوننەتە، بەڵام ئەوان ڕیشیان گرێ دەدا لەبەر چەند هۆکارێک:

یەکەم: بۆ شانازی و فەخر و خۆ بە گەورە دانان، دەتبینی یەکێک لەوان لایەکی ڕیشی گرێ دەدا یان لە ناوەڕاست گرێی دەدا بە یەک گرێ، بۆ ئەوەی بزانن پیاوێکی گەورەیە یان سەییدە لە ناو قەومەکەی.

دووەم: لە ترسی چاوەزار ڕیشی دەکردە گرێ، چونکە ڕیش ئەگەر جوان بێت و ڕێک بێت بە کردنە گرێ ناشیرین دەبێت، هەرکەسێک لەبەر ئەمە بیکاتە گرێ ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) لێی بەرییە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (جیاوازی هەیە لە تەفسیری گرێدانی ڕیش:

یەکەم: ڕیش گرێ دان عادەت بوو لای فارسەکان، ئەوان کاتی جەنگ ڕیشیان دەکردە گرێ وەک فەخر و شانازی و خۆ بەگەورە دانان، ئێمە ڕێگریمان لێ کراوە خۆمان بچوێنین بە کافران.

---

[1] القول المفيد (١/٢٣٦-٢٣٧).

دووەم: مەبەستی فەرموودەکە ڕیش کردنە گرێیە لە ناو نوێژ، چونکە ئەمەیان مشغول بوون و جوولە کردنە لەناو نوێژ، ئەمەیان باش نییە، چونکە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی خشوع.

سێیەم: مەبەست بە گرێ دانی ڕیش ئەوانەیە کە بە دوای خۆشی کەوتوون و زیادەڕەوی دەکەن لە جوان کردن و ناشرین کردنی ڕیش هەتا خۆیان ناشرین دەکەن کەچی مەبەستیشیان جوانی یە، بەڵێ هیچی تێدا نییە ڕیشی خۆت ڕێک بخەیت و خاوێنی بکەیت و ڕێزی لێ بگریت بەڵام نەگاتە سنوری ئیسراف)[1].

زانایان دەڵێن ڕیش کردنە گرێ بۆ بێجگە لەم مەبەستانە ئەگەر پێوست بکات دروستە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خۆ پاککردنەوە بە پاشەڕۆی ئاژەڵ یان بە ئێسقانی لە تاوانە گەورەکانە.

وتەی: (أو استنجى برجيع و دابة أو عظم): (الاستنجاء): وەرگیراوە لە (النجو)، واتە: لادانی پاشماوەیە لە پێش و پاشەوەی مروڤ.

زانایان دەڵێن لە بەر دوو هۆکار ڕێگری کراوە لەوەی خۆت پاک بکەیتەوە بە پاشەڕۆی ئاژەڵ و ئێسقان:

یەکەم: ئەگەر پاشەڕۆی ئاژەڵ هی ئاژەڵێک بێت پاشەڕۆی پیس بێت، ئەوە لەبەر پیسی نابێت خۆتی پێ خاوێن بکەیت، چونکە پیسی مرۆڤ خاوێن ناکات، ئێسقانی ئاژەڵیش بە هەمان شێوە ئەگەر هی ئاژەڵێک بێت گۆشتی نەخورێت یان مردار بووبێت، ئەمەیان نابێت، چونکە ئێسقانەکە پیسە.

---

[1] إعانة المستفيد (٢٠٨/١).

دووەم: ئەگەر پاشەڕۆی ئاژەڵ هی ئاژەڵێک بێت پاشەڕۆی خاوێن بێت، وەک پاشەڕۆی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان دەخورێت، ئەمەیان نابێت خۆتی پێ خاوێن بکەیت، چونکە خواردنی ئاژەڵانی جنۆکەیە، ئێسقانی ئاژەڵیش بەهەمان شێوە ئەگەر هی ئاژەڵێک بێت گۆشتی بخورێت ئەمەیان نابێت، چونکە خواردنی جنۆکەیە هەروەک فەرموودە هاتووە و ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە.

ابن عثيمين رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (ئەگەر یەکێک بڵێت: ئایا دەتوانی قیاسی بکەی و بڵێی کەواتە حەرامە خۆت خاوێن بکەیتەوە بە خواردنی ئاژەڵانی مرۆڤەکان؟

وەڵام: بەڵێ قیاسی دەکەین و قیاسەکە ڕوون و ئاشکرایە، چونکە ئەگەر دروست نەبێت خواردنی ئاژەڵانی جنۆکە پووچ بکەیت کە ئەوان عالەمێکی شاراوەن، ئەوا خواردنی ئاژەڵانی مرۆڤ لە پێشترە کە نابێت خۆتی پێ خاوێن بکەیت.

ئەگەر یەکێک بڵێت: ئایا قیاسی دەکەی ئەم ڕێگریە لە خۆ خاوێن کردن بە ئێسقان لەسەرخۆ خاوێن کردن بە خواردنی مرۆڤەکان، وەک گۆشت یان هەر خواردنێکی تری هاوشێوەی ئەمانە؟

وەڵام: بەڵێ قیاس کردنەکە ڕوونتر و دیارترە، چونکە ئەگەر پووچ کردنی خواردنی جنۆکە حەڕام بێت، ئەوا پووچ کردنی خواردنی مرۆڤەکان لە پێشترە کە حەرام بێت)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بڵاوکردنەوەی زانست واجبە و شاردنەوەشی حەڕامە.

---

[1] فتح ذي الجلال والإكرام (٥٢٤/١).

عبدالله بن محمد بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، بە جۆرێک هەواڵی داوە بە شتێک پێش ڕوودانی، تەمەنی ڕووەیفع درێژ بوو ...

(فأخبر الناس): بەڵگەیە ئەوەی زانستی لابێت دەبێت بڵاوي بکاتەوە و ڕوونی بکاتەوە بۆ خەڵک و حەڕامە بیشارێتەوە, ئەمەیان تایبەت نییە بە ڕوەیفع بەڵکو گشتی یە)[1].

**٤-** هەندێ زانا ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە دروست نییە مرۆڤ خۆی بپارێزیت لە چاوپیس بە خۆ لێ شاردنەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەو کەسە بەرییە کە ڕیشی دەکاتە گرێ لە ترسی چاوەزار.

هەندێ زانا دەڵێن دروستە خۆت بپارێزی لە چاو پیس بە خۆ لێ شاردنەوە یان هەر هۆکارێکی تری ڕێگە پێدراو، چونکە یعقوب (علیه السلام) بە مناڵەکانی ووت هەمووتان لە یەک دەرگاوە مەچنە ژوورەوە، زۆر لە ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن یعقوب لە ترسی چاوەزار وای وتووە.

زانایان دەڵێن ئەوەی گرینگ بێت و چارەسەر بێت بۆ چاوەزار بەمەبەستی خۆ پاراستن بریتی یە لە خوێندنەوەی قورئان و چەند سورەتێکی تایبەت و زیکری بەیانیان و ئێواران، نەک خۆشاردنەوە لە چاوەزار یان لێ ترسانی، ڕاستە چاوەزار حەقیقەتی هەیە و کاریگەری لەسەر مروڤ هەیە، بەڵام نابێت لە ترسان و خۆ شاردنەوە لە چاوەزار سنور ببەزێنرێت، بەڵکو دەبێت پشت بە خوا ببەسترێت، چونکە هەموو شت بە دەست خوای گەورەیە.

---

[1] شرح کتاب التوحید لاپەرە (١٧٢).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەم کردەوانە لە تاوانە گەورەکانن، چونکە وەعید هاتووە دەفەرموویت: (فإن محمدا بريء منه)[١].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ نیشانەیەک لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، چونکە خەبەری داوە بۆ شتی داهاتووە، ڕووەیفع تەمەنی درێژ بوو.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پەتی تیر و کەوانە لە ملی وشتر کردن لە تاوانە گەورەکانە، ئەگەر مەبەستی ڕاکێشانی سوود یان لادانی زیانی هەبێت.

**عن سعيد بن جبير قال: (من قطع تميمة إنسان كان كعدل رقبة)، رواه وكيع.**

واتە: (هەر کەسێک چاوەزارێک بپچڕێنێت بە هەر شتێکەوە بێت، پاداشتەکەی وەک ئەوە وایە کۆیلەیەکی ئازاد کردبێت).

صالح ال الشيخ دەفەرموویت: (ئەم وتەیە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە هاوەڵان بیستویەتی خوا لە هەموویان ڕازی بێت، چونکە ئەم قسەیە ناگوترێت بە بیرورِا، ئەگەر وابێت ئەوا حوکمی مورسەلی هەیە، چونکە پاداشتێکی تایبەتی تێدایە سەعیدی کوڕی جوبەیر باسیکردووە بۆ ئەو کەسەی تەمیمە دەبرِێت لە مرۆڤ ...

سەبارەت بە فەرموودەی مورسەل ئایا دەبێتە بەڵگە یان نا وتە هەیە: ئیمام ئەحمەد و مالک مورسەل دەکەنە بەڵگە، هەروەها ئەبو حەنیفەش دەیکاتە بەڵگە، وە هەیە مەرج بۆ مورسەل دادەنێت وەک شافعی، هەندێک ئەوە دەکەنە بەڵگە ئەگەر ماناکەی زانراو بێت وەک ئەوەی ئێرە واتە وەک ئەمەی لەم کتابە باس کراوە)[٢].

---

[١] التمهيد لاپەرە (١٢١).
[٢] التمهيد لاپەڕە (٢٢).

**وله عن ابراهيم قال: كانوا يكرهون التمائم كلها، من القران و غير القران.**

واتە: هاوڕێیانی عبدالله بن مسعود و قوتابییەکانی چاوەزاری هەڵواسراویان بە مەکروه داناوە، جا چ لە قورئان بێت یان بێجگە لە قورئان.

صالح الفوزان خوا بیپارێزیت دەفەرمووێت: ((یکرهون): واتە: بە حەڕامیان دادەنا، چونکە وشەی کەراهەت لەلای ئەوانەی پێش ئێمە مەبەستیان پێی حەڕام بوو)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (گەورەیی پاداشتی ئەو کەسەی چاوەزارێک لە مرۆڤێکەوە لێ بکاتەوە، لەبەر وتەی سعیدی کوری جوبەیر دەڵێت: (کان کعدل رقبه)، واتە: وەک ئەوە وایە کۆیلەیەکی ئازاد کردبێت، بەڵام ئایا ئەم وتەیە حوججەیە یان نا؟

ئەگەر بڵێی حوجە نییە، چۆن دانەری کتاب دەڵێت: گەورەیی پاداشتی هەر کەسێک چاوەزارێک بە مرۆڤێکەوە لێ بکاتەوە؟!

دەوترێت: ئەوەیە کە ئەوەی دانەری کتاب گوتوویەتی، چونکە ڕزگارکردن لە بەندایەتی شیرک هەروەک ئازاد کردن وایە بەڵکو زیاتر لەوە لە بابەتی قیاس، هەرکەسێک نەفسێک ڕزگار بکات لە شیرک ئەوە هەروەک ئەوە وایە ڕزگاری کردبێت لە بەندایەتی، چونکە ڕزگاری کردووە لە بەندایەتی شەیتان و هەواو ئارەزوو)[٢].

---

[١] إعانه المستفيد بشرح كتاب التوحيد.

[٢] القول المفيد (٢٤٤/١).

## باب من تبرك بشجرة أو حجر ونحوهما

**وقول الله تعالى:** ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴾ [النجم: ١٩]

**عن أبي واقد الليثي، قال: خرجنا مع رسول الله (ﷺ) إلى حنين ونحن حدثاء عهد بكفر، وللمشركين سدرة يعكفون عندها وينوطون بها أسلحتهم، يقال لها: ذات أنواط، فمررنا بسدرة فقلنا: يا رسول الله أجعل لنا ذات أنواط كما لهم ذات أنواط فقال رسول الله (ﷺ): (الله أكبر! إنها السنن، قلتم ـ والذي نفسي بيده ـ كما قالت بنو إسرائيل لموسى:** ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [الأعراف: ١٣٨]، **لتركبن سنن من كان قبلكم). {رواه الترمذي وصححه}.**[1]

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية النجم.

**الثانية:** معرفة صورة الأمر الذي طلبوا.

**الثالثة:** كونهم لم يفعلوا.

**الرابعة:** كونهم قصدوا التقرب إلى الله بذلك، لظنهم أنه يحبه.

**الخامسة:** أنهم إذا جهلوا هذا فغيرهم أولى بالجهل.

**السادسة:** أن لهم من الحسنات والوعد بالمغفرة ما ليس لغيرهم.

---

[1] أخرجه الترمذي (٢١٨٠)، وأحمد (٢١٨/٥ رقم ٢١٨٩٧)، والنسائي "الكبرى" (٣٤٦/٦ رقم ١١١٨٥)، وصححه الألباني في "صحيح سنن الترمذي" (٢٣٥/٢).

**السابعة:** أن النبي (ﷺ) لم يعذرهم، بل رد عليهم بقوله: (الله أكبر إنها السنن، لتتبعن سنن من كان قبلكم) فغلظ الأمر بهذه الثلاث.

**الثامنة:** الأمر الكبير، وهو المقصود: أنه أخبر أن طلبتهم كطلبة بني إسرائيل لما قالوا لموسى: ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ١٣٨﴾. (إلى حنين ونحن حدثاء عهد

**التاسعة:** أن نفي هذا معنى (لا إله إلا الله)، مع دقته وخفائه على أولئك.

**العاشرة:** أنه حلف على الفتيا، وهو لا يحلف إلا لمصلحة.

**الحادية عشرة:** أن الشرك فيه أكبر وأصغر، لأنهم لم يرتدوا بهذا.

**الثانية عشرة:** قولهم: (ونحن حدثاء عهد بكفر) فيه أن غيرهم لا يجهل ذلك

**الثالثة عشرة:** التكبير عند التعجب، خلافا لمن كرهه.

**الرابعة عشرة:** سد الذرائع.

**الخامسة عشرة:** النهي عن التشبه بأهل الجاهلية.

**السادسة عشرة:** الغضب عند التعليم.

**السابعة عشرة:** القاعدة الكلية، لقوله (إنها السنن).

**الثامنة عشرة:** أن هذا علم من أعلام النبوة، لكونه وقع كما أخبر.

**التاسعة عشرة:** أن كل ما ذم الله به اليهود والنصارى في القرآن أنه لنا.

**العشرون:** أنه متقرر عندهم أن العبادات مبناها على الأمر، فصار فيه التنبيه على مسائل القبر. أما (من ربك)؟ فواضح، وأما (من نبيك)؟ فمن إخباره بأنباء الغيب، وأما (ما دينك)؟ فمن قولهم: (اجعل لنا إلها) إلخ.

**الحادية والعشرون:** أن سنة أهل الكتاب مذمومة كسنة المشركين.

**الثانية والعشرون:** أن المنتقل من الباطل الذي اعتاده قلبه لا يؤمن أن يكون في قلبه بقية من تلك العادة لقولهم: ونحن حدثاء عهد بكفر.

# باب من تبرك بشجر او حجر او نحوهما

## هەر کەسێک تەبەڕوک بکات بە بەردێک یان دارێک یان هەر شتێکی لەو بابەتانە ئەوە شیرکی بۆ خوا بڕیار داوە

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (بەرەکەت: بریتی یە لە خێرێکی زۆر یان جێگیر بوون و مانەوەی، وەرگیراوە لە (البركة) کەسرەی لە ژێرە و (البركة): ئەو شوێنەیە کە ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە و لەخۆ دەگرێت، ئەم ئاوە لە ئاوەکەی تر کە لەبەری دەروات جیا دەکرێتەوە بە دوو شت:

١- زۆری ئاوەکە.

٢- جێگیر بوونی ئاوەکە.

(شجر) اسم جنس، هەموو دارێک دەگرێتەوە، یەکێک لە چاکەکانی ئەمیری ئیمانداران عومەری کوری خطاب خوا لێی رازی بێت ئەوەبوو کاتێک خەڵکی بینی نزیکە تووشی فیتنە دەبن، فەرمانی کرد بە بڕینی ئەو دارەی کە بەیعەتی لەژێر درابوو.

(حجر) اسم جنس هەموو بەردێک دەگرێتەوە تا ئەو بەردەی لە (بيت المقدس)یش تەبەڕوکی پێ مەکە، هەروەها بەردی ڕەش (حجر الاسود) تەبەڕوکی پێ مەکە، بەڵکو بەندایەتی بۆ خوای گەورە پێی دەکەیت بە دەست لێدان و ماچ کردن وەک شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) بەرەکەتی پاداشت بەمەیان بە دەست دێت، لەبەر ئەوە عومەر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (من دەزانم تۆ بەردێکی نە زیان دەگەینی نە سوود، ئەگەر پێغەمبەرم (ﷺ) نەبینیبا تۆی ماچ کردووە، منیش تۆم ماچ نەدەکرد)، ماچی کردووە تەنها وەک عیبادەت بە پێچەوانەی خەڵکی نەزان کە وا گومان دەبەن بەرەکەتی بەرد

بەرجەستەیە (حسية)، لەبەرئەوە هەندێکیان کاتێک دەست لە بەرد دەدەن هەموو لاشەی خۆیانی پێ مسح دەکەن وەک تەبەڕوک کردن بە بەرد.

(ونحوهما) واتە: ماڵ و قوببە و بەرد و هەتا حوجرەی گۆڕی پێغەمبەریش (ﷺ) مەسحی پێ مەکە وەک تەبەڕوک، بەڵام ئەگەر مەسحی ئاسن بکەی بۆ ئەوەی سەیری بکەیت یان بزانیت ئایا لوسە یان نا، ئەمە هیچی تێدا نییە، مەگەر ترسی ئەوەی هەبێت خەڵکی تر شوێنی بکەون، ئەوا ئەو کات مەسح مەکە)[1].

زانایان دەڵێن تەبەڕوک کردن بە گۆڕ و دار و بەرد ئەم سێ حاڵەتانەن:

یەکەم: ئەگەر کەسێک تەبەڕوکی کرد بە گۆڕ یان بەرد، دارو بەردی بە لاشەی خۆیدا هێنا، ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت ئەمە وەسیلەیە بۆ لای خوای گەورە و لێی نزیک دەبێتەوە بەم کردەوەیە  شەفاعەتی بۆی دەکەن، یان باوەڕی وابێت بەرەکەت لە خودی گۆڕ و دار و بەردەکەوە دێت نەک لەلایەن خواوە، ئەمەیان شیرکی گەورەیە و شیرکە لە پەروەردگارییێتی دا، چونکە بەرەکەت هەمووی لە خواوەیە و بەدەست خوایە.

دووەم: ئەگەر تەبەڕوکی کرد بە گۆڕ و دار و بەرد، دواتر بە لاشەی خۆیدا هێنا، ئەگەر مەبەستی ئەوەی نەبێت بەم کارە لە خوا نزیک دەبێتەوە و پێی دەگات و باوەڕیشی وایە کە بەرەکەت لە لایەن خواوەیە، ئەمە شیرکی بچووکە.

سێیەم: ئەگەر لاشەی خۆی بە گۆڕ یا بە دارێک یا بە پەرۆیێک دا هێنا کە بە ناوبانگە و خەڵک تەبەڕوکی پێ دەکەن، ئەمەیان دروست نییە ئەگەر هیچ مەبەستێکیشی نەبێت و بیروباوەڕیشی پاک بێت، چونکە خۆ چوواندنە بە ئەهلی شیرک.

---

[1] القول المفيد (١/٢٤٥-٢٥٢).

صالح ال الشيخ خوای گەورە بیپارێزیت دەفەرموویێت: (تەبەڕوک کردن بە دار یان بە بەرد یان بە گۆڕ یان شوێنی تر جار هەیە شیرکی گەورەیە و جار هەشە شیرکی بچووکە.

دەبێتە شیرکی گەورە ئەگەر داوای بەرەکەتی لێ بکات و باوەڕی وابێت بە مەسح کردن بەم دارە یان بەم بەردە یان بە فلانە گۆڕ یان خۆ گەوزاندن لەسەری یان خۆ پێوە نووساندن دەبێتە واستە و وەسیلە بۆی لای خوای گەورە، ئەمەیان بە شەریک دانانە لەگەڵ خوا و شیرکی گەورەیە، ئەمەیان ئەو شیرکە بووە ئەوەی کە موشریکەکان هەیان بوو لەسەردەمی نەزانین بۆ دارو بەرد کە دەیانپەرستن.

هەروەها دەبێتە شیرکی بچووک ئەگەر تەبەڕوک بکات بە خۆڵ یان بە لاشەی خۆیەوە بنوسێنێت یان شتی تری لەو بابەتە بە هۆکار دابنێت بۆ بەدەست هاتنی بەرەکەت بێ ئەوەی باوەڕی وابێت بەم کارە دەگات بە خوا و نزیک دەبێت لێی، واتە تەنها کردوویەتی بە هۆکار وەک ئەوەی تەمیمەی لەبەر کردووە یان حەلقە یان دەزوو)[1].

هەندێک جۆری تەبەڕوکی ڕێگە پێ نەدراو (قەدەغەکراو):

یەکەم: سەردانی گۆڕ نەک وەک سەردان کردن، بەڵکو بە مەبەستی دوعا کردن لە لای گۆڕ لەبەر بەرەکەتەکەی، بیرباوەڕی وایە دوعا کردن لە لای گۆڕ باشترە.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (بۆ نموونە کەسێک دەچێت بۆ (حەڕاء) بۆ ئەوەی نوێژ و دوعای تێدا بکات، یان سەفەر دەکات بۆ ئەشکەوتی (ثور) بۆ ئەوەی نوێژ و دوعای تێدا بکات، یان دەچێتە (کێوی طور) ئەو کێوەی خوای گەورە لەوێ قسەی لەگەل موسی کرد بۆ ئەوەی نوێژ و دوعای لەوێ بکات، ئەمانە دروست نیین.

---

[1] التمهید لاپەرە (١٣١-١٣٢)..

ئەوەی زانراو بێت ئەگەر ئەم جۆرە سەردان کردنانە سوننەت بوونایە خوای گەورە پاداشتی لەسەر دادەنا و پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو خەڵک زاناتر دەبوو بۆ ئەم بابەتە و پێش هەمووان ئەم کارەی دەکرد، ئەگەر وا بوایا هاوەڵانیشی زانستیان پێ دەبوو، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) زاناتر بوون بۆ ئەم جۆرە بابەتانە و بە ئارەزووتر بوون بۆ جێ بەجێکردنی لەوانەی دوای خۆیان، لەبەر ئەوە ئەوان ئاوڕیان لەو جۆرە شتانە نەداوەتەوە و نەیان کردووە، چونکە زانیویانە ئەمە بیدعەیە و شتێکی داهێنراوە)[1].

دووەم: تەبەڕوک کردن بە پیاوچاکان و بە ئاسەواریان، نەقل نەکراوە هاوەڵان تەبەڕوکیان کردبێت بە عەرەق و جل و بەرگی ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان و هاوەلانی تر، بەڵکو تەنها بە پێغەمبەر (ﷺ) کراوە.

سێیەم: تایبەت کردنی هەندێ کات بە هەندێک جۆری عیبادەت کە ڕێگەپێدراو نییە یان بە گەورە دادەنرێت وەک ڕۆژی لە دایک بوونی پێغەمبەر (ﷺ) و ڕۆژی ئیسرا ومعراج و رۆژی کۆچ کردن، تەبەڕوک کردن پێیان و بەم شێوەیە و بەم جۆرە شتانە داهێنراوە.

زانایان دەڵێن دروستە تەبەڕوک بە پێغەمبەر بکەی، بەڵگە:

- پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مینا و رەجمی شەیتانی کرد، پاشان هاتەماڵەکەی خۆی لە مینا و ئاژەڵی سەربڕی، پاشان بە سەرتاشی وت: (بگرە)، ئاماژەی بۆ لای ڕاستی سەری کرد پاشان چەپ، پاشان مووی سەری دا بە خەڵک. رواه مسلم.

[1] اقتضاء الصراط المستقيم لاپەرە (٤٢٤-٤٢٦).

ریوایەت هاتووە: سەرتاش لای ڕاستی قژی لێ کردەوە، پاشان بانگی باوکی طلحەی کرد و مووەکانی پێیدا، پاشان لای چەپی دا بە حەلاق پێی گوت: (ببڕە) حەلاق قژی بڕی و دای بە باوکی طلحە و پێی وت: (دابەشی بکە بەسەر خەڵکیدا)[١].

- عوروە بە وردی سەیری هاوەڵانی پێغەمبەری کرد بە هەردوو چاوەکانی، دەڵێت سوێند بەخوا پێغەمبەر هەر تفێکی بکردبا ئیلا دەکەوتە ناو دەستی یەکێک لە هاوەڵان و دەم و چاو و پێستی خۆیانیان پێ مسح دەکرد، ئەگەر فەرمانی پێ بکردبان بە پەلە جێ بە جێیان دەکرد، ئەگەر دەست نوێژی هەڵبگرتبا نزیک بوو ببێتە شەڕیان لەسەر ئاوی دەست نوێژی پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێک قسەیان دەکرد دەنگیان نزم دەکرد لە لای، عوروە گەڕایەوە لای هاوەڵانی خۆی و وتی: ئەی قەوم سوێند بە خوا من بە وەفد چوومەتە لای پادشاکان، چوومەتە لای قەیسەر و کیسرا و نجاشی، سوێند بە خوا هیچ پادشایەکم نەبینیووە هاوەڵانی بەگەورەیان زانیبێت بەقەد هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا تفی بکردبا ئیلا دەکەوتە ناو دەستی پیاوێک لەوان، ڕوخسار و پێستی خۆیانیان پێ مەسح دەکرد، هەرکاتێک فەرمانی دەربکردبا بە پەلە جێ بەجێیان دەکرد، کاتێک دەست نوێژی هەڵدەگرت نزیک بوو ببێتە شەڕیان لەسەرئاوی دەست نوێژەکەی و کاتێک قسەیان دەکرد دەنگیان نزم دەکرد[٢].

ڕیوایەت هاتووە: (ولا يسقط من شعره إلا أخذه)، واتە: هەر موویەکی کەوتبا ئیلا هەڵیان دەگرت بۆ خۆیان.

---

[١] رواه مسلم.

[٢] رواه البخاري (٢٧٣٣-٢٧٣٢).

خەڵکانێک تەبەروک بە ئاوی زەم زەم دەکەن و بەلا شەی خۆیان دا دەپیرژێنن ئایا ئەمە دروستە؟

وەڵام: گومانی تێدا نییە ئاوی زەم زەم موبارەکە و خواردنەوەی شیفایە بۆ نەخۆشی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (إنها مباركة، إنها طعام طعم)[1].

واتە: ئاوی زەم زەم ئاوێکی موبارەکە و خواردنیشە.

ڕیوایەت هاتووە دەفەرمووێت: (وشفاء سقم)، واتە: چارەسەرە بۆ نەخۆشی، مانای فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت چارەسەرەکە تایبەت نییە بە خواردنەوە، بەڵگە:

(أبي جمرة الضبعي) دەفەرمووێت: دانیشتبووم لە لای ابن عباس لە مەککە نەخۆشی (تا) گرتمی، ابن عباس گوتی ئەو تایە سارد بکەوە بە ئاوی زەم زەم، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (الْحُمّى مِنْ فَيْحِ جَهَنّمَ فَأَبْرِدُوهَا بِالْمَاءِ)، أو قال: (بماء زمزم)، واتە: تا لە هەناسەی دۆزەخە ساردی بکەوە بەئاو یان ئاوی زەم زەم.

کەوایە دروستە ئاوی زەم زەم و ئاوی تر بەکاربهێنی بە مەبەستی چارەسەری نەخوشی تا یان نزمکردنەوەی گەرمی تا، بەڵام ئاوی زەم زەم پرژاندن بە لاشەی خۆت و بەمەستی ئەوەی کە ئاوێکی موبارەکە ئەمە نەکرێت باشترە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر یەکێك بڵێت ئایا شتێک بکەم وەکو پرژاندنی ئاوی زەم زەم بەسەر لاشە یان جل و بەرگ یان قوماشی پێ بشۆین بۆ ئەوەی بیکەن بە کفن هەروەك خەڵکانێک ئەمەیان کردووە پێش ئێمە؟

---

[1] رواه مسلم (٢٤٧٣).

وەڵام: ئێمە دەڵێین نەخێر ئێمە پێش ناکەوین و تێناپەڕین لەوە زیاتر کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) جێگیر بووە، ئەمەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) جێگیر نەبووە ئێمەش پێش ناکەوین و تێناپەڕین، ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) جێگیر بوویێت وەری دەگرین ئەگەرنا وەری ناگرین)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (خوای گەورە ڕێگەی داوە بە تەبەڕوك کردن بە ئاوی زەم زەم و موبارەکی کردووە بەڵام لەسەر ئیماندار واجبە دەست بە شەریعەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بگرێت و خۆی بپارێزێت لە پێچەوانە کردنی)[٢].

کەواتە ئەگەر بڵێین باشتر وایە واز لەمسح کردنی لاشە بهێنی بەئاوی زەم زەم کە مبارەکە و جیاوازە لەگەڵ ئاوی تر، ئەوە ئاوی باران لەپێشترە وازی لێ بهێنرێت و بەلاشەی خۆتی دامەهێنە وەک تەبەڕوک.

عن أَنَسٍ رضى الله عنه قَالَ: (أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَطَرٌ قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثَوْبَهُ حَتَّى أَصَابَهُ مِنْ الْمَطَرِ. فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لِمَ صَنَعْتَ هَذَا قَالَ: لِأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعَالَى)[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالک دەفەرموویێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووین کە بارانمان بەسەر داباری ئەنەس دەڵێت جلی خۆی لادا تاباران بەر لاشەی بکەوێت، ئێمەش وتمان: بۆچی وات کرد؟ ووتی: (ئەو بارانە تازە لای پەروەردگارەوە هاتووە).

---

[١] شرح الممتع (٣٤٨/٧).
[٢] مجله البحوث الاسلامية ژمارە (٥٧) لاپەڕە (١٢٥).
[٣] رواه مسلم.

(فحسر ثوبه): يعني رفعه حتى اصابه من المطر، واته: بەرزی كردەوە هەتا باران بەری كەوت.

ابن عثیمین رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (شوێنی لادانی جل و بەرگ دیاری نەكراوە، لەوانەیە سەرووی ناوكی لادابێت، لەوانەیە خوارەوەی لادابێت لەژێرەوەی چۆكەكانی، ئەوەی دیاربێت سەرووی ناوكی هەڵگرتووە)[١].

ئیمام النووی رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ هاوەڵانمان كە سوننەتە سەرەتای باران بارین بێجگە لە عەورەت بەدیار بخەیت بۆ ئەوەی بارانی بەربكەوێت)[٢].

قرطبی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمویت: (پێغەمبەر (ﷺ) كە تەبەڕوكی كردووە بەباران بۆ چارەسەر، لەبەرئەوە بووە چونكە خوای گەورە ناوی بارانی ناوە بەڕەحمەت و مبارك و پاك و پاككەرەوە و كردوویەتی بەهۆكاری ژیان)[٣].

لە هاوەڵان نەقل كراوە كە سەرەتای باران بارین خۆیان داوەتە بەر باران، لە عوثمان و ابن عباس و چەند هاوەڵی تر نەقل كراوە، بەڵام شیفاء نادەینە پاڵ باران بارین وەك هۆكار مەگەر بەڵگە هاتبێت.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) تەبەڕوك كردن نییە بە باران، لەو بارانە موبارەكەی كە خوای گەورە فەرموویەتی، بەڵكو مەبەستی

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (٢٨٢/٥).
[٢] شرح مسلم (١٩٦/٦).
[٣] المفهم (٥٤٦/٥).

ئەوە بووە کە بارانەکە تازەیە و لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە و حەزی لێبووە بەر لاشەی بکەوێت)[١].

دوو گومان و وەڵام بۆ ئەوانەی تەبەڕوک بە ئاسەواری پیاو چاکان دەکەن:

گومانی یەکەم: فەرمودەی (عتبان بن مالك) پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبو بەکر هاتن بۆ ماڵی عتبان بن مالك، پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوت: (لەماڵەکەت چ شوێنێکت پێ خۆشە نوێژی لێ بکەم؟) عتبان ئاماژەی بۆ شوێنێک کرد لە ماڵەکەی، (الله اکبر)ی کرد و ئێمەش هەستاین و ڕیز بووین، دوو ڕەکاعەت نوێژمان کرد و پاشان سەلامی دایەوە)[٢].

وەلام لە چەند ڕووەوەیە:

١- عتبان مەبەستی ئەوە نەبوو تەبەڕوك بەو شوێنە بکات ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لێ کردووە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە پێغەمبەر دان بنێت بە نوێژی جەماعەت لە ماڵی کاتێك ناتوانێت ئامادەی نوێژی جەماعەت بێت لە مزگەوت.

٢- ئەگەر مەبەستی عتبان تەبەڕوک کردن بوایە لەو شوێنە، ئەوە نەوەکانی عتبان لە دوای مردنی تەبەڕوکیان پێ دەکرد، هەروەك چۆن هاوەڵان تەبەڕوکیان بە مووی قژی پێغەمبەر کرد (ﷺ).

٣- نابێت پیاو چاکان قیاس بکەین بە پێغەمبەر (ﷺ).

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (٢٨٣/٥).

[٢] متفق عليه.

گومانی دووەم: ابن عمر ڕەزای خوای لەسەر بێت: (انه كانه يتتبع المساجد التي صلی فيها رسول (ﷺ) يصلی فيها)[١].

واتە: ابن عمر خوا لێی ڕازی بێت لە مزگەوت لەو شوێنانە دەگەڕا کە پێغەمبەر نوێژی لێ دەکرد، ئەویش نوێژی لەو شوێنانە دەکرد.

وەڵام لە چەند ڕووەوەیە:

١- نابێتە بەڵگە کە (ابن عمر) خوا لێی ڕازی بێت تەبەڕوکی کردووە بەو شوێنانە، چونکە ئەمەیان لە بابەتی سوور بوونە لەسەر شوێن کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ).

٢- ابن عمر سەفەری نەکردووە لە پێناو نوێژ کردن لەو شوێنانە.

٣- ئەمە ئیجتیهادی ابن عمر بووە و هاوەڵانی تر ئەمەیان نەکردووە لە ترسی ئەوەی نەوەک خەڵک توشی فیتنە بین، بەڵکو دەرگایان داخستووە وەك ئەوەی پێشەوا عومەر کردوویەتی لە بڕینی دار و باسکردنی (حجر الاسود).

٤- هەر چوار خەلیفەکە و هاوەڵانی تر سەفەریان کردووە بۆ مەککە و مەدینە، نەقل نەکراوە لێیان لەو شوێنانە گەڕابن کە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لێ کردووە.

---

[١] أخرجه البخاري (٤٨٣).

**وقول الله تعالى:** ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴿١٩﴾﴾ [النجم: ١٩]

واته: (پێم بڵێن لات و عوززا و مناتیش کە سێیەم کۆتاییانە چ گەورەییەک و چ سوودێک و چ بەرەکەتێکیان هەیە)؟

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿ٱللَّٰتَ﴾: پەیکەری خەڵکی طائف و دەوروبەری بوو، دەخوێندرێتەوە بە دوو جۆر:

- تاء شەددەی لەسەرە.

- تاء بێ شەددەیە.

بە شەددە دەخوێندرێتەوە بە خوێندنەوەی ابن عباس، کەواتە لە سەر خوێندنەوەی شەددە (اسم فاعل)ی (اللت)، ئەو پەیکەرە ئەسڵەکەی پیاوێک بوو خواردنی دەدا بە حاجی یەکان، کاتێک ئەم پیاوە مرد مانەوە لای گۆڕەکەی و سەردانیان دەکرد و کردیان بە پەیکەر.

لەسەر خوێندنەوەی بێ شەددە، اللات مشتەقەکەی (الله) یە، یان (الالە)، ئەوان لە ناوی خوایان وەرگرت بۆ ئەم پەیکەرە، پێیان وت اللات، ئەم پەیکەرە هی خەڵکی طائف و دەوروبەری بوو.

﴿وَٱلْعُزَّىٰ﴾: دار خورمایەک بوو لە نێوان مەککە و طائف، یان پەیکەرێک بوو قوڕەیشی بنو کنانە دەیانپەرست و مشتەقەکەی ناوی خوای گەورە (العزیز)ە، کە دار خورمایەک بوو لە نێوان مەککە و طائف.

(ومنواة) دەڵێن مشتەقەکەی منانە، وتراوە: مشتەقەکەی منی یە، لەبەر زۆری خوێن ڕشتن لەو شوێنە، لەوانە بە مینا دەڵێن مینا لەبەر زۆر خوێن ڕشتن و ئاژەڵ سەربڕین.

ئەم پەیکەرە لە نێوان مەککە و مەدینە بوو هی هذیل و خزاعە بوو[١].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە نابێت تەبەڕوک بە بەرد و گۆڕ بکەیت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نابێت تەبەڕوک بە بەرد و گۆڕ و دار بکەیت، سەبارەت بە تەفسیری (اللات) زانایان دوو وتەیان هەیە:

یەکەم: تاء شەددەی لەسەر نییە، کە ناوی بەردێکی گەورەی لووس بوو نەخشی لەسەر هەڵکەندرابوو، بینایەکی لەسەر دروست کرابوو لە طائف، ئەوان تەبەڕوکیان پێ دەکرد، داواکاری خۆیان لێ داوا دەکرد بۆ ڕزگار بوون لە خەم و خەفەت و ناخۆشی.

دووەم: تاء شەددەی لەسەر بێت اسم فاعل لت يلت، کە لە ئەسڵ دا پیاوێکی باش بوو.

کەواتە لەسەر تەفسیری یەکەم تەبەڕوکیان بە بەرد دەکرد و لە سەر تەفسیری دووەم تەبەڕوکیان بە گۆڕ دەکرد، هەردوو تەفسیرەکە ڕاستن، ئایەتەکە بەڵگەیە کە نابێت تەبەڕوک بە بەرد و بە گۆڕ بکەیت، بەردەوام ئەم پەیکەرە دەپەرسترا هەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەتحی مەککەی کرد لە سالی(٨)ی هیجری، فەرمانی کرد بە ڕوخاندنی ئەم پەیکەرە وەک پەیکەرەکانی تر کە ڕوخێنراون)[٢].

---

[١] القول المفيد.

[٢] إعانه المستفيد (١/٢١٥-٢١٦).

**عن أبي واقد الليثي، قال: خرجنا مع رسول الله (ﷺ) إلى حنين ونحن حدثاء عهد بكفر، وللمشركين سدرة يعكفون عندها وينوطون بها أسلحتهم، يقال لها: ذات أنواط، فمررنا بسدرة فقلنا: يا رسول الله أجعل لنا ذات أنواط كما لهم ذات أنواط فقال رسول الله (ﷺ): (الله أكبر! إنها السنن، قلتم ـ والذي نفسي بيده ـ كما قالت بنو إسرائيل لموسى:** ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [الأعراف: ١٣٨]**، لتركبن سنن من كان قبلكم). {رواه الترمذي وصححه}.**[(١)]

واته: ابو واقد الليثي دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا چووینە دەر بۆ حونەین، ئەو کاتە تازە موسڵمان بوو بووین، موشریکەکانیش دارێکی سیدریان هەبوو لە پاڵیدا دەمانەوە بۆ موبارەکی، سیلاحەکانیان پێوە هەڵدەواسی بۆ موبارەکی و پێیان دەگوت: (ذات أنواط)، واتە: درەختی هەڵواسین بۆ بەرەکەت، ئێمەش کە بەلای درەختەکە دا تێپەڕ بووین گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆش درەختێکمان بۆ دابنێ وەک ئەوان تاوەکو چەکەکانمان پێوە هەڵواسین، واتە: بۆ موبارەکی بۆ ئەوەی تیژ بێت و کاریگەری زور بێ لەسەر دوژمن)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (الله اکبر! ئەوە ڕێبازەکانە، واتە: (ڕێبازی کافران) سوێند بەو زاتەی ڕوحی محمدی بە دەستە ئەوەی وتتان هەروەک ئەوە وایە کە نەوەکانی ئیسرائیل بە موسایان گوت: (ئەی موسا پەرستراوێک مان بۆ دابنێ هەروەک چۆن کافران پەرستراوێکیان هەیە، موسا فەرمووی بەڕاستی ئێوە قەومێکن نازانن.)، سوێند بە خوا ئەی ئوممەتەکەم ئێوەش شوێن ڕێبازی قەومەکانی پێش خۆتان دەکەون).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

---

(١) أخرجه الترمذي (٢١٨٠)، وأحمد (٢١٨/٥ رقم ٢١٨٩٧)، والنسائي "الكبرى" (٣٤٦/٦ رقم ١١١٨٥)، وصححه الألباني في "صحيح سنن الترمذي" (٢٣٥/٢).

**(إلى حنين):** واتە: غەزوەی حونەین.

**(حدثاء عهد بكفر):** واتە: ئەو کاتە تازە موسڵمان بوو بووین.

**(يعكفون عندها):** واتە: پێوەیان هەڵدەواسی بۆ موبارەکی.

**(ينوطون):** واتە: هەڵیان دەواسی.

**(ذات أنواط):** واتە: درەختی هەڵواسین بۆ بەرەکەت.

**(الله أكبر):** مەبەست پێی بە پاک دانانی خوایە و سەیری داواکەیانە.

**(السنن):** واتە: ڕێگاکان.

**(لتركبن):** واتە: سوێند بەخوا شوێنی دەکەون.

**(من كان قبلكم):** واتە: قەومەکانی پێش خۆتان، مەبەست پێی گاور و جوولەکانن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە دروست نییە تەبەڕوک بە دار بکرێت، تەبەڕوک کردن بە دار سوننەتی پێشینەکانی خراپ بووە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تەبەڕوک کردن بە دار و بەرد سوننەتی موشریکەکانە، هەروەها بەڵگەیە بۆ خۆپاراستن لە شیرک، مرۆڤ وا گومان دەبات لەخوا نزیک دەبێتەوە، کەچی لەخوا دووری دەخاتەوە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (تەبەڕوک کردن بە دار و بەرد سوننەتی موشریکەکان و سوننەتی سەردەمی نەزانینە، هەر کەسێک وا بکات ئەوا خۆی چوواندووە بە کافران و ئەویش کافرە وەک ئەوان، هیچ جیاوازی نییە لەنێوان ئەو کەسەی گۆڕ دەپەرستێت و ئەو کەسەی لات و عوززا دەپەرستێت، یان ئەو کەسەی داوای بەرەکەت لە دار دەکات و ئەوەی داوا لە پەیکەر دەکات، هیچ جیاوازی نییە لە نێوانیان)[(١)].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تەبەڕوک کردن بە دار و بەرد و مانەوە لەوێ شیرکە، موشریکەکان داری سیدریان هەبوو و باوەڕیان بەو دارە هەبوو، بیروباوەڕەکەیان سێ شتی تێدا بوو:

یەکەم: ئەوان ئەو دارەیان بە گەورە دادەنا.

دووەم: ئەوان لەوێ دەمانەوە وەک عیبادەت.

سێیەم: ئەوان چەکیان هەڵدەواسی بە ئومێدی ئەوەی بەرەکەت لە دارەکەوە نەقل بێت بۆ چەکەکانیان، بۆ ئەوەی تیژ بێت و کاریگەری زۆری لە سەر دوژمن هەبێت و زیاتر خێری تێدا بێت.

کردەوەی ئەوان شیرکی گەورە بوو، چونکە بە گەورەیان دادەنا و لە لای دەمانەوە، بە مانەوەی عیبادەت ئەویش بریتی یە لە مانەوە لە شوێنێک و پەیوەست بوون پێی بە مەبەستی بە گەورە دانان و نزیک بوونەوە، چونکە داوای بەرەکەتیان دەکرد، کەواتە شیرکی گەورە بوو لەبەر ئەوەی ئەم سێ شتەی تێدا کۆبووبووەوە.

هەندێ زانا دەڵێن: ئەمەیان شیرکی بچووک بوو نەک شیرکی گەورە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ یان نەکرد بە نوێ کردنەوەی ئیسلامەتیان، بەڵگە لەسەر ئەوە دەڵێت:

---

(١) إعانة المستفيد (٢٢٢/١).

"سوێند بەو زاتەی ڕوحی محمدی بە دەستە ئەوەی ووتتان هەر وەک ئەوەی کە نەوەکانی اسرائیل بە موسایان ووت"، لێرە تەنها وتەی چوواندووە بە وتە.

شێخ دانی بەوە ناوە کە ئەوان کافر نەبوونە، لە مسائلەکان دا دەڵێت: شیرک تیایدا هەیە گەورەیە و هەیە بچووکە، چونکە ئەوان هەڵنەگەرانەوە بەمە.

ئەوەی دیار بێت لەم فەرمووودەیە شیرکی گەورەیە ئەوەی موشریکەکان توشی بوون تەنها تەبەڕوک کردن بۆ "ذات أنواط" ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ بەگەورە دانان و مانەوەشیان لە لای دەگەڕێتەوە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نیەتی باش حوکمی شەرعی ناگۆڕێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هەروەها بابەتێکی تری گرینگ لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە نیەتی باش حوکمی شەرعی ناگۆڕێت، ئەمانە نیەتیان باش بوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لێیانی قبووڵ نەکرد، بەڵکو ئینکارییانی کرد لەسەر ئەمە)[2].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی کراوە لە خۆ چوواندن بە ئەهلی جاهلی، هەروەها بەڵگەشە لەسەر ترسناکی خۆ چوواندن بە موشریکەکان، چونکە ئەمە سەر دەکێشیت بۆ تووش بوون بە شیرک.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هەروەها ئەم فەرموودەیە بنچینەیەکی گەورەی تێدایە کە ئەویش ترسناکی خۆ چوواندنە بە کافر و موشریکەکان، چونکە ئەمە سەر دەکێشیت بۆ تووش بوون بە شیرک)[3].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (١٣٤-١٣٦).
[2] إعانة المستفيد (٢٢٣/١).
[3] إعانة المستفيد (٢٢٣/١).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ قورسی هاتنە دەرەوەی عادەت لە نەفسی مرۆڤ دا.

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ بەدیار خستنی شتێک بۆ ئەوەی گومان لابچێت، چونکە دەفەرمووێت: (خرجنا مع رسول الله (ﷺ) إلى حنين ونحن حدثاء عهد بكفر)، مەبەستیان ئەوە بوو عوزری خۆیان ڕوون بکەنەوە بەوەی تووشی بوون، ئەوان نەزان بوون، تێنەگەیشتبوون وەک هاوەڵان.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە عوزر بە نەزانین هەیە بۆ نەزان.

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە (الله أكبر) بڵێیت ئەگەر تووشی سەرسوڕمانی بوویت، یان شتێکت بۆ باش بوو.

عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه أن النبي (ﷺ) قال: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَكَبَّرْنَا. فَقَالَ: أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَكَبَّرْنَا. فَقَالَ: أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَكَبَّرْنَا)[١].

عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: (قُلْتُ لِلنَّبِي (ﷺ): طَلَّقْتَ نِسَاءَكَ قَالَ: لاَ, قُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ)[٢].

ئیمام بخاري ڕەحمەتی خوای لێ بێت بابێکی داناوە : (باب التكبير والتسبيح عند التعجب).

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە سوێند لەسەر فەتوا بخۆیت.

---

[١] رواه البخاري (٣٣٤٨).
[٢] رواه البخاري (٦٢١٨).

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروستە بۆ فەرموودەناس و موفتی سوێند بخۆن لەسەر فەتوا ئەگەر مەبەستێکی هەبێت بۆ ڕوونکردنەوە)[(١)].

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەم ئوممەتە تووشی شیرک دەبێت.

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە بۆ کتاب و سوننەت بگەڕێیتەوە بۆ عیبادەت کردن، نابێت بەبیروڕای خۆی بکات.

---

(١) فتاوى الدروس.

## باب ما جاء في الذبح لغير الله

**وقول الله تعالى:** ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ [الأنعام: ١٦٢-١٦٣]

**وقوله:** ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴿٢﴾﴾ [الكوثر: ٢]

**عن علي رضي الله عنه قال: حدثني رسول الله (ﷺ) بأربع كلمات: (لعن الله من ذبح لغير الله، لعن الله من لعن ووالديه. لعن الله من آوى محدثا، لعن الله من غير منار الأرض) [رواه مسلم]**[1].

**وعن طارق بن شهاب، أن رسول الله قال: (دخل الجنة رجل في ذباب، ودخل النار رجل في ذباب) قالوا: وكيف ذلك يا رسول الله؟! قال: (مر رجلان على قوم لهم صنم لا يجوزه أحد حتى يقرب له شيئا، فقالوا لأحدهما قرب قال: ليس عندي شيء أقرب قالوا له: قرب ولو ذبابا، فقرب ذبابا، فخلوا سبيله، فدخل النار، وقالوا للآخر: قرب، فقال: ما كنت لأقرب لأحد شيئا دون الله عز وجل، فضربوا عنقه فدخل الجنة) [رواه أحمد]**[2].

**فيه مسائل:**

---

[1] أخرجه مسلم (١٩٧٨).

[2] رواه أحمد في الزهد (ص١٥)، وأخرجه أيضا: أبو نعيم في "الحلية" (٢٠٣/١)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (٤٨٥/٥ رقم ٧٣٤٣)، موقوفا على سلمان الفارسي رضي الله عنه، وأورد ابن قيم بإسناد الإمام أحمد في "جواب الكافي" (ص٢١) من حديث طارق بن شهاب مرفوعا كما هو عند المؤلف هنا، وصححه الألباني موقوفا على سلمان رضي الله عنه، كما في "سلسلة الأحاديث الضعيفة" (٧٢٢/١٢)؛ حيث قال: " وبالجملة؛ فالحديث صحيح موقوفا على سلمان الفارسي رضي الله عنه".

**الأولى:** تفسير: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي﴾.

**الثانية:** تفسير: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾.

**الثالثة:** البداءة بلعنة من ذبح لغير الله.

**الرابعة:** لعن من لعن والديه، ومنه أن تلعن والدي الرجل فيلعن والديك.

**الخامسة:** لعن من آوى محدثا وهو الرجل يحدث شيئا يجب فيه حق لله فيلتجيء إلى من يجيره من ذلك.

**السادسة:** لعن من غير منار الأرض، وهي المراسيم التي تفرق بين حقك في الأرض وحق جارك، فتغيرها بتقديم أو تأخير.

**السابعة:** الفرق بين لعن المعين، ولعن أهل المعاصي على سبيل العموم.

**الثامنة:** هذه القصة العظيمة، وهي قصة الذباب.

**التاسعة:** كونه دخل النار بسبب ذلك الذباب الذي لم يقصده، بل فعله تخلصا من شرهم.

**العاشرة:** معرفة قدر الشرك في قلوب المؤمنين، كيف صبر ذلك على القتل، ولم يوافقهم على طلبتهم، مع كونهم لم يطلبوا منه إلا العمل الظاهر.

**الحادية عشرة:** أن الذي دخل النار مسلم، لأنه لو كان كافرا لم يقل: (دخل النار في ذباب).

**الثانية عشرة:** فيه شاهد للحديث الصحيح (الجنة أقرب إلى أحدكم من شراك نعله، والنار مثل ذلك).

**الثالثة عشرة:** معرفة أن عمل القلب هو المقصود الأعظم حتى عند عبدة الأوثان.

## باب ما جاء فی الذبح لغیر الله

## باسی سەربڕینی ئاژەڵ و قوربانی کردن بۆ غەیری خودا

ابن عثيمين رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سەر بڕین بۆ بێجگە لە خودا دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش:

یەکەم: ئاژەڵ سەر دەبڕدرێت بۆ بێجگە لە خودا بۆ نزیک بوونەوە و بە گەورە دانان، ئەمەیان شیرکی گەورەیە و پێی لە دین دەردەچێت.

دووەم: ئاژەڵ سەر دەبڕدرێت بۆ بێجگە لە خودا وەک دڵ خۆشی و ڕێز، ئەمەیان لە دین دەرناچێت بەڵکو لە کاروباری ئاسایی یە هەندێک جار داواکراوە و هەندێک جار داوا نەکراوە، ئەسڵ وایە ڕێگەپێدراوە.

مەبەستی دانەری کتاب بەشی یەکەمە.

ئەگەر کاربەدەستێک بێتە شارێک و ئاژەڵێکی بۆ سەربڕین، مەبەستمان بۆ نزیک بوونەوە و بە گەورە دانان بێت، ئەوە شیرکی گەورەیە و حەڕامە ئەم ئاژەڵە بخورێت، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە شیرکە، بەجۆرێک ئێمە ئاژەڵەکە لە ڕووی سەر دەبڕین و پاشان وازی لێ دەهێنین، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەکەی بۆ سەربڕین وەک ڕێز و میوانداری و گۆشتەکەی ئامادە بکرێت و بخورێت، ئەمەیان لەبابەتی ڕێزگرتنە و شیرک نییە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزیت دەفەرمووێت: (بۆ ئاژەڵ سەربڕین چوار حاڵەت مان هەیە:

حاڵەتی یەکەم: ئاژەڵ سەربڕین بە ناوی خوا و بۆ خوا، ئەمەیان یەکخوا پەرستی یە.

---

[1] قول المفيد (٢٧٥/١).

حاڵەتی دووەم: ئاژەڵ سەر دەبڕدرێت بە ناوی خوا و بۆ بێجگە لە خوا، ئەمەیان شیرکە لە عیبادەت.

حاڵەتی سێیەم: ئاژەڵ سەر دەبڕدرێت بە ناوی بێجگە لە خوا و بۆ بێجگە لە خوا، ئەمەیان شیرکە لە داوا کردنی یارمەتی بێجگە لە خوا، وە شیرکە لە عیبادەتیشدا.

حاڵەتی چوارەم: ئاژەڵ سەردەبڕدرێت بە ناوی بێجگە لە خوا و بۆ خوا، ئەمەیان شیرکە لە پەروەردگارێتیدا.

ابن تیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ئەوەی زانراو بێت شیرک لە عیبادەتدا گەورەترە لە داوای یارمەتی کردن لە بێجگە لە خوا)[1].

دانەری کتاب ئاماژەی بۆ بەڵگە کردووە بێ ئەوەی حوکم بدات، چونکە ئاژەڵ سەربڕین حاڵەت هەیە شیرکە و حاڵەت هەیە دروستە و حاڵەت هەیە حەرامە، گومانی تێدا نییە لەگەڵ ئەوە دایە کە حەرامە ئاژەڵ سەربڕی بۆ بێجگە لەخوا، وەک بە گەورە دانان و نزیک بوون.

---

[1] التمهید لاپەرە (١٤٠-١٤٣).

**وقول الله تعالى:** ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ [الأنعام: ١٦٢-١٦٣]

واتە: ئەی محمد بەو موشریکانە بڵێ بە تەئکید دوعاکردن و نوێژەکانم و خوێن ڕشتنم، واتە ئاژەڵ سەر بڕین و قوربانی کردنم تەنها بۆ (الله)یە، کردەوەکانم لە ژیانم دا و ئەوەشی کەلەسەری دەمرم تەنها بۆ ئەوەیە کە پەروەرگاری جیهانیانە.

هیچ شەریکی نیە لەو عیبادەتدا بەمە فەرمان دراوە بەسەرمدا کە تەوحید و ئیخلاسە، منیش یەکەمینی موسڵمانانم لەم ئوممەتەدا.

**سوودەکانی ئایەتەکەکان:**

**١-** ئیخلاسی پێغەمبەری (ﷺ) ئێمە لە نوێژ و قوربانی کردن و ژیان و مردن تەنها بۆ خوا بووە، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾.

**٢-** نوێژ چۆن عیبادەتە سەربڕینیش بە هەمان شێوە عیبادەتە، کەواتە چۆن نابێت نوێژ بۆ جگە لەخوا بکرێت و داخلی شیرک دەبێت ئاواش سەربڕین بۆ بێجگە لەخوا شیرکە.

**٣-** هەموو کردەوەکانی بەندە لە ژیاندا ئەگەر مەبەست پێی خوا بێت دەبێتە عیبادەت.

**٤-** ئیخڵاس مەرجە بۆ قبووڵ بوونی کردەوە.

**٥-** گرینگترین شت کۆتایی کردەوەیە.

**٦-** عیبادەت تەوقیفی یە، نابێت هیچ شتێک بکرێت مەگەر بە فەرمانی خوا نەبێت.

**٧-** پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم کەس بووە فەرمانی خوای جێ بەجێیکردووە و دوانەکەوتووە لە جێ بە جێکردنی، لەبەر وتەی: ﴿وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾.

**٨-** گەورەیی پلە و پایەی نوێژ، لەبەر ئەوە پێش هەموو عیبادەتەکانی تر خراوە و گەورەترین عیبادەتە دوای شایەتوومان هێنان، گەورەترین عیبادەتی لاشەیە و کۆلەگەی دینە.

**٩-** گرینگی قوربانی کردن لە حەج، لەبەر ئەوە بەگەورە دانانی خوای گەورەی تێدایە و ماڵ بەخشینیشی تێدایە.

**١٠-** دەبێت موسڵمان ژیانی هەمووی بۆ خوای گەورە بێت هەتا دەگات بەخوا، لەسەر ئیسلام بژیت و لەسەر ئیمان بمرێت، نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و هەموو عیبادەتەکانی تەنها بۆ خوا بێت، خواردن و خواردنەوە و نووستن و شتە ڕێگەپێدراوەکانی بۆ خوا بێت و نیەتێکی باشی هەبێت، چونکە نیەت عادەت و شتە ڕێگەپێدراوەکان دەکاتە عیبادەت.

**١١-** جێگیرکردنی پەروەردگاریەتی گشتی، لەبەر وتەی: ﴿لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.

**وقوله:** ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ۝٢﴾ [الكوثر: ٢]

واتە: (جا کەواتە تەنها بۆ پەروەردگارت نوێژ بکە و قوربانیش هەر بە تەنها بۆ ئەو سەرببڕە).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:**

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾: واتە: سوپاسی خوای گەورە بکە بەوەی پێتی داوە بە نوێژ کردن و قوربانی کردن، یەکێک لە لێکدانەوە دوورەکانی ئەم ئایەتە هەندێک زانا دەڵێن: (وانحر)، واتە: هەردوو دەستەکانت لەژێر قورگرت دابنێ کاتی نوێژ کردن، کە ئەمە لێکدانەوەیەک دروست نییە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە قوربانیش وەک نوێژ عیبادەتە دەبێت تەنها بۆ خوا بکرێت بە پاکی.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** واجبی ئیخلاس لە هەموو عیبادەتەکان، لەبەر وتەی: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾.

**٢-** دروست نییە قوربانی پێش نوێژی جەژن بکرێت، لەبەر وتەی: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾.

**٢-** قوربانی کردن واجبە، لەبەر وتەی: ﴿وَٱنْحَرْ﴾، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان دوو وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون قوربانی کردن سونەتێکی جەخت لێکراوە، کە ئەمە وتەی شافعی و حەنابلە و ظاهریەکانە.

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون قوربانی کردن واجبە، کە ئەمە وتەی ئەبو حەنیفە و وتەیەکە لە وتەکانی مالک و لەیث و ئەوزاعی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و ابن تیمییە.

وتەی ڕاست وتەی زۆربەی زانایانە کە قوربانی کردن سونەتێکی جەخت لێکراوەیە، بەڵام باشتر و دڵنیاتر ئەوەیە وازی لێ نەهێنیت ئەگەر توانات هەبوو.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نوێژی جەژن واجبە، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە حوکمی نوێژی جەژن، سێ وتە هەیە:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون نوێژی جەژن واجبە، کە ئەمە وتەی حەنەفی و ابن حبیبی مالکی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و ابن تیمییە و ابن قیم و صنعانی و شەوکانی و ابن باز و ابن عثیمین.

دووەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون نوێژی جەژن سوننەتە، کە ئەمە وتەی مالکی و شافعی و حەنەفی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و داود الظاهري.

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون نوێژی جەژن (فرض الكفاية)یە، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی حەنابلە و حەنەفی و مالکی و شافعی، بەڵگە:

-خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾.

- بانگ و قامەت بۆ نوێژی جەژن دروست نییە، وەک نوێژی جەنازە یەک حوکمیان هەیە.

- ئەگەر واجب بوایا دەبوایا گوێ گرتن لە وتاری جەژن واجب بوایا وەک هەینی.

- نوێژەکە تەکبیری تێدایە بەدوای یەک لە کاتی وەستان بۆ نوێژ وەک نوێژی جەنازە.

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە قوربانی دەبێت بە پاکی و تەنها بۆ خوا بکرێت، سەر بڕین بۆ بێجگە لەخوا شیرکە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (﴿فَصَلِّ﴾، پیتی (فاء) بۆ سەبەبە عطف کراوە لەسەر: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾ [الكوثر: ١]، بە هۆی ئەوەی کە کەوثەرمان پێ داویت نوێژ بۆ خوای خۆت بکە و ئاژەڵ سەرببڕە وەک سوپاس کردنێک بۆ خوای گەورە لەسەر ئەم نیعمەتە، مەبەست لە نوێژ لێرە نوێژی زانراوە لە ڕووی شەرع.

"والنحر" مەبەست پێی سەربڕینە، واتە سەربڕین تەنها با بۆ خوا بێت هەروەک چۆن نوێژ بۆ تەنها خوایە، سوودی ئەم ئایەتە ئەوەیە سەربڕین عیبادەتە، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە و لەگەل نوێژ باسی کردووە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ﴾، فەرمانی بە نوێژ و سەربڕین کردووە، ئەگەر فەرمان بکات ئەوا داخلی سنوری عیبادەت دەبێت، چونکە عیبادەت ناوێکی گشتی یە بۆ هەموو ئەوشتانەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێت و پێی ڕازی یە، لە وتە و کردەوەی بەرچاو و شاراوە، فەرمان کردنی خوای گەورە بە نوێژ بەڵگەیە کە خۆشەویستە لای خوا، وە فەرمان کردنی بە سەربڕین بەڵگەیە کە خۆشەویستە لای و ڕازی یە پێی، کەواتە نوێژ و سەر بڕین عیبادەتن بۆ خوا.

---

[1] القول المفيد (٢٨٢/١).

هەر کەسێک ئاژەل سەر ببڕێت بۆ بێجگە لە خوا ئەوە عیبادەتی کردووە بۆ بێجگە لە خوا)[١].

**٥-** هەندێ زانا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە دەبێت دەست لەژێر گەرووت دابنێیت لە کاتی نوێژ کردن، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون هەردوو دەستەکان لەسەر سینگ دادەنرێن، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی شافعی.

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون هەردوو دەستەکان لەژێر سینگ و لە سەرەوەی ناوک دادەنرێن، کە ئەمە وتەیەکە لە مەزهەبی مالک و شافعی و ئەحمەد.

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون شوێنی دەست دانان لە ژێرەوەی ناوکە، کە ئەمە مەزهەبی ئەبو حەنیفە و وتەیەکە لە وتەکانی شافعی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد، إسحاقە.

چوارەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون نوێژخوێن بەئارەزووی خۆیەتی هەردوو دەستەکانی لەسەر ناوک یان سەرەوەی ناوک یان ژێرەوەی ناوک دابنێت، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد.

---

[١] التمهيد لاپەرە (١٤٦-١٤٧).

شێخ الألباني ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانانی هەردوو دەست لەسەر سینگ فەرموودەی لەسەر جێگیر بووە، پێچەوانەکەی یان فەرموودەی لاوازە یان هیچ ئەسل و ئەساسی نییە)[١].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون لەسەر سینگ دادەنرێت، کە ئەمە وتەی ڕاستە)[٢].

---

[١] صفة صلاة النبي (ﷺ) لاپەڕە (٦٩).

[٢] الشرح الممتع (٣/٣٦-٣٧).

**عن علي رضي الله عنه قال: حدثني رسول الله (ﷺ) بأربع كلمات: (لعن الله من ذبح لغير الله، لعن الله من لعن ووالديه. لعن الله من آوى محدثا، لعن الله من غير منار الأرض) [رواه مسلم]**[1].

واته: علی کوری ئەبو تالّیب خوا لیێ رازی بێت وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) چوار وشەی پێ گوتم: (لەعنەتی خوا لەو کەسەی کە گیاندارێک سەر دەبڕێت بۆ بێجگە لە خوا (واتە: بۆ ئەوەی خۆی لێ نزیک بکاتەوە یان بە گەورە و مەزنی دابنێت)، لەعنەتی خوا لەوکەسەی کە لەعنەت لە دایک و باوکی خۆی دەکات، لەعنەتی خوا لەوکەسەی کە (محدث) تاوانبارێک پەنا دەدات. یان (محدث) جێگای کارێکی خراپە دەکاتەوە، لەعنەتی خوا لەو کەسەی کە سنوور و نیشانەکانی زەوی دەگۆرێت).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لعن الله من آوى محدثا):** واتە: لەعنەتی خوا لەوکەسەی کە "محدث" تاوانبارێک پەنا دەدات، یان "محدث" جێگای کارێکی خراپە دەکاتەوە.

**(لعن الله من غير منار الأرض):** واتە: لەعنەتی خوا لەو کەسەی کە سنوور و نیشانەکانی زەوی دەگۆرێت.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە سەربڕین بۆ بێجگە لەخوا لە تاوانە گەورەکانە و هەڕەشەیەکی توندی لەسەر هاتووە.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

[1] أخرجه مسلم (١٩٧٨).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سەربڕین بۆ بێجگە لە خوا لە تاوانە گەورەکانە و شیرکە.

(لعن الله من ذبح لغير الله): هەموو ئەمانە دەگرێتەوە:

- ئەوەی سەر دەبڕدرێت بۆ پەیکەرەکان بۆ نزیک بوونەوە لێیان.

- ئەوەی سەر دەبڕدرێت بۆ گۆشت خواردن و ناوی بێجگە لە خوای لەسەر دەهێنرێت.

- ئەوەی سەر دەبڕێت وەک بە گەورە دانانی دروستکراو وەک سەلام و ڕێز بۆ کەسەکە کاتێک دەگات بەو شوێنەی کە پێشخوازی لێ دەکەن.

- ئەوەی سەر دەبڕدرێت لە کاتی وەستانی باران، واتە: نەهاتنی باران لە شوێنێکی دیاری کراو یان لە لای قەبر، بۆ ئەوەی باران ببارێت.

- ئەوەی سەر دەبڕدرێت لە کاتی هاتنە ناو خانوو لە ترسی جنۆکە نەوەک زیانی پێ بگەینێت، هەموو ئەمانە داخلی سەر بڕین دەبن بۆ بێجگە لە خوا و دەبن بە شەریک بڕیارردان بۆ خوای گەورە)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گۆڕینی سنوری نیشانەکانی زەوی لە تاوانە گەورەکانە، هەر لەبەرئەوەش پێغەمبەر (ﷺ) لە گەل شیرک و ئازاردانی دایک و باوک و پەنادانی تاوانبار باسیکردووە، بەڵگەیە کە شتێکی گەورەیە دەبێت مرۆڤ خۆی لێ بپارێزێت و لە خوا بترسێت بۆ ئەوەی تووشی نەبێت[٢].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: ((المنار): کۆی منارە، واتە: نیشانە، مەبەست بە (منار الارض)، نیشانەکانی زەوی یە، زانایان سێ وتەیان هەیە:

---

[١] إعانة المستفيد (١/٢٣٣-٢٣٤).

[٢] القول المفيد (١/٢٨٠-٢٨٧).

یەکەم: مەبەست بە نیشانەکانی زەوی مراسیمە، بە مانای تر واتە: پێش خستن و پاش خستنی لە شوێنی خۆی، فەرموودە هاتووە دەفەرمووێت: (هەر کەسێک بستێک زەوی بە ستەم داگیر بکات بە ناحەق، ئەوا حەوت چین زەوی تەوق دەکرێتە ملی و دەکرێت بە ناخی هەر حەوت چینی زەوی دا).

دووەم: مەبەست لە نیشانەکانی زەوی نیشانەکانی حەرەمە، ئەوانەی حەڕامە ڕاوی تێدا بکەیت و نێچیر دووربخەیتەوە و دار ببڕیت.

سێیەم: مەبەست بە نیشانەکانی زەوی ئەو هێمایانەن کە لەسەر ڕێگا دانراون و زانراون، لەم کاتەی ئێستا ئەو هێمایانە دەگرێتەوە کە لەسەر ڕێگای گەیاندنن، ئەم نیشانانە کەس بۆی نییە بیگۆڕێت، چونکە خەڵک بزر دەبێت و بە ڕێگای هەڵە دا دەڕوات، وتەی ڕاست لەم وتانە وتەی یەکەمە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەفرەت کردن لە دایک باوک لە تاوانە گەورەکانە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ((لعن من لعن والديه)، واتە: نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت کە نەفرەت لە دایک و باوکی دەکات، واتە: جنێودان وقسە پێ وتنە، نەفرەت لە مرۆڤ واتە جنێودان و قسە پێ وتن، ئەگەر جنێوت بە مرۆڤێکدا یان قسەت پێ ووت ئەمە نەفرەتە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) پێی وترا: چۆن پیاو نەفرەت لە دایک و باوکی دەکات، وتی (پیاو جنێو بە باوکی پیاو دەدات و ئەویش جنێو بە باوکی دەدات، هەروەها جنێو بە دایکی دەدات ئەویش جنێو بە دایکی دەدات)، زانایان بنچینەیەکیان لەم

---

[1] إعانة المستفيد (٢٣٦/١-٢٣٧).

فەرموودەیە دەرهێناوە ئەویش ئەوەیە: هۆکار لە جێگای ڕاستەوخۆیە لە تاوان دا، وە لە ضمان پێچەوانەیەتی کە زانایان بە درێژی باسیان کردووە)[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پەنادانی تاوانبار و بەرگری لێکردنی لە تاوانە گەورەکانە، (من آوى محدثا)، واتە: پەنای دەدات و بەرگری لێ دەکات، (الاحداث) لە دین دا دەگرێتەوە، وەک بیدعە و ئەوەی جەهمی و موعتەزیلە و بێجگە لە ئەمانە دایان هێناوە، الاحداث لە کاروباری ئوممەتیش دەگرێتەوە، وەک تاوانەکان و شتی تری وەک ئەمانە، هەر کەسێک پەنای بدات نەفرەتی لێ کراوە، هەروەها کەسێک سەری بخات هەمان شتە، چونکە پەنادان بۆ ئەوەیە تاکو ئازاری لەسەر لابچێت، هەر کەسێک سەری بخات تاوانی گەورەترە، ئەوەی بیدعەی داهێناوە یان تاوانی کردووە تاوانبارترە، چونکە ئەگەر پەنادانی هۆکاری نەفرەت بێت، کەواتە خودی تاوانەکە گەورەترە، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ترسناکی شت داهێنان لە دین، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: (ئاگادار بن لە شتی داهێنراو، چونکە هەموو داهێنانێک لەدین دا گومڕاییە)، مانای فەرموودەکە وایە ئەگەر چی داهێنراوەکە کەمیش بێت[٢].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە بڵێیت نەفرەتی خوا لەو کەسانە بێت کە ئەم کردەوانە دەکەن.

---

[١] القول المفيد (٢٨٠-٢٨٧).

[٢] القول المفيد (١/٢٨٠-٢٨٧).

**وعن طارق بن شهاب، أن رسول الله (ﷺ) قال: (دخل الجنة رجل في ذباب، ودخل النار رجل في ذباب) قالوا: وكيف ذلك يا رسول الله؟! قال: (مر رجلان على قوم لهم صنم لا يجوزه أحد حتى يقرب له شيئا، فقالوا لأحدهما قرب قال: ليس عندي شيء أقرب قالوا له: قرب ولو ذبابا، فقرب ذبابا، فخلوا سبيله، فدخل النار، وقالوا للآخر: قرب، فقال: ما كنت لأقرب لأحد شيئا دون الله عز وجل، فضربوا عنقه فدخل الجنة) [رواه أحمد].**

واته: له تاريقى كوڕى شيهابەوە ڕیوایەت كراوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: (بە هۆی مێشێكەوە پیاوێک چووە بەهەشت، هەر بەهۆی مێشێكەوە پیاوێكیش چووە ئاگری دۆزەخ، گوتیان چۆن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: دوو پیاو بەلای قەومێكدا گوزەریان كرد (تێپەرین) كە بتێكیان هەبوو لێ نەدەگەڕان هیچ كەس بە نزیكیدا تێبپەڕێ هەتا شتێكی نەكردبایە بە قوربانی بۆ ئەو بتە، وتیان بە یەكێكیان قوربانی بكە بۆ بتەكەمان، وتی: هیچم نیە بیكەم بە قوربانی، وتیان: خۆت نزیک بكەوە لە بتەكە، واتە قوربانیەک بكە با مێشێكیش بێت هەر تەواوە، ئەویش مێشەكەی كرد بە قوربانی، ئەوانیش ڕێگەیان بەردا و چووە ئاگری دۆزەخەوە، بەوەی تریشیان وت: قوربانیەک بكە، ئەویش ووتی: قوربانی بۆ هیچ كەس ناكەم جگە لە خوا، لەبەر ئەوە دایان لە گەردەنی و كوشتیان و چووە بەهەشتەوە).

**ڕاڤەی وشەكانی ئەثەرەكە:**

**(في ذباب):** واتە: بەهۆی مێشەوە، پیتی (في) بۆ هۆكارە نەک ظرف.

**(فضربوا عنقه):** واتە: لە ملی دا و كوشتی.

**هۆكاری باسكردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم ئەثەرەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە چ وەعیدێک هاتووە بۆ ئاژەڵ سەربڕین بۆ بێجگە لەخوا.

## سوودەکانی ئەثەرەکە:

**١-** وتەی ڕاست ئەوەیە ئەمە وتەی سەلمانی فارسی یە نەک وتەی پێغەمبەر (ﷺ).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (فەرموودەکە دوو عیلەتی هەیە:

یەکەم: تاریقی کوری شیهاب هەموو زانایان یەک دەنگن کە گوێی لە پێغەمبەر نەبووە (ﷺ)، جیاوازی لەوەدایە کە هاوەڵی پێغەمبەر بووە، زۆربەیان دەڵێن هاوەڵی بووە، بەڵام ئەگەر بڵێین: هاوەڵی پێغەمبەر بووە هیچ زیانی پێ ناگەیەنێت کە گوێی لە پێغەمبەر نەبووە، چونکە مرسلی صحابی حوجەیە، ئەگەر بێجگە لە صحابی بێت، ئەوا مرسلی بێجگە لە صحابی یە، ئەوا لەبەشی لاوازەکانە.

دووەم: فەرموودەکە لە عن عنە لە ڕووی ئەعمەشەوە کە لە مودلیسەکانە، ئەمە ئافاتە لە فەرموودە، فەرموودەکە لە نەفسدا شتێکی هەیە لەبەر ئەم دوو عیلەتە، هەروەها فەرموودەکە عیلەتی تریشی هەیە.

سێیەم: ئیمام ئەحمەد روایەتی کردووە لە تاریق ئەویش لە سلمان بە موقوفی، واتە: وتەی سەلمانە نەک وتەی پێغەمبەر، هەروەها ابو نعيم و ابن ابی شیبەش ڕیوایەتیان کردووە، لەوانەیە سەلمان وەریگرتبێت لە نەوەی ئیسرائیل)[1].

شێخ الالبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (یەکەم: فەرموودە دانە پاڵ پێغەمبەر هەڵەیە، چونکە وتەی پێغەمبەر نییە (ﷺ) بەڵکو ووتەی صحابی یە.

---

[1] القول المفيد (١/٢٨٨-٢٨٩).

دووەم: بەشێوەیەکی گشتی فەرموودە دانە پاڵ ئیمام ئەحمەد جێگای تێڕوانینە، چونکە وا گومان دەبرێت لە مسندی ئیمام ئەحمەد هەیە، کەچی وانیە لە کتابی الزهد دا هەیە لاپەرە ١٥.

فەرموودەکە ڕاستە بە موقوفی لەسەر سەلمانە خوا لێی ڕازی بێت و ئەوەی دیار بێت لە نەوەی ئیسرائیل گێراویەتەوە)[١].

**٢-** هەندێ زانا ئەم ئەثەرە دەکەنە بەڵگە کە زۆری لێ کردن تەنها بە وتە روخسەت دراوە کوفر بکەیت بەکردەوە نابێت کوفر بکەیت.

کەواتە: هەندێ زانا دەڵێن تەنها بۆ ووتە ڕوخسەت دراوە کوفر بکەیت، بەڵگە:

- ئەثەرەکە باسی مێش دەکات، زۆری لێکراوە کەچی چووە ناو ئاگر، بەڵگەیە کە کوفر بە کردەوە ڕوخسەت نەدراوە.

- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَـٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَـٰنِ﴾، واتە: هەر کەسێک دوای ئیمان هێنان کافر بێتەوە بێگومان سزای توندی بۆ هەیە، ئیلا کەسێک زۆری لێ کرابێت لەو کاتەش دڵنیا بێت لەوەی کە دڵی پڕە لە ئیمان.

ابن عباس خوا لێیَ ڕازی بێت دەفەرموێت: (موشریکەکان زۆر ئازاری عەمماری کوڕی یاسریان دا بە ڕادەیەک گەیشتە حاڵەتێک خەریک بوو لە ژێر سزادا تیابچێت، ئەوسا لەبەر ناچاری بە دڵێکی پڕ لە ئیمانەوە ئەوانی ڕازی کرد، جا دواتر هاتە لای پێغەمبەر و کارەساتەکەی بۆ گێرایەوە، ئەویش پێی فەرموو: لەو کاتە دڵت چۆن بوو؟ عەمار گوتی:

[١] سلسلة الأحاديث الفقهية (٧٢٢/١٢).

دڵنیا بووم لە ئیمان، فەرمووی: ئەگەر ئەم جارەش دووبارە بوویەوە، تۆش جاران چیت گوتبوو بیڵێرەوە، عەمار زۆری لێکرا بۆ کوفر کردن بە وتە نەک کردەوە، ئەمە بەڵگەیە کە تەنها بە وتە ڕوخسەت دراوە.

وتەی ڕاست هیچ جیاوازی نییە لەنێوان وتە و کردەوە، بەڵگە:

- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ﴾، ولم يقل: (بالقول)، واتە: نەی فەرموو: هەر کەسێک کوفر بکات بە وتە، کەواتە ئایەتەکە گشتی یە، وتە و کردەوە دەگرێتەوە مەگەر بەڵگە هاتبێت و جیاوازی خستبێتە نێوان وتە و کردەوە، کەچی هیچ بەڵگە نەهاتوون.

- ئەوەی زۆری لێ بکرێت و زینای لەگەڵ بکرێت حەددی لەسەر جێ بەجێ ناکرێت، بەڵگەیە زۆر لێکردن بە وتە و کردەوە ڕووخسەت دراوە.

وەڵام بۆ ئەوانەی دەڵێن زۆری لێکردن بۆ کوفر تەنها بە وتە ڕوخسەت دراوە:

فەرموودەی باسی چیرۆکی مێش دەکات:

١- هەندێ زانا دەڵێن لاوازە.

٢- ئەگەر فەرموودەکە ڕاستیش بێت ئەوە وتەی پێغەمبەر نییە، بەڵکو وتەی هاوەڵی پێغەمبەرە لە نەوەی ئیسرائیل گێڕاویەتەوە.

٣- ئەگەر ڕاست بێت دەڵێین بۆ ئوممەتەکانی پێشتر ڕوخسەت نەدرابوو بۆ کوفر کردن بە کردەوە یان بە وتە و کردەوە پێکەوە.

محمد الامين الشنقطی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەوەی زانراو بێت ئەوەی لە نەوەی ئیسرائیل دەگێڕدرێتەوە هەواڵ کە بە ئیسرائیلیات بە ناوبانگە سێ حاڵەتن، لە

یەک حاڵەت واجبە بەڕاستی دابنێی ئەگەر قورئان و سوننەت بەڵگە بێت لەسەر ڕاستی یەکەی، لە حاڵەتێکدا واجبە بە درۆی بخەیتەوە ئەگەر قورئان و سوننەت بەڵگە بێت لەسەر درۆییەکەی، لە حاڵەتی سێیەم نابێت بە درۆی بزانی و نابێت بە ڕاستی بزانی، ئەگەر لە قورئان و سوننەت بەڵگە نەهاتبێت بۆ بەڕاست دانانی و بە درۆخستنی)[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (الإسرائیلیات: هەواڵی نەقل کراوە لە نەوەی ئیسرائیل لە جوولەکە و گاور بەڵام لە جوولەکە زیاتر نەقل کراوە، ئەم هەواڵانە دابەش دەکرێن بۆ سێ بەش:

یەکەم: ئەوەی ئیسلام دانی پێداناوە و شایەتی داوە بۆ ڕاستی ئەوە کە حەقە و ڕاستە.

نموونە: فەرموودەی ابن مسعود رواه البخاري یە دەفەرموویێت: زانایەکی جوولەکە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی محمد خوای گەورە ڕۆژی قیامەت ئاسمانەکان لەسەر پەنجە دادەنێت و هەموو دروستکراوانی تر لەسەر پەنجە دادەنێت و دەفەرموویێت: من مەلیکم، پێغەمبەر (ﷺ) پێدەکەنێت هەتا ددانی بەدیار دەکەوێت وەک بە ڕاست دانانی هەواڵی زانای جوولەکە، پاشان ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە کە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ٦٧﴾ [الزمر: ٦٧]

دووەم: ئەوەی ئیسلام بەدرۆی خستۆتەوە و شایەتی داوە بە درۆی ئەوە پووچە.

---

[1] أضواء البيان (٢٠٣/٤-٢٠٤).

نموونە: فەرموودەی جابر رواه البخاري یە دەفەرموویت: جوولەکە دەیان وت ئەگەر بچیتە لای خێزانی خۆت لەپشتەوە ئەوە منالْ خێل دەردەچێت (واتە چاوی تەواو نابێت)، ئایەت دابەزی: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ﴾ [البقرة: ٢٢٣].

سێیەم: ئەوەی ئیسلام دانی پیا نەناوە و ئینکاریشی نەکردووە، دەبێت لەمەیان بوەستیت.

نموونە: فەرموودەی ئەبو هریرە رواه البخاري یە دەفەرموویت: ئەهلی کتاب تەوراتیان دەخوێندەوە بە زمانی عیبری و تەفسیریان دەکرد بە زمانی عەرەبی بۆ ئەهلی ئیسلام، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەهلی کتاب بەڕاستیان مەخەنەوە و بەدرۆیان مەخەنەوە، وە بلێن: ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾ [العنكبوت: ٤٦]، بەڵام باسکردنی دروستە، ئەگەر شتی خراپی لێ نەکەوێتەوە.

بەڵام نابێت پرسیار لە ئەهلی کتاب بکرێت بۆ کاروباری دین، چونکە فەرموودەی جابر رواه احمد دەفەرموویت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (پرسیاری هیچ شتێک لە ئەهلی کتاب مەکەن، چونکە ئەوان ڕێنموویتان ناکەن بەڵکو گومڕاتان دەکەن)[1].

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەگەر یەکێک بڵێت: ئەوەی مێشی کردە قوربانی ئایا داخلی سنوری زۆر لێ کردن نابێت؟ مێشی کردە قوربانی بۆ پاراستنی نەفسی خۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ [النحل: ١٠٦]، وەڵام چیە بۆ ئەمە؟

[1] تفسير ابن عثيمين / أصول في التفسير (٥٩/١-٦٠).

یەکەم: ئەمەیان شەرعی پێش ئێمە بووە، لە دینی ئەوان عوزر نەبووە بۆ زۆری لێکردن، بەڵام لە دینی ئێمە خوای گەورە ڕێگەی داوە بۆ زۆری لێکراو کوفر بکات، بەڵام زمان و دڵی پڕ ئیمان بێت و ئارام بێت بە ئیمان.

دووەم: زۆری لێکردن بۆ کوفر بۆ کەسێک دروستە کوفر بکات کە دڵی پڕ ئیمان بێت و ئارام بێت بە ئیمان، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَـٰنِ﴾، ئەمەیان دڵی ئارام نەبوو بە ئیمان، بەڵکو دڵی ئارام بوو بە قوربانی کردن، ئەمە وەڵامی دووەم بوو.

سێیەم: زۆری لێکردن وەردەگیرێت ئەگەر وتە بوو، بەڵام ئەگەر کردەوە بوو وەرناگیرێت، ئەمەیان کردەوە بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ﴾، ئەمەیان پەیوەستە بە ووتە کە عوزری بۆ هەیە بە زۆر لێکردن، بەڵام بە کردەوە نەخێر.

ئەوەی دیار بێت زۆر لێکراو عوزری بۆ هەیە جا زۆری لێ بکرێت بە وتە یان بە کردەوە، پێچەوانەی ئەوانەی جیاوازی دەخەنە نێوان وتە و کردەوە)[1].

زانایان دەڵێن دروستە موسڵمان کوفر بکات ئەگەر زۆری لێکراوە بەڵام دەبێت لە دڵەوە پێی ناخۆش بێت و دڵی پڕ ئیمان بێت، وە بە کوفر کردن لە دین دەرناچێت چونکە پێی ناخۆشە.

---

[1] شرح كتاب التوحيد لاپەرە (١٩٧-١٩٨).

ابن حزم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هەموو زانایان یەک دەنگن ئەوەی زۆری لێکراوە بە کوفرکردن و دڵی پڕ ئیمانە هیچی لەسەر نییە لە کوفر لەلای خوای گەورە)[١].

لە الموسوعة الفقهية باسکراوە دەڵێت: (هەموو فوقەهاکان یەک دەنگن لەسەر ئەوە هەر کەسێک زۆری لێ بکرێت وشەی کوفر بڵێت، ئەوە بە کافر حساب ناکرێت)[٢].

زانایان دەڵێن زۆری لێکردن ئەو کاتە ڕوخسەت دراوە وتەی کوفر بڵێت ئەگەر بزانێت دەیکوژن یان ئەندامێکی لاشەی دەبڕن، یان بە لێدان نەفسی تیابچێت یان ئەندامێکی تیابچێت، جا لێدانەکە زۆر بێت یان کەم.

لە الموسوعة الفقهية باسکراوە دەڵێت: (زۆری لێکردن دوو جۆرە:

یەکەم: جۆرێکیان مرۆڤ ناچار دەبێت و دەکەوێتە تەنگانە، وەک: زۆری لێکردن بە کوشتن و بڕین و لێدان ترسی ئەوەی هەبێت نەفسی تیابچێت یان ئەندامێکی تیابچێت، جا لێدانەکە زۆر بێت یان کەم.

دووەم: جۆرێکیان مرۆڤ ناچار نابێت وەک ئەوەی پێشووتر، وەک: بەند کردن و گرێدان و لێدانێک ترسی ئەوەی نییە تیابچێت، ئەمەیان پێی دەڵێن زۆری لێکردنی ناتەواو)[٣].

مەرجەکانی زۆری لێکردن (الاكراه):

١- دەبێت توشی ببێت و توانای ڕزگار بوونی نەبێت ئەگەر بە هەڵاتنیش بێت.

---

[١] مراتب الإجماع لاپەڕە (٦١).

[٢] الموسوعة الفقهية (١٨٢/٢٢).

[٣] الموسوعة الفقهية (١٨٢/٢٢).

٢- گومانی بە زۆری بۆ ئەوە بچێت کە تووشی دەبێت.

٣- دەبێت ئەو هەڕەشەی لێ دەکرێت یەکسەر بێت، واتە ئەو کاتە بێت، ئەگەر بڵێت تۆ فلانە شت نەکەیت سبەی لێت دەدەم، بەڵام ئەگەر دوای ماوەیەکی کەم بێت ڕوخسەت دراوە.

٤- نابێت زۆر لێکردن بۆ کوشتنی خۆی بێت یان کەسێکی تر، زانایان اجماع نەقل دەکەن کە نابێت کەسێکی تر بکوژرێت و تاوانبار دەبێت.

ئایا کەسێک زۆری لێ بکرێت بۆ کوفر ئارام بگرێت و تسلیم نەبێت باشترە یان کوفر بکات بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت؟

وەلام: ابن حجر رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ابن بطال دەفەرموێت: هەموو زانایان یەک دەنگن هەرکەسێک زۆری لێکرا بۆ کوفرکردن، کوشتنی هەڵبژارد پاداشتی زیاترە لە لای خوا لەوەی دەست بە ڕوخسەتەوە بگرێت، بەڵام بۆ بێجگە لە کوفر ئەگەر زۆری لێکرا لەسەر خواردنی گۆشتی بەراز، یان خواردنەوەی عەرەق ئەمەیان کردنی کردەوەکە باشترە)[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم بابەتە تەفسیلی تێدایە:

- تەسلیم دەبێت لە ڕووکەش و ناوەوە، ئەمەیان نابێت و هەڵگەراوەیە لە دین.

- تەسلیم دەبێت لە ڕووکەش نەک ناوەوە، بەڵام مەبەستی ڕزگار بوونە لەو زۆریەی کە لێیی کراوە ئەمەیان دروستە و ڕێگە پێدراوە.

---

[1] فتح الباری (١٢/٣٣٠-٣٣١).

- تسلیم نابێت نه له ڕووكەش و نه له ناوەوە و دەكوژرێت ئەمەیان دروستە و له ئارام گرتنە.

بەڵام كامەیان باشترە - ئارام گرتن تا دەكوژرێت- یان تسلیم بوون له ڕووكەش؟

تەفسیلی تێدایە: ئەگەر تەسلیم بوون زیانی نەبێت له سەر دینی خەڵك، باشتر وایە له ڕووكەش تەسلیم بێت نەك ناوەوە، بەتایبەتی ئەگەر مانەوەی سوودی هەبێت بۆ خەڵك، وەك: خاوەنماڵێك ماڵ دەبەخشێت بۆ سوودی خەڵك یان زانستی سوودبەخش، هەتا ئەگەر سوودیشی نەبێت مانەوەی لەناو ئیسلامدا باشترە و زیادكردنی كردەوەی باشی تێدایە، ڕوخسەت دراوە له ڕووكەش كوفر بكەیت له كاتی زۆر لێكردن باشتر وایە تأویل بكەی و له ڕووكەش تەسلیم ببیت، بەڵام ئەگەر تسلیم بوون له ڕووكەش و ئارام نەگرتن زیانی بۆ ئیسلام هەبێت، ئەوا دەبێت ئارام بگریت، چونكە له بابەتی ئارام گرتنە لەسەر جیهاد كردن له ڕێگای خوا، له بابەتی مانەوەی نەفس نییە، لەبەر ئەوە هاوەڵان گلەیی خۆیان هێنایە لای پێغەمبەر (ﷺ) له بەر ناخۆشی و ئازاردانیان له لایەن موشریكەكانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) چیرۆكی پیاوێكی پێش هاوەڵانی باسكرد كە ئازار دەدران بە ئاسن و شمشێر و ئارامیان دەگرت، هەروەك ئەوە وایە بە هاوەڵان بڵێت: ئارام بگرن لەسەر ناخۆشی.

ئەگەر لەو كاتە هاوەڵان تەسلیمی موشریكەكان ببونایە، ئەوە زیان لەسەر ئیسلام دروست دەبوو، ئیمام احمد ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەو ناخۆشیەی كە بەسەری هات ئەگەر تەسلیم ببوایا له ڕووكەش، ئەوە زیان لەسەر ئیسلام دروست دەبوو)[1].

---

[1] القول المفيد.

## باب لا يذبح لله بمكان يذبح فيه لغير الله

**وقول الله تعالى:** ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًاۚ﴾ [التوبة: ١٠٨]

**عن ثابت بن الضحاك رضي الله عنه، قال: نذر رجل أن ينحر إبلا ببوانة، فسأله النبي (ﷺ) فقال: (هل كان فيها وثن من أوثان الجاهلية يعبد)؟ قالوا: لا. قال: (فهل كان فيها عيد من أعيادهم)؟ قالوا: لا. فقال رسول الله (ﷺ): (أوف بنذرك، فإنه لا وفاء لنذر في معصية الله، ولا فيما لا يملك ابن آدم) [رواه أبو داود، وإسنادها على شرطهما]**[١].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير قوله: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًاۚ﴾.

**الثانية:** أن المعصية قد تؤثر في الأرض، وكذلك الطاعة.

**الثالثة:** رد المسألة المشكلة إلى المسألة البينة ليزول الإشكال.

**الرابعة:** استفصال المفتي إذا احتاج إلى ذلك.

**الخامسة:** أن تخصيص البقعة بالنذر لا بأس به إذا خلا من الموانع.

**السادسة:** المنع منه إذا كان فيه وثن من أوثان الجاهلية ولو بعد زواله.

**السابعة:** المنع منه إذا كان فيه عيد من أعيادهم ولو بعد زواله.

**الثامنة:** أنه لا يجوز الوفاء بما نذر في تلك البقعة، لأنه نذر معصية.

---

[١] رواه أبو داود (٣٣١٣).

**التاسعة:** الحذر من مشابهة المشركين في أعيادهم ولو لم يقصده.

**العاشرة:** لا نذر في معصية.

**الحادية عشرة:** لا نذر لابن آدم فيما لا يملك.

# باب لا یذبح لله بمکان یذبح فیه لغیر الله

## نابێت لە شوێنێکدا قوربانی و سەربڕین بکرێت کە لەوێدا قوربانی و سەربڕینی تێدا بکرێت بۆ بێجگە لەخوا

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مەبەست لەم بابە: دانەری کتاب دەیەوێت ڕوون بکاتەوە نابێت ئیماندار خۆی بچووێنێت بە ئەهلی خراپە و نابێت بەژداریان لەگەل بکات لە شوێنی تاوان و شوێنی عیبادەتی بێجگە لەخوا کردن، هەتا ئەگەر چی شتەکە سەربڕینیش نەبێت شتی تر بێت، بۆ ئەوەی نەدرێتە پاڵ ئەوان و بەژدار نەبن لەگەڵیان، ئەگەر ئاژەڵ سەربردرا لەو شوێنەی ئاژەڵ بۆ بێجگە لەخوا لەو شوێنە سەر دەبڕدرێت، ئەوە کەسەکە دەدرێتە پاڵ کەسی خراپ، یان گومانی خراپ پێی دەبردرێت، ئیماندار دەبێت دوور بێت لەم هەموو شتانە)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (چونکە سەربڕین لەم شوێنە ئەگەر چی بۆ خواشە بەڵام سەردەکێشێت بۆ شیرک، هەروەها سەربڕین لەم شوێنە بەگەورە دانانە بۆ ئەم شوێنە و خۆ چوواندنە بە موشریکەکان، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەو هۆکارانە کە سەردەکێشن بۆ تووش بوون بە شیرک، نموونە: نەهی کراوە نوێژ خوێن نوێژ بکات ڕووەو گۆڕ ئەگەر چی نوێژ تەنها بۆ خوا دەکات، وە نەهی کراوە لە دوعا کردن لەلای گۆڕ ئەگەر چی ئەوەی دوعا دەکات تەنها داوا لەخوا دەکات، ئەم شوێنە ناگونجێت عیبادەت تێیدا بکرێت، چونکە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک، هەروها نەهی کراوە لەوە نوێژ بکەیت کاتی خۆر ئاوابوون، چونکە هۆکارە بۆ عیبادەت کردنی، چونکە موشریکەکان سوجدەیان دەبرد کاتی خۆرئاوابوون، هەروها نەهی کراوە لە

---

[١] التعلیق المفید لاپەڕە (٨٣).

سوجده بردن کاتی خۆرهەڵاتن، چونکە موشریکەکان ئەو کات سوجدەیان بۆ دەبرد، هەموو شوێنێک و کاتێک موشریکەکان کردبێتیانە شوێن و کاتی عیبادەت کردن، ئەوە نەهی لە ئێمە کراوە بەژدارییان بکەین، وە فەرمان بە ئێمە کراوە خۆمان بەدوور بگرین، ئەمە لەبەر پارێزگاری کردنە لە تەوحید و داخستنی دەرگای تووش بوون بە شیرکە، هەروەها لەبەر نەهێشتنی خۆ چوواندنە بە موشریکەکان)[1].

صالح الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: ("الباء" بەمانای ظرفية دێت وە بە مجاورة دێت، نموونە: مررت بزيد، واتە: تێپەڕبووم بە شوێنێکی نزیک زەید، یان تێپەڕبووم بە شوێنی تەنیشت زەید، بەڵام بە مانای ظرفية مانای خودی شوێنەکە دەدات، لێرە هەردوو مانا هەڵدەگرێت)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (٢٤١/١-٢٤٢).

[2] التمهيد لاپەڕە (١٥٢-١٥٣).

**وقول الله تعالى:** ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًاۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴿١٠٨﴾﴾ [التوبة: ١٠٨]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (هەرگیز لەو مزگەوتەدا ڕامەوەستە بۆ نوێژ کردن (چونکە) بەڕاستی مزگەوتێک شایستەیە کە تۆ تیایدا بوەستیت بۆ نوێژ کردن تیایدا کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقواو خواناسی دروستکراوە، (چونکە) لەو مزگەوتەدا چەند کەسانێکی مەردی تیادایە کە زۆر حەز دەکەن خۆیان خاوێن ڕابگرن (لە دەروون و ڕواڵەتدا)، خوایش بەردەوام ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاک ڕادەگرن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:**

﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾: هەرگیز نوێژ لەو شوێنە مەکە، (قیام): مەبەست پێی نوێژە، چونکە وەستان بە پێوە یەکێکە لە گەورەترین ڕوکنەکانی نوێژ کە قورئانی تێدا دەخوێندرێت، ئەم نەهی یە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەکەیەتی.

﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا﴾: لە ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) بە خەلکی (قباء)ی فەرموو: (خوای گەورە مەدحی ئێوە دەکات)، گوتیان: ئێمە کاتی تارەت گرتن دوای بەکارهێنانی بەرد ئاویش بەکاردەهێنین[1].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

---

[1] رواه البزار بسند ضعيف، لكن الحديث له شواهد كثيرة يصح بها.

خوای گەورە نەهی کردووە لە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژ بکات لە مزگەوتی ضرار، ئەوەی دیار بێت نوێژ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە مزگەوتی ضرار، وە نوێژی ئیمانداران بە پاکی بۆ خوای گەورە بووە، لەگەڵ ئەوەش نەهی کراوە لە نوێژ کردن لەم شوێنە، نییەتی زیان و دووبەرەکی و پلان دانانیان نییە، بەڵام نەهی کراوە لە نوێژ کردن لەم شوێنە، لەبەر بەژدار بوون لەگەڵیان و خۆ چوواندن بەوان و خەڵک گومرا بوون بەو شوێنە.

ئەم شێوەیە لە ئاژەڵ سەربڕین بۆ خوا لە شوێنێک ئاژەڵ بۆ بێجگە لەخوا سەرببڕدرێت دا هەیە، ئەگەر چی بە پاکی بۆ خوای گەورە دەکات، بەڵام بانگەوازی بەگەورە دانانی ئەو شوێنە دەکات بە کردەوە، ئەگەر چی مەبەستی بەگەورە دانانیشی نییە[١].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** باوکی عامری فاسق پیاوێک بوو کتێبەکانی سەردەمی نەزانینی خوێندبووەوە، عیبادەتی خوای گەورەی دەکرد تا وای لێ هات پێیان دەگوت: باوکی عامری ڕاهب، خەڵک بەگەورەیان دادەنا لەبەر ئەوە بە کەسێکی ئایینی ناسراو ببوو، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) هیجرەتی کرد بۆ مەدینە باوکی عامر تووشی حەسوودی بوو کوفری پێی کرد و ڕقی لە پێغەمبەر بووەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا بە باوکی عامری فاسق، چونکە دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوا و کوفری بە پێغەمبەری خوا کرد.

پاشان ئەم کافرە چووە شام لای گاورەکان، لە شامەوە نامەی نووسی بۆ کۆمەڵێک لە دووڕووەکان لە مەدینە کە هەڵبستن بە دروستکردنی شوێنێک بۆ کۆبوونەوە و گفتوگۆکردن، دەیانویست ئەم شوێنە بکەنە شوێنی کۆبوونەوە بۆ دژایەتی کردنی پێغەمبەر، گفتوگۆ و پرس و ڕا بەیەکتر بکەن بۆ فێڵ کردن لە ئیسلام، ئەمانە جورئەتیان

---

[١] التمهيد لاپەڕە (١٥٣-١٥٤).

نەبوو بە شێوەیەكی ئاشكرا شوێنێک دروست بكەن، بۆیە بەناوی مزگەوتەوە شوێنێكیان دروستكرد، گوتیان: ئەم مزگەوتەمان دروستكردووە بۆ كەسی لاواز و نەخۆش و شەوی باراناوی، داوایان لە پێغەمبەر كرد (ﷺ) نوێژ لەو مزگەوتەدا بكات، دەیانویست شتەكە داپۆشن و فێڵ بكەن.

پێغەمبەر (ﷺ) بەڵێنی پێیاندا فەرموو: (ئێمە لە سەفەرین لە غەزوەی تەبوک، (إن شاء الله) ئەگەر گەڕاینەوە نوێژی تێدا دەكەین)، كاتێک پێغەمبەر (ﷺ) لە تەبوک گەڕاوە شەوێک یان دوو شەوی نەخایاند وەحی لە ئاسمانەوە بۆ هات، خوای گەورە فەرمووی: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾، خوای گەورە مەبەستە پیسەكەیانی ڕوونكردەوە لە دروستكردنی ئەم مزگەوتە)[1].

**٢-** نەهی كردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژ ئەنجام دان لە مزگەوتی (ضرار)، ئەم نەهی یە بۆ پێغەمبەرە و بۆ ئیماندارانیشە، لەبەر وتەی: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾.

**٣-** نەهی كردن لە نوێژكردن لە شوێنی تاوان و خۆ دوورخستنەوە لەو شوێنە، تاوان كاریگەری لەسەر شوێن هەیە هەروەک چۆن تاوانی دووڕووەكان كاریگەری لەسەر مزگەوتی (ضرار) هەبوو.

نیەت كاریگەری لەسەر شوێنەكان و دروستكردنی شوێنەكە هەیە، نیەتی پیس كاریگەری لەسەر شوێنەكە هەیە و پووچی دەكات، نیەتی باش كاریگەری لەسەر شوێنەكە هەیە و خێر و بەرەكەتی تێ دەخات، بەڵگەیە لەسەر هاندان بۆ چاككردنی

[1] إعانة المستفيد (٢٤٢/١-٢٤٣).

مەبەستەکان، بەڵگەیە گرینگ مەبەستە نەک ڕووکەش، ئەمانە لە ڕووکەشدا مزگەوتیان دروستکرد، بەڵام مەبەستیان مزگەوت نەبوو.

**٤-** هەندێک زانا ئەم ئایەتە: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾، دەکەنە بەڵگە باش نییە نوێژ لە کەنیسە بکەیت، زانایان دەڵێن نوێژ کردن لەناو کەنیسە دوو حاڵەتە:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر کەنیسە وێنەی تێدا نەبێت، لەم حاڵەتە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان:

یەکەم: هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون باش نییە نوێژ لە کەنیسە بکرێت، بەڵگە:

- چونکە شوێنی کوفر و شەیتانەکانە.

- نوێژکردن لەو شوێنە سەردەکێشێت بۆ بەگەورە دانان و زۆر بوونیان لەم شوێنە.

دووەم: هەندێک زانای تر بۆ ئەوە چوون دروستە نوێژ لە کەنیسە بکرێت ئەگەر وێنەی تێدا نەبێت، بەڵگە:

- هیچ فەرموودە نەهاتوون نەهی کردبێت لە نوێژکردن لە کەنیسە.

- هاوەڵان نوێژیان کردووە لە کەنیسە، بەڵگەیە دروستە نوێژ لە کەنیسە بکەیت.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر کەنیسە وێنەی تێدا بێت، لەم حاڵەتە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان:

یەکەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون باش نییە نوێژی تێدا بکەیت.

دووەم: هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون حەرامە نوێژی تێدا بکەیت، بەڵگە:

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویێت: (فریشتەی ڕەحمەت ناچنە ماڵێک سەگ و وێنەی تێدابێت)[١].

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەوەی ڕاست بێت لە عومەری کوڕی خەتاب و کەسانی تر نەقل کراوە، وە لە ئیمام ئەحمەد و کەسانی تر ئەوەیە ئەگەر کەنیسە وێنەی تێدا بوو نوێژ تێیدا مەکە، چونکە فریشتەکان داخلی ماڵێک نابن وێنەی تێدا بێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەچووە ناو کەعبە هەتا وێنەی ڕەش نەکردەوە، هەروەها عومەر دەفەرموویێت: ئێمە داخلی کەنیسەکانیان نابین ئەگەر وێنەی تێدا بێت و لەبەر وێنە داخل نابین، نوێژ لە مزگەوتێکیش نابێت ئەگەر دروست کرابێت لەسەر گۆڕ)[٢].

ابن المنذر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت نوێژ کردن لە کەنیسە، هەندێک بۆ ئەوە چوون باش نییە نوێژی تێدا بکەیت ئەگەر پەیکەری تێدا بوو، عومەر بە پیاوێکی گاوری گوت: ئێمە داخلی کەنیسەکانی ئێوە نابین لەبەر وێنە، ابن عباس و مالکیش پێیان باش نەبووە لە کەنیسە بکرێت، لەبەر ئەو وێنانەی تێدانە)[٣].

ابن قدامة ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هیچی تێدا نییە نوێژ بکەیت لە کەنیسەیەکی پاک، ڕوخسەتیان داوە حەسەن و عومەری کوڕی عبدالعزيز و شەعبی و ئەوزاعی و سەعیدی کوڕی عبدالعزيز، هەروەها نقل کراوە لە عومەری کوڕی ئەبو موسا، ابن عباس و مالک پێیان باش نەبووە لەبەر وێنە، ...)[٤].

[١] رواه البخاري (٣٢٢٥)، ومسلم (٢١٠٦).

[٢] مجموع الفتاوى (٢٢/١٦٢).

[٣] الأوسط (٢/٣١٨).

[٤] المغني (١/٤٠٧).

پرسیار کراوە لە شیخ الإسلام ابن تیمیة: ئایا دروستە نوێژ لە کەنیسە بکەیت ئەگەر وێنەی تێدا بێت یان نە؟ ئایا بە کەنیسە دەوترێ ماڵی خوا یان نە؟

لە وەڵام دا دەفەرموویێت: (کەنیسەکان ماڵی خوا نین، بەڵکو ماڵی خوا مزگەوتەکانن، بەڵکو ماڵێکە کوفری تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەگەر چی هەندێک جار زیکری تێدا دەکرێت، ماڵەکان هی خاوەنەکانیەتی، ئەهلی کوفرن، کەواتە ماڵی عیبادەتی کافرەکانە.

سەبارەت بە نوێژ کردن لەناو کەنیسە سێ وتە هەیە:

- مەزهەبی ئەحمەد و کەسانی تر ئەوەیە ڕێگری کراوە بە ڕەهایی، ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی مالک.

- هەندێکی تر بۆ ئەوە چوون دروستە نوێژ لە کەنیسە بکەیت بە ڕەهایی (مطلق)ی.

- هەندێک زانای تر بۆ ئەوە چوون ئەگەر وێنەی تێدا بوو دروست نییە نوێژ تێیدا بکەیت، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و کەسانی تر، بە صحیحی نەقل کراوە لە عومەری کوڕی خەتاب و کەسانی تر)[1].

سەبارەت بە نوێژ کردن لە کەنیسە ئەگەر وێنەی تێدا بوو زانایان دەڵێن نوێژی پوچ نییە.

**٥-** نابێت لە شوێنێکدا قوربانی و سەربڕین بکرێت کە لەوێدا قوربانی و سەربڕینی تێدا بکرێت بۆ بێجگە لەخوا، لەبەر وتەی: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾، چونکە سەربڕین لەم شوێنە ئەگەر چی بۆ خواشە، بەڵام سەردەکێشێت بۆ شیرک، هەروەها سەربڕین لەم شوێنە بەگەورە دانانە بۆ ئەم شوێنە و خۆ چوواندنە بە موشریکەکان، پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لەو هۆکارانە کە سەردەکێشن بۆ تووش بوون بە شیرک، نموونە: نەهی کراوە نویژ خوێن

[1] فتاوی الکبری (٢/٥٩).

نوێژ بکات ڕووەو گۆڕ ئەگەر چی نوێژ تەنها بۆ خوا دەکات، نەهی کراوە لە دوعاکردن لەلای گۆڕ ئەگەر چی ئەوەی دوعا دەکات تەنها داوا لەخوا دەکات، ئەم شوێنە ناگونجێت عیبادەت تێیدا بکرێت، چونکە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک، هەروها نەهی کراوە لەوە نوێژ بکەیت کاتی خۆر ئاوابوون، چونکە هۆکارە بۆ عیبادەت کردنی، موشریکەکان سوجدەیان دەبرد کاتی خۆرئاوابوون و خۆرهەڵاتن، نەهی کراوە لە سوجدە بردن کاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون، چونکە موشریکەکان ئەو کات سوجدەیان بۆ دەبرد، هەموو شوێنێک و کاتێک موشریکەکان کردبێتیانە شوێن و کاتی عیبادەت کردن، ئەوە نەهی لە ئێمە کراوە بەژدارییان بکەین، فەرمان بە ئێمە کراوە خۆمان بەدوور بگرین، ئەمە لەبەر پارێزگاری کردنە لە تەوحید و داخستنی دەرگای تووش بوون بە شیرکە، هەروەها لەبەر نەهێشتنی خۆچوواندنە بە موشریکەکان.

لەوانەیە یەکێک پرسیار بکات بۆچی دروستە نوێژ لە کەنیسە بکەیت، بەڵام دروست نییە ئاژەڵ لە شوێنێک سەربڕین بۆ خوا کە لەو شوێنە ئاژەڵ بۆ بێجگە لەخوا سەربڕدرێت؟

وەڵام: زانایان دەڵێن نەهی لە پێغەمبەر کراوە (ﷺ) نوێژ بکات لە مزگەوتی ضرار، چونکە نوێژی موسڵمانان و دووڕووەکان یەک شێوەیان هەیە، بەڵام نوێژی موسڵمانان و گاورەکان لێک جیاوازن، هەر کەسێک موسڵمانێک ببینێت لە کەنیسە نوێژ بکات دەزانێت ئەمە موسڵمانە.

سەبارەت بە ئاژەڵ سەربڕین چ موسلمان بێت یان کافر یەک شێوەی سەربڕین هەیە، ئەویش چەقۆ بە ملی ئاژەڵدا هێنانە، بۆیە موسڵمان و کافر لێک جیاناکرێنەوە.

**٦-** واجبی خۆپاراستن لە مزگەوت دروستکردن بە نییەتی زیان گەیاندن.

**٧-** نابێت مزگەوت دروست بکرێت بە مەبەستی ناکۆکی خستنە نێوان موسڵمانان.

**٨-** باشتر وایه نوێژ لەو مزگەوتە بکرێت کە لەسەر تەقوا دروستکراوە و دامەزراوە لە یەکەم ڕۆژەوە، مزگەوتی قوبا و مزگەوتی حەڕام، لەبەر وتەی: ﴿لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ﴾.

**٩-** تاعەت و عیبادەت کاریگەری لەسەر شوێن هەیە، لەبەر ئەوە مزگەوتی قوبا فەزلی خۆی هەبوو و هەموو شەممەیەک پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی دەکرد و نوێژی تێدا دەکرد و هانی خەڵک دەدات بۆ سەردان کردنی.

**١٠-** فەزلی ئەهلی مزگەوتی قوبا و مەدح کردنیان، لەبەر وتەی: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾.

**١١-** خۆشەویستی خوای گەورە بۆ ئەوانەی خۆیان بە پاک ڕادەگرن، لەبەر وتەی: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾.

**١٢-** جێگیرکردنی سیفەتی خۆشەویستی بۆ خوای گەورە.

**١٣-** ئارەزوو خستنەسەر خۆ بە پاک ڕاگرتن و هاندان، خۆ پاککردنەوە لە شیرک و تاوان و خۆ پاککردنەوە لە پیسایی و بێ نوێژی.

**١٤-** مەبەستی لە دروست کردنی مزگەوتی ضرار ئەمە بوو:

- بۆ ئەوەی زیان بە مزگەوتی قوبا بگەیەنن، هەر لەبەر ئەوەش پێی دەڵێن مزگەوتی ضرار.

- بۆ ئەوەی کوفر بەخوا تێیدا بکەن، چونکە ئەوانەی ئەم مزگەوتەیان دروست کرد دووڕووەکان بوون.

- بۆ ئەوەی دووبەرەکی بەرپا بکەن لەنێوان موسلمانان.

- بۆ ئەوەی دوژمنایەتی و جەنگ دژی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن.

**عن ثابت بن الضحاك رضي الله عنه، قال: نذر رجل أن ينحر إبلا ببوانة، فسأله النبي (ﷺ) فقال: (هل كان فيها وثن من أوثان الجاهلية يعبد)؟ قالوا: لا. قال: (فهل كان فيها عيد من أعيادهم)؟ قالوا: لا. فقال رسول الله (ﷺ): (أوف بنذرك، فإنه لا وفاء لنذر في معصية الله، ولا فيما لا يملك ابن آدم) [رواه أبو داود، وإسنادها على شرطهما]**[1].

واته: له ثابتی كوڕی ضحاك دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پیاوێک نەزرێكی كرد وشترێک سەربڕێت لە ناوچەی بەوانە. پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد، فەرمووی: (ئایا لەو شوێنە هیچ پەیكەرێک لە پەیكەرەكانی جاهلی لێ بووە كە پەرسترابێت؟)، گوتیان: نەخێر، فەرمووی: (ئایا شوێنی كۆبوونەوەی "ساڵانە یان مانگانە یان هەفتانەی" ئەوان نەبووە؟)، گوتیان: نەخێر، پێغەمبەری خوا (ﷺ): (وەفا بە نەزری خۆت بكە، چونكە نابێت نەزرێک بەجێ بهێنرێت كە بێ فەرمانی خوای تێدا بێت، وە نابێت نەزر بە شتێک بكرێت كە مالی خۆی نەبێت).

## ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(أن ينحر إبلا):** النحر: سەربڕینی وشترە، ئەمەیان تایبەتە بە وشتر، بەڵام ذبح: بۆ سەر بڕینی مەڕ و بزن و مانگا بەكاردێت.

**(ببوانة):** شوێنێكە دەكەوێتە نێوان مەككە و مەدینە، وتراوە لە نزیک مەككەیە لە سەعدی یە.

**(فيما لا يملك ابن آدم):** ئەم ڕستەیە ئەگەری دوو مانای هەیە:

---

[1] رواه أبو داود (٣٣١٣).

١- شتێک مولکی کەسەکە نەبێت، وەک ئەوەی بڵێت لەسەرم نەزر بێت بەندەی فلانە کەس ڕزگار بکەم.

٢- شتێک لە توانای کەسەکەدا نییە، وەک ئەوەی بڵێت نەزر بێت لەسەرم بە دەست بفڕم.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی روون بکاتەوە نابێت ئاژەڵ لە شوێنی پەیکەر و بۆنەی موشریکەکان سەرببڕدرێت.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت ئاژەڵ بۆ خوا سەرببڕیت لە شوێنێتک ئاژەڵ بۆ بێجگە لەخوا سەربڕدرابێت لەو شوێنە، حیکمەت لەمە:

- سەر دەکێشیت بۆ خۆچوواندن بە کافرەکان.

- سەر دەکێشێت بۆ گومڕابوونی خەڵک، چونکە ئەگەر یەکێک ببینێت ئاژەل لە شوێنی موشریکەکان سەردەبڕدرێت وا گومان دەبات کردەوەی موشریکەکان دروستە.

- موشریکەکان بەهێز دەبن و هان دەدرێن لەسەر کردەوەی خۆیان.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەزری عیبادەت واجبە وەفای پێ بکرێت[(١)].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە نەزری تاوان بکرێت، وە حەڕامە وەفا بە نەزری تاوان بکرێت، وەک ئەوەی نەزر بکات فلانە کەس بکوژێت، یان نەزر بکات ئاژەڵ بۆ بێجگە

---

(١) إعانة المستفيد (٢٤٧/١).

له خوا سەرببڕێت، یان نەزر بكات ئاژەڵ سەرببڕێت له شوێنێك لەو شوێنه ئاژەڵ سەرببڕدرێت بۆ بێجگه لەخوا، هەروەها بەڵگەیه حەڕامه وەفا به نەزری تاوان بكرێت[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه لەسەر ترسناكی ئاژەڵ سەربڕین بۆ جگه لەخوا، چونكه ئەگەر دروست نەبێت له شوێنێكدا قوربانی و سەربڕین بكرێت كه لەوێدا قوربانی و سەربڕینی تێدا بكرێت بۆ جگه لەخوا، ئەی چۆن دەبێت بۆ جگه لەخوا سەرببڕدرێت؟![٢].

**٥-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه حیكمەت له نەهی كردن له ئاژەڵ سەربڕین لەو شوێنه لەبەر ئەوەیه چونكه هۆكاره بۆ تووش بوون به شیرك[٣].

**٦-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه دەبێت پرسیار له ئەهلی عیلم بكرێت، چونكه ئەم پیاوه نەزری جێ بەجێ نەكرد مەگەر دوای پرسیاركردن له پێغەمبەر (ﷺ)[٤].

**٧-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه نابێت نەزر به شتێك بكرێت له توانای مرۆڤدا نەبێت یان موڵكی مرۆڤ نەبێت.

**٨-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه لەسەر حەڕامی خۆ چوواندن به موشریكەكان، حەرامه ئەگەر چی كەسەكه نییەتی خۆ چوواندنیشی نەبێت، وه ئەگەر نییەتی هەبێت توندتره.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ابن تیمیه دەقی هەیه لەسەر ئەوەی خۆ چوواندن مەرج نییه نییەتی لەگەڵ بێت، ڕێگری لێی دەكرێت ئەگەر چی هیچ

---

[١] إعانة المستفيد (٢٤٧/١).

[٢] إعانة المستفيد (٢٤٧/١).

[٣] إعانة المستفيد (٢٤٧/١).

[٤] إعانة المستفيد (٢٤٧/١).

مەبەستیشی نەبێت، بەڵام ئەگەر مەبەستی هەبێت توندتر دەبێت، لەبەر ئەوە محمد بن عبدالوهاب لە مەسائلەکان دەڵێت: ئەگەر نییەتی خۆ چوواندنیشی نەبێت)[١].

[١] القول المفید (٣١١/١-٣١٥).

## باب من الشرك النذر لغير الله

**وقول الله تعالى:** ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ۝٧﴾ [الإنسان: ٧]

**وقوله:** ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ﴾ [البقرة: ٢٧٠]

**وفي (الصحيح) عن عائشة رضي الله عنها، أن رسول الله (ﷺ) قال: (من نذر أن يطيع الله فليطعه، ومن نذر أن يعصي الله فلا يعصه)**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** وجوب الوفاء بالنذر.

**الثانية:** إذا ثبت كونه عبادة لله فصرفه إلى غير شرك.

**الثالثة:** أن نذر المعصية لا يجوز الوفاء به.

---

[1] أخرجه البخاري (٦٦٩٦،٦٧٠٠).

## بـــاب من الشرك النذر لغير الله

## نەزر كردن بۆ بێجگە لەخوا جۆرێكە لە شیرک

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (نەزركردن بۆ بێجگە لە خوا وەک ئەوەیە بڵێیت: بۆ فلانەكەس نەزرێكم لەسەر بێت، یان بۆ ئەم گۆڕە نەزرێكم لەسەر بێت، یان بۆ جبريل نەزرێكم لەسەر بێت, مەبەست پێی نزیک بوونەوە بێت لێیان، هەرووەها نموونەی تری هاوشێوەی ئەمانە، جیاوازی هەیە لە نێوانیان سەبارەت بەمە و نەزری تاوان: نەزری بۆ بێجگە لەخوا ئەسلەن بۆ خوا نییە و نەزری تاوان بۆ خوایە، بەڵام لەسەر تاوانێكە لە تاوانەكان، نموونە وەک ئەوەی بڵێیت: نەزرێكم لەسەر بێت بو خوا فلانە شت بكەم كە سەر پێچی خوا بێت، كەواتە نەزر بۆ خوایە وە مەنزور تاوانە، نموونەی هاوشێوەی ئەمە سوێند خواردنە بە خوا لەسەر شتێكی حەرام، سوێند خواردن بە خوا لەسەر حەرامكراو، وەک: والله دزی دەكەم، حوكمی نەزر بۆ بێجگە لە خوا شیركە، چونكە عیبادەت كردنە بۆ نەزر بۆكراو (مەنزور)، ئەگەر عیبادەت بێت بۆ بێجگە لە خوا دەبێتە شیرک، ئەم نەزرەی بۆ بێجگە لە خوا دانامەزرێت و كەفارەتی لەسەر واجب نابێت، بەڵكو شیركە و دەبێت تەوبەی لێ بكەیت وەک سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا دانامەزرێت و كەفارەتی لەسەر نییە، بەڵام نەزری تاوان دادەمەزرێت و نابێت وەفای پێ بكەی و كەفارەتی سوێندی لەسەرە، وەک سوێند خواردن لەسەر حەڕام دادەمەزرێت و كەفارەتی لەسەرە)[1].

زانایان دەڵێن نەزركردن بۆ بێجگە لە خوا دوو حاڵەتە:

---

[1] القول المفيد (٣١٦/١).

حاڵەتی یەکەم: نەزر دەکات بۆ بێجگە لەخوا و نەزر بۆ کراو بە گەورە دادەنێت یان وای دەبینێت شیاوی عیبادەت کردنە یان باوەڕی وایە سوود و زیانی بە دەستە، ئەمەیان شیرکی گەورەیە.

حاڵەتی دووەم: نەزر دەکات بۆ بێجگە لە خوا و نەزر بۆ کراو بە گەورە دانانێت و وای نابینێت شیاوی عیبادەت بێت و باوەڕی وایە سوود و زیان تەنها بە دەست خوایە، ئەمەیان شیرکی بچووکە وەک سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا، ئەگەر ئەم بیروباوەڕە پاکەشی هەبێت هەر دەبێتە شیرک.

هەندێ زانا دەڵێن نەزرکردن جیاوازە و وەک سوێند خواردن نییە بە هەموو شێوەیەک شیرکی گەورەیە، چونکە نەزر بە خاڵسی بۆ بێجگە لە خوا دەکرێت بەڵام سوێند وانییە.

پوختەی وتەی زانایان:

١- نەزرکردن بۆ بێجگە لەخوا شیرکە و دانامەزرێت، دەبێت تەوبەی لێ بکرێت و بە کەفارەت لاناچێت.

٢- نەزرکردنی تاوان دادەمەزرێت، نابێت وەفای پێ بکرێت و دەبێت کەفارەتی سوێندەکە بدات.

٣- کەسێک نەزر دەکات بۆ بێجگە لە خوا و نەزر بۆ کراو بە گەورە دادەنێت یان وای دەبینێت شیاوی عیبادەت کردنە یان باوەڕی وایە سوود و زیانی بە دەستە، ئەمەیان شیرکی گەورەیە.

٤- کەسێک نەزر دەکات بۆ بێجگە لە خوا و نەزر بۆ کراو بە گەورە دانانێت و وای نابینێت شیاوی عیبادەت بێت و باوەڕی وایە سوود و زیان تەنها بە دەست خوایە، ئەمەیان

شیرکی بچووکە وەک سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا، ئەگەر ئەم بیروباوەڕە پاکەشی هەبێت هەر دەبێتە شیرک.

هەندێ زانا دەڵێن نەزرکردن جیاوازە و وەک سوێند خواردن نییە، بە هەموو شێوەیەک شیرکی گەورەیە، چونکە نەزر بە خاڵسی بۆ بێجگە لە خوا دەکرێت بەڵام سوێند وانییە.

٥- وەفا کردن بە نەزر ئەگەر شیرک بێت واتە کردەوەکە شیرک بێت ئەمەیان گومانی تێدا نییە کە شیرکە لەبەر کردەوەی شیرکی، هەروەها نەزرکردن بە وتەش بۆ بێجگە لەخوا ئەگەر چی وەفاشی پێ نەکرێت گومانی تێدا نییە کە شیرکە، کەواتە نەزرکردن تەنها بە وەفا پێکردن نابێتە شیرک.

مەبەست بە نەزر بۆ بێجگە لەخوا شیرکی گەورەیە. گومانی تێدا نییە نەزر کردن بۆ بێجگە لەخوا شیرکی گەورەیە، لەبەر ئەوەش شیرکە بەخوا چونکە نەزر پابەندکردنی نەفسە بە عیبادەیی خوا بە مطلقی یان مقیدی، ئەمە حەقیقەتی نەزرە.

بەڵگە بۆ ئەوە کە نەزر عیبادەتە، خوای گەورە مەدحی ئەوانە دەکات کە وەفا بە نەزر دەکەن، دەفەرموویت: ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ۝٧﴾ [الإنسان: ٧]، مەدح کردنیان بەڵگەیە کە وەفا کردن بە نەزر شتێکی خۆشەویستە لای خوای گەورە و ناکرێت خۆشەویست بێت ئیلا دەبێت عیبادەت بێت و ڕێگەپێدراو بێت، کەواتە ئەمە بەڵگەیە کە عیبادەتێکە لە عیبادەتەکان، بەڵکو وەفا کردن بە نەزر واجبە، چونکە پابەند بوونە بە گوێڕایەڵی ...

لێرە و لەم شوێنە پرسیارێک هەیە کە نەزر مەکروهە و پێغەمبەر (ﷺ) پێی باش نەبووە، پرسیاری لێ کراوە و دەفەرموویت: "نەزر خێر ناهێنێت" چۆن دەبێت عیبادەت بێت و پێغەمبەر (ﷺ) پێی باش نەبوو بێت؟

وەڵام: نەزر دوو بەشە: نەزری مطلق و نەزری مقید.

جۆری یەکەم: (نەزری مطلق): ئەوەیە مرۆڤ نەفسی خۆی پابەند دەکات بە عیبادەت کردن بۆ خوا، بەم شێوەیە بێ ئەوەی مەرج دابنێ، وەک ئەوەی بڵێت: نەزر بێ لەسەرم بۆ خوا دوو ڕەکاعەت نوێژ بکەم، هیچی تێدا نییە بەرامبەر شتێک ڕووبدات لە داهاتووە، نەفسی پابەند دەکرێ بە عیبادەت وەک: نوێژ یان ڕۆژوو یان عیبادەتی تری وەک ئەمانە، ئەمەیان نەزری مطلقە کە بریتی یە لە پابەند کردنی نەفس بۆ گوێڕایەلی خوا یان عیبادەت، ئەمەیان ئەو نەزرە نییە کەپێغەمبەر (ﷺ) پێی خۆش نەبووە، بەڵکو ئەوەی پێی خۆش نەبووە جۆری دووەمە.

جۆری دووەم: (نەزری مقید): ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: "تەنها مرۆڤ لە ڕەزیلی دەردەهێنێت"، ڕاستی یەکەی ئەوەیە بەندە نەفسی خۆی پابەند دەکات بە گوێڕایەلی خوا بەرامبەر شتێک کە خوای گەورە بۆی بێنێتە دی، وەک ئەوەی بڵێت: ئەگەر لە نەخۆشی چاک بوومەوە و خوای گەورە شیفای بۆ ناردم، نەزر بێت لەسەرم ئەوەندە ماڵە ببەخشم، یان ئەگەر دەرچووم لە تاقیکردنەوە شەوێک نوێژ دەکەم، یان ئەگەر دامەزرام لەم کارە یەک هەفتە بەڕۆژوو دەبم، وە عیبادەتی تری وەک ئەمانە، ئەمەیان ئەوەی نەزر دەکات هەروەک ئەوە وایە مەرج دابنێت لەسەر خوا، دەڵێت: ئەی خوایە فلانە شت و فلانە شتم پێبدە، منیش بەڕۆژوو دەبم، ئەگەر دەرم بچووێنی لە تاقیکردنەوە نوێژ دەکەم یان خێرێک دەکەم، یان ئەگەر شیفات بۆ ناردم من فلانە شت دەکەم، واتە کردەوە بەرامبەر کردەوە، ئەمەیە پێغەمبەر درووود و سەلامی خوای لێ بێت وەسفی کردووە بەوەی کە: (تەنها لە ڕەزیلی دەرت دەهێنێ)، چونکە ڕەزیل کردەوە ناکات هەتا شتێکی پێ نەدرێت.

ئەمەیان هەڵەیە کە زۆر خەڵکی نەزان بەکاریدەهێنن بۆ نەزرەکانیان، چونکە وا گومان دەبەن کە پێویستییەکانیان ناهێتە دی ئیلا بەنەزر کردن نەبێت، ابن تیمیه ڕەحمەتی خوای لێ بێت و بێجگە لەویش دەڵێن: هەر کەسێک گومان بەبات پێویستییەکانی نایێتەدی ئیلا

بە نەزرکردن نەبێت، ئەوا ئەم بیروباوەڕە حەڕامە، چونکە وا گومان دەبات خوای گەورە پێی نادات مەگەر بەرامبەر شتێک نەبێت، ئەمەیان گومانی خراپ بردنە بە خوای گەورە و بیروباوەڕێکی خراپە بەرامبەر بە خوا، بەڵکو خوای گەورە فەزڵ و چاکەی هەیە بەسەر دروست کراوەکانی خۆی.

ئەگەر ئەمەت بۆ ڕوون بوویێتەوە بزانە نەزری مطلق داخلی کەڕاهەت نابێت، بەڵام ئەگەر بڵێین نەزر عیبادەتە، ئایا نەزری مقید داخلی دەبێت؟

وەڵام: نەزری مقید دوو ڕووی هەیە:

ڕووی یەکەم: وەفا کردن بە نەزر کە نەفسی خۆی پابەند کردووە، بەمەیان عیبادەتی خوای گەورە لەم ڕووەوەیە ئەوەی دیار بێت.

ڕووی دووەم: ڕووی کەراهەت پەیوەستە بەم نەزرەی مقید، ئەمەیان هاتووە بۆ سیفەتی بیروباوەڕەکە نەک بۆ سیفەتی ئەصلی عیبادەت، چونکە لە نەزری مقید ئەگەر بڵێیت: ئەگەر فلانە شت ببێت نەزرێکم لەسەر بێت، کەراهەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەم مەرج دانانە نەک بۆ ئەصلی نەزر، کەواتە نەرز کردن کێشە نییە چونکە عیبادەتێکە لە عیبادەتە گەورەکان[1].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (١٥٧-١٦٠).

**وقول الله تعالى:** ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ۝٧﴾ [الإنسان: ٧]

واته: (ئەو ئیماندارانە سیفەتیان وابوو وەفایان دەکرد بە نەزر، بە هەموو ئەو نەزرانەی کە بۆ خوایان بڕیار دابوو، لەگەڵ ئەوەش لەو ڕۆژە دەترسان کە بەدی و سەختییەکەی بڵاو دەبێتەوە بەوپەڕی بڵاو بوونەوە).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾: مەدحی ئەوانە کراوە کە وەفا بە نەزر دەکەن، ئەگەر مەدحی ئەوانە کرابێت کەواتە نەزر عیبادەتە، بەڵام نەزرێک مەرج دانانی لەگەڵ بێت لەگەڵ خوای گەورە ئەمەیان نەهی لێکراوە، ئەم جۆرە نەزرە تەنها کەسەکە لە بەخیلی ڕزگار دەکات.

﴿وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾: (يوم): نەناسراوە دەلالەت لەسەر گەورەیی و ناخۆشی ڕۆژەکە دەکات.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ڕووی کردنە بەڵگەی ئەوە کە "نەزر" عیبادەتە بریتیی یە لەوەی: خوای گەورە مەدحی ئەوانەی کردووە کە وەفا بە نەزر دەکەن، مەدح کردنی ئەوانەی کە وەفا بە نەزر دەکەن بەڵگەیە کە وەفا بە نەزرکردن لای خوا خۆشەویستە و ڕێگەپێدراوە، کەواتە جۆرێکە لە جۆرەکانی عیبادەت و ئەنجام دانی بۆ بێجگە لە خوا شیرکی گەورەیە)[1].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

---

[1] التمهید لاپەڕە (١٦٢).

**١-** باسی وەفا كردن بە نەزر كراوە كە لاوازترین واجبە، كە بەندە خۆی لەسەر نەفسی خۆی واجب دەكات و پابەند بوونیشی واجب دەكات، ئەوەی خوای گەورە واجبی كردووە لەپێشترە وەفای پێ بكەن و جێ بەجێی بكەن، ئەگەر وەفا بە واجبی لاواز بكات كە خۆی لەسەر خۆی واجب كردووە، ئەوە ئەوەی خوای گەورە واجبی كردووە لەپێشترە ئەنجامی بدات[١].

**٢-** وتەی: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا۝٧ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾، كۆكەرەوەی تاعەتەكان پوخت كراون لە دوو شتدا:

یەكەم: بەگەورە دانانی فەرمانی خوا، كە وتەی: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾، ئاماژەیە بۆ ئەمە.

دووەم: سۆز و بەزەیی بەرامبەر دروستكراوەكانی خوای گەورە، كە وتەی: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ﴾، ئاماژەیە بۆ ئەمە[٢].

**٣-** وتەی: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾، بەڵگەیە لەسەر واجبی وەفا كردن بە نەزر، چونكە دواتر فەرمووی: ﴿وَيَخَافُونَ يَوْمًا﴾، ئەمە بەڵگەیە ئەوانە وەفایان بە نەزر كرد لەبەر ترسان لە شەڕی ڕۆژی قیامەت، ترسان لە شەڕی ئەم ڕۆژە دروست نابێت مەگەر وەفا كردن بەو نەزرە واجب بێت[٣].

---

(١) دقائق التفسير لابن تيمية (٢٢/٥).
(٢) (تفسير الرازي) (٧٤٦/٣٠).
(٣) (تفسير الرازي) (٧٤٥/٣٠).

**٤-** وتەی: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾، بە شێوازی کاری ڕانەبردوو هاتووە، کە دەلالەت لەسەر بەردەوامی دەکات و نوێکردنەوەی وەفا کردنیان بە نەزر دەکات کاتێک نەزر دەکەن بۆ کردەوەی باش(١).

**٥-** وتەی: ﴿وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾، بەڵگەیە لەسەر جوانی بیروباوەڕیان و خۆ دوورخستنەوەیان لە تاوان(٢).

**٦-** ئیماندار دەبێت لە سزای خوای گەورە بترسێت و لە ڕۆژێک بترسێت کە بەدی و سەختییەکەی بلاوبۆتەوە بەوپەڕی بلاوبوونەوە.

**٧-** هەندێ زانا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە کە نەزرکردن سوننەتە، چونکە ئەگەر وەفا پێ کردن خۆشەویست بێت لای خوای گەورە، کەواتە سەرەتاکەی کە نەزر کردنە ئەویش خۆشەویستە.

**٨-** هەندێ زانا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە کە نەزرکردن باش نییە نەک حەڕامە، چونکە ئەگەر حەڕام بوایا مەدحی ئەوانەی نەدەکرد کە وەفا بە نەزر دەکەن.

جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە نەزرکردن، نەزر کردن ئەگەر (مجازاة) بێت دەلێن حەڕامە، زۆربەی زانایان دەڵێن باش نییە شت لەسەر خۆت واجب بکەیت، واتە نەزر کردن باش نییە، چونکە ئەگەر نەزرت کرد واجبە لەسەرت وەفای پێ بکەی.

**٩-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نەزر عیبادەتێکە لە عیبادەتەکان و کردنی بۆ بێجگە لەخوا شیرکە.

---

(١) (تفسير الألوسي) (١٧١/١٥)، (تفسير ابن عاشور) (٣٨٢/٢٩، ٣٨٣).
(٢) (تفسير البيضاوي) (٢٧٠/٥).

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾، ئەمەیان مەدح کردنی ئەو ئیماندارانەیە کە وەفا بە نەزر دەکەن بە نەزری باشی شەرعی، ئەمە بەڵگەیە کە نەزر عیبادەتە و دەبێت بۆ خوا بکرێت و تایبەتە بە خوای گەورە)[1].

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (خوای گەورە مەدحیان دەکات لەسەر وەفا کردن بە نەزر، ئەگەر مباح بوایا مەدحی نەدەکرد، بەڵکو مەدحیانی کردووە لەسەر جێ بەجێکردنی واجب یان کردەوەی سوننەت یان تەرک کردنی حەڕام یان مەکروه)[2].

---

[1] التعليق المفيد.

[2] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٢٠٨).

**وقوله:** ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴿٢٧٠﴾﴾ [البقرة: ٢٧٠]

واته: خوای گەورە دەفەرمووێت: (هەرچی جۆرە ماڵێکتان بەخشیوە و هەرچی نەزرێ کە کردووتانە، ئەوا بە تەئکید خوای گەورە دەیزانێت و ئاگادارە.)

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ﴾: واتە: هەرچی جۆرە ماڵێکتان بەخشیوە.

﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥۗ﴾: واتە: ئەوا بە تەئکید خوای گەورە دەزانێت و ئاگادارە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

بە بەڵگە کردنی ئەم ئایەتە لە دوو ڕووەوەیە: ڕووی یەکەم: خوای گەورە نەزری لەگەڵ ماڵ بەخشین باس کردووە، ماڵ بەخشین لە ڕێگای خوا عیبادەت و گوێڕایەلی یە، بەڵگەیە کە نەزریش گوێ ڕایەلی یە.

ڕووی دووەم: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥۗ﴾، ئەمەیان لەبابەتی هاندانە لە سەر ماڵ بەخشین و لەسەر وەفا کردن بە نەزر، بەڵگەیە کە گوێ ڕایەڵی یە، کەواتە بۆ بێجگە لە خوا شیرکە ئەمە ڕووی کردنە بەڵگەی دانەری کتابە ڕەحمەتی خوای لێ بێت[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

---

[1] القول المفيد (٣١٨/١).

**١-** زانستی خوای گەورە بەوەی بەندەکان دەیبەخشن لە نەزر و شتی تر، کەم بێت یان زۆر بێت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات و پاداشتیان دەداتەوە، لەبەر وتەی: ﴿وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ﴾.

زانایان دەڵێن نەزرکردن بۆ بێجگە لە خوا دوو حاڵەتە:

حاڵەتی یەکەم: نەزر دەکات بۆ بێجگە لەخوا و نەزر بۆ کراو بە گەورە دادەنێت یان وای دەبینێت شیاوی عیبادەت کردنە یان باوەڕی وایە سوود و زیانی بە دەستە، ئەمەیان شیرکی گەورەیە.

حاڵەتی دووەم: نەزر دەکات بۆ بێجگە لە خوا و نەزر بۆ کراو بە گەورە دانانێت و وای نابینێت شیاوی عیبادەت بێت و باوڕی وایە سوود و زیان تەنها بە دەست خوایە، ئەمەیان شیرکی بچووکە وەک سوێند خواردنە بە بێجگە لە خوا، ئەگەر ئەم بیروباوەڕە پاکەشی هەبێت هەر دەبێتە شیرک.

هەندێ زانا دەڵێن نەزرکردن جیاوازە و وەک سوێند خواردن نییە بە هەموو شێوەیەک شیرکی گەورەیە، چونکە نەزر بە خاڵسی بۆ بێجگە لە خوا دەکرێت، بەڵام سوێند وانییە.

کەواتە نەزرکردن بۆ بێجگە لەخوا شیرکە و دانامەزرێت، دەبێت تەوبەی لێ بکرێت و بە کەفارەت لاناچێت، بەڵام نەزرکردنی تاوان دادەمەزرێت، نابێت وەفای پێ بکرێت و دەبێت کەفارەتی سوێندەکە بدات.

وەفا کردن بە نەزر ئەگەر شیرک بێت، واتە کردەوەکە شیرک بێت ئەمەیان گومانی تێدا نییە کە شیرکە لەبەر کردەوەی شیرکی، هەروەها نەزرکردن بە وتەش بۆ بێجگە لەخوا ئەگەر چی وەفاشی پێ نەکرێت گومانی تێدا نییە کە شیرکە، کەواتە نەزرکردن تەنها بە وەفا پێکردن نابێتە شیرک.

**٢-** ئەم ئایەتە نابێتە بەڵگە نەزر دروستە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر واجبی وەفا کردن بە نەزر ئەگەر نەزرەکە تاوان نەبێت، هەروەک فەرمووده هاتووه: (هەر کەسێک نەزری کرد گوێڕایەڵی خوا بکات با بیکات، هەر کەسێک نەزری کرد سەرپێچی خوا بکات با نەیکات)[1].

**٣-** وەڵامە بۆ قەدەریەکان ئەوانەی دەڵێن مرۆڤ خۆی دروستکەری کردەوەکانی خۆیەتی نەک خوا، لەبەر وتەی: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ﴾، هەروەها لەبەر وتەی: ﴿وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾.

**٤-** ستەمکارەکان هیچ سەرخەریان نییە و کەس ڕزگاریان ناکات لەدونیا و سزای ئاگر، لەبەر وتەی: ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾.

لەوانەیە یەکێک بڵێت ئەی چی دەڵێن بۆ سەرکەوتنی کافران لە جەنگی ئوحد؟

وەڵام لە دوو ڕووەوەیە:

١- ئەمەیان جۆرێک بوو لە جۆرەکانی عقوبە بۆ موسڵمانان، چونکە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەریان کرد، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ مَا تُحِبُّونَ مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴿١٥٢﴾﴾ [آل عمران: ١٥٢].

---

(١) أخرجه البخاري (٦٦٩٦)، وأبو داود (٣٢٨٩)، والنسائي (٣٨٠٦)، والترمذي (١٥٢٦)، وابن ماجه (٢١٢٦) من حديث عائشة رضي الله عنها.

واتە: هەتا ئەو كاتەی سست و لاواز بوون و بوو بە كێشە لەسەر هەندێ دەست كەوت، ئیتر پاش دیتنی سەركەوتن و تاڵانەكە كە بەتەمای بون، لاتان دا و سەرپێچی فەرمانەكانی پێغەمبەرتان كرد و بۆسە و كەمینی سەر شاخەكاتان چۆڵ كرد و سەر ئەنجام هەمووتان تێک شكان.

**٤-** ئەم سەرخستنە بۆ ئەوەیە تاكو كافران لە ناو ببات، چونكە بە سەركەوتنیان لە خۆ بایی دەبن و شەڕ دەكەن دژی موسڵمانان، لە كۆتاییدا سەركەوتن بۆ موسڵمانانە، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ﴿١٤١﴾﴾ [آل عمران: ١٤١] واتە: تا ئەو موسڵمانە ڕاستانە لە بێژینگ بدات و كافرانیش لە ناو ببات.

**٥-** هۆشداری وەرگرتن لە ستەم و خراپی چارەنووسی، زەم كردنی ئەهلی ستەم.

**٦-** ماڵ بەخشین كەم بێت یان زۆر بێت كەسەكە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، لە بەر وتەی خوای گەورە كە دەفەرموێت: (وما انفقتم من نفقه)، وشەی (نفقه) نەكرەیە و ڕستەكەش ڕستەی مەرجە بە مانای گشتی دێت، كەواتە لەسەر ئەمە كەم و زۆر دەگرێتەوە، بەڵام پاداشت لەسەری وەرگرتن دوو مەرجی هەیە:

١- دەبێت بە پاكی بۆ خوا بێت.

٢- دەبێت بە گوێرەی شەرع بێت.

**٧-** مرۆڤ كاتێک ماڵ دەبەخشێت دەبێت داوای پاداشت لە خوا بكات، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُهُۥ﴾، تۆ ئەگەر ماڵت بەخشی و هەستت كرد كە خوای گەورە دەزانێت، ئەوا داوای پاداشتت لە خوا كردووە.

**٨-** گشتییەتی زانستی خوای گەورەیە کە زاستی بە بەخشین و نەزر کردنی مرۆڤ هەیە چ زۆر بێت یا کەم.

**٩-** هەرکەسێک دوعا لە برای خۆی بکات و زاڵم بێت خوای گەورە دوعای قبول ناکات، چونکە ئەگەر دوعای قەبوول بکات ئەوا دەبێتە سەرخستن بۆی.

**١٠-** بەڵگەیە کە خوای گەورە زانستی بە هەموو شتێک هەیە و وەڵامە بۆ قەدەرییەکان کە دەڵێن قەدەری مرۆڤ لە دەست مرۆڤ دایە و خوای گەورە هیچ دەسەڵاتی بەسەرەوە نییە، بەڵکو خوای گەورە نازانێت مرۆڤ چی دەکات تا دوای کردنی کردەوەکە.

زۆر لە زانایان دەڵێن قەدەری کافرن، لەبەر ئەوە هەندێک لە پێشینان دەڵێن: گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن بە زانست، ئەگەر دانیان پیێ دانا و تەسلیم بوون ئەوا باشە، ئەگەر ئینکاریان کرد ئەوا کوفریان کردووە.

**١١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە نەزرکردن عیبادەتە و نابێت بۆ بێجگە لە خوا بکرێت، چونکە عیبادەت بۆ بێجگە لە خوا شیرکە.

**وفی الصحیح عن عائشه رضی الله عنها أن رسول الله (ﷺ) قال: (من نذر أن یطیع الله فلیطعه، و من نذر أن یعصی الله فلا یعصیه)**

واته: عائیشه خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک نەزری کرد کە گوێڕایەڵی خوا بکات با گوێ ڕایەڵی بکات و هەر کەسێک نەزری کرد کە بێ فەرمانی خوا بکات با بێ فەرمانی نەکات).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(من نذر):** واته: هەر کەسێک نەزری کرد، ڕستەی شرطیة یە تفید العموم.

**(أن یطیع الله فلیطعه):** واته: هەر کەسێک نەزری کرد کە گوێڕایەڵی خوا بکات با گوێ ڕایەڵی بکات.

**(من نذر أن یعصی الله فلا یعصیه):** واته: وە هەر کەسێک نەزری کرد کە بێ فەرمانی خوا بکات با بێ فەرمانی نەکات.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزیت دەفەرموویێت: (مەبەست لەم فەرموودەیە: دانەری کتاب پارچەی یەکەمی فەرموودەکەی کردۆتە بەڵگە ئەویش ئەمەیە کە دەفەرموویێت: (هەر کەس نەزری کرد کە گوێڕایەڵی خوا بکات، با گوێڕایەڵی بکات)، ئەوەی دیار بێت بۆ بەڵگە نەزر عیبادەتە، هەروەها پارچەی تریش کە دەفەرموویێت: (هەرکەسێک نەزری کرد کە بێ فەرمانی خوا بکات، با بێ فەرمانی نەکات)، کەفارەتی سوێندی واجب کردووە، ئەمە بەڵگەیە کە ئەسڵی دامەزراوە و دامەزراوە لەبەر ئەوەی عیبادەتە، ئەگەر عیبادەت بێت ئەوە بۆ بێجگە لە خوا شیرکی گەورەیە.

نەزر بۆ خوا عیبادەتێکی گەورەیە هەروەک باسمان کرد و نەزر بۆ بێجگە لە خواش عیبادەتە واتە: عیبادەتە ئەگەر بۆ بێجگە لە خوا بیکەیت شیرکە، ئەوەی نەزر دەکات ئەگەر ڕوو بکاتە بێجگە لە خوا ئەوا عیبادەتی کردووە، ئەگەر ئەوەی نەزر دەکات ڕوو بکاتە خوا ئەوە عیبادەتی کردووە)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** هەر کەسێک نەزر بکات بە نەزری تاوان نابێت وەفای پێ بکات بە یەک دەنگی هەموو زانایان لەبەر وتەی پێغەمبەر (ﷺ).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (**لا**: ناهیەیە و نەهی بە گوێرەی تاوانەکەیە، ئەگەر تاوانەکە یان سەرپێچییەکە حەرام بێت ئەوە وەفا پێ کردنی حەڕام دەبێت، ئەگەر سەرپێچی باش نەبێت ئەوە وەفا پێکردن باش نییە، چونکە سەرپێچی تووش بوونە بە شتێک یان کردنی شتێکە کە نەهی لێکراوە و نەهی لێکراو لای زانایان دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش: نەهی لێکراو هەیە نەهییەکەی بۆ حەڕامی یە، نەهی لێکراویش هەیە نەهییەکەی بۆ ئەوەیە باش نییە)[2].

صالح الفوزان خوا بیپارێزیت دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە کە نەزرعیبادەتە و ئەگەر نەزری عیبادەتی کرد واجبە وەفای پێ بکات، ئەگەر بۆ بێجگە لە خوا بیکات دەبێتە شیرک، لەسەر ئەمە ئەگەر نەزری کرد بۆ ئەنجام دانی شیرک نابێت وەفای پێ

[1] التمهيد لاپەرە (١٦٣).

[2] القول المفيد.

بکات، بەهەمان شێوە ئەگەر نەزر نەزر بکات نەزری تاوان بێجگە لە شیرک، نابێت وەفا بە نەزری تاوان بکات کە هەموو زانایان یەک دەنگن)[١].

**٢-** زۆربەی زانایان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە نەزری تاوان کەفارەتی لەسەر نییە، جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان سەبارەت بە نەزری تاوان ئایا کەفارەتی لەسەرە یان نا، دوو وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان دەڵێن نەزری تاوان کەفارەتی لەسەر نییە، کە ئەمە وتەی شافعی و مالک و ئەبو حەنیفەیە، بەڵگە:

- فەرموودەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت نەهی کردووە لە وەفا کردن بە نەزری تاوان فەرمانی نەکردووە بە کەفارەت دان، ئەمە بەڵگەیە کە کەفارەت دان واجب نییە.

دووەم: نەزری تاوان کەفارەتی لەسەرە، کە ئەمە وتەی ابن مسعود و ابن عباس و جابر و عمران بن حصین وسمرە بن جندب و ثوری و وتەی ڕاستی ئیمام ئەحمەد و بەیهەقی و ابن قیم وصنعانی وابن باز وابن عثیمینە، بەڵگە:

- عن ابن عباس خوا لیێ رازی بیت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (نەزر دوو جۆر هەیە: ئەوەی بۆ خوا بێت کەفارەتەکەی ئەوەیە کە وەفای پیێ بکەی، ئەوەی بۆ شەیتان بێت نابێت وەفای پیێ بکرێت و کەفارەتەکەشی کەفارەتی سوێندە)[٢].

---

[١] اعانە المستفید (٢٥٥/١).

[٢] اخرجە ابن الجارود (٩٣٥).

- عن عقبه بن عامر رضى الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (كفارة النذر كفارة اليمين)[١]. واتە: کەفارەتی نەزر کەفارەتی سوێندە، ئەم فەرموودەیە گشتی یە نەزری تاوانیش دەگرێتەوە.

وتەی ڕاست وتەی دووەمە کە کەفارەت واجبە لە نەزری تاوان.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (باس نەکردنی کەفارەت لە فەرموودەکە نابێتە بەڵگە کە نابێت کەفارەت بدەیت، بەڵێ ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووبێت: کەفارەتی لەسەر نییە، پێچەوانەی دروست دەبوو لە نێوان هەردوو فەرموودەکە، ئەو کات داوای ترجيح دەکرا، بەڵام پێغەمبەر نەفی کەفارەتی نەکردووە بەڵکو بێ دەنگ بوو، بێ دەنگی نەفی وتەی ناکات)[٢].

**٣-** هەندێ زانا ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە وەفا کردن بە نەزری گوێڕایەڵی و عیبادەت واجبە، هەندێ زانا دەڵێن وەفا کردن بە نەزری عیبادەت واجب نییە مەگەر جنسی گوێڕایەڵی یەکە واجب بێت.

حافظ بن أحمد حکمی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مەرجەکانی نەزر بۆ خوا ئەمانەن:

(١) دەبێت نەزرەکە گوێڕایەڵی بێت.

(٢) دەبێت نەزرەکە لە توانای دا بێت.

(٣) دەبێت موڵکی بێت ئەوەی دەکاتە نەزر.

---

[١] رواه مسلم (١٦٤٥).

[٢] القول المفيد.

(٤) نابێت نەزر بۆ شوێنێک بکرێت لەو شوێنە عیبادەتی بێجگە لە خوا بکرێت، یان هۆکار بێت بۆ تووش بوون بە شیرک و نابێت لەکاتێک دا بێت لەو کاتانەی کە بەناو بانگ بن کە عیبادەتی بێجگە لە خوای تێیدا دەکەن.

(٥) نابێت نەزر پەیوەست بکات بۆ بەدەست هێنانی شتێک و باوەڕی وا نەبێت نەزرەکەی کاریگەری هەیە بۆ بەدەست هێنانی شتەکە یان مەبەستەکە)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر مرۆڤ نەزر بکات و گومان ببات کە خوای گەورە پێویستی بەم نەزرە هەیە ئەمە کوفرە، هەر مرۆڤێک باوەڕی وابێت خوای گەورە پێویستی بە کردەوەی ئێمە هەیە، ئەوە کافرە و قورئانی بە درۆ خستۆتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ٩٧﴾ [آل عمران: ٩٧]، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ﴾ [الزمر: ٧]

چۆن دەتوانی بە زمان بڵێی خوای گەورە پێویستی بە عیبادەتە؟! چۆن لەنەفسی خۆتدا ئەم بیروباوەڕەت هەیە، دەکرێت بیروباوەڕ تووندتر بێت لە وتە، مرۆڤ هەندێک جار بەزمانی هەندێک شت دەڵێت بێ مەبەست، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ﴾ [المائدة: ٨٩]، بیرو باوەڕی دل ئەسڵە)[٢].

[١] معارج القبول (٣٦٦/١-٣٦٧).
[٢] فتح ذي الجلال والإكرام (٤٥٢/١٤).

## باب من الشرك الاستعاذة بغير الله

**وقول الله تعالى:** ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴿٦﴾﴾ [الجن: ٦]

**وعن خولة بنت حكيم رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (من نزل منزلا فقال: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق، لم يضره شيء حتى يرحل من منزله ذلك) [رواه مسلم]**[(١)].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية الجن.

**الثانية:** كونه من الشرك.

**الثالثة:** الاستدلال على ذلك بالحديث، لأن العلماء استدلوا به على أن كلمات الله غير مخلوقة، قالوا: لأن الاستعاذة بالمخلوق شرك.

**الرابعة:** فضيلة هذا الدعاء مع اختصاره.

**الخامسة:** أن كون الشيء يحصل به مصلحة دنيوية من كف شر أو جلب نفع لا يدل على أنه ليس من شرك.

---

[(١)] أخرجه مسلم (٢٧٠٨).

## باب من الشرك الإستعاذة بغير الله

## پەناگرتن بە بێجگە لەخوا جۆرێکە لە شیرك

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (پیتی (من): (للتبعیض)، واتە: بەمانای هەندێک دێت، ئەم تەرجومەیە لەسەر ڕەهایی خۆی نییە، چونکە ئەگەر پەنا بە کەسێک بگریت کە لە توانای دابێت، ئەمەیان دروستە، وەک داوای یارمەتی لێ کردن)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: ((الإستعاذة): ماناکەی: پەناگرتن و گەڕانەوەیە بۆ لای خوا لە لادانی شەڕو شتی ناخۆش، پەناگرتن جۆرێکە لە جۆرەکانی عیبادەت چونکە لادانی زیانە، لادانی شەڕ کەس توانای نییە مەگەر خوا، هەموو شتێک ئەگەر لە توانای کەسدا نەبێت مەگەر خوا و داوابکرێت لە بێجگە لەخوا ئەوە شیرکە، ئەمە ڕووی پەناگرتنە بە بێجگە لەخوا، چونکە پەناگرتن عیبادەتە و کردنی عیبادەت بۆ بێجگە لەخوا شیرکە، بۆچی عیبادەتە؟ چونکە داوا لەخوا کردنە بۆ لادانی زیان، خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پەناگرتن تەنها بە خۆی)[٢].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (ئایا ئەم حوکمە سەبارەت بە بکەر (کارا) شیرکە بۆ هەموو جۆرەکانی پەناگرتن، ئەگەر چی لەتوانای دروستکراوەکانیش دا بێت؟

وەڵام: ئەمەیان تەفصیلی تێدایە:

---

[١] القول المفيد.

[٢] إعانة المستفيد (١/٢٥٧).

هەندێ زانا دەڵێن: پەناگرتن ناگونجێ مەگەر بە خوا، نابێت پەنا بگریت بە دروستکراوێک ئەگەر لەتواناشی دابێت، چونکە پەناگرتن ڕووتێکردنی دڵە، پەناگرتن گەڕانەوە و خۆ پاراستن و ڕەغبەتە، هەموو ئەم مانایانە ناگونجێن بۆ کەس مەگەر خوای گەورە.

هەندێ زانای تر دەڵێن: بەڵگە هاتوون کە دروستە پەنا بگریت بە دروستکراوەکان لە شتێک کە لە توانایاندا هەبێت، چونکە حەقیقەتی پەناگرتن ڕاگرتنی شەڕە و داوای یارمەتی کردن و پاراستنە لە شەڕ، پەناگرتنە لەو شەڕەی بەسەریدا هاتووە، ئەگەر وا بێت دروستکراوەکان هەندێک جار توانایان هەیە، لەسەر ئەمە پەناگرتن بە بێجگە لەخوا شیرکی گەورەیە، ئەگەر مخلوق توانای نەبوو، یان داوای لێکرا لە شتێک توانای نییە تەنها لە توانای خوا دایە.

ئەوەی دیار بێت هەروەک پێشتر تەفسیلی تێدایە، پەناگرتن کردەوەی ئاشکرا و کردەوەی شاراوەی تێدایە، کردەوەی ئاشکرا داوا کردنی عوذ، ئەویش داواکردنی ئەوە پارێزراو بیت لەم شەڕە، یان ڕزگار ببیت لەم شەڕە، سەبارەت بە کردەوەی شاراوە: ڕووتێکردنە بەدڵ و ئارام بوونە پێی، پێویستیەکانی خۆی تەسلیمی دەکات و خۆی بە ئەو دەپارێزێ لەم شەڕە، ڕزگار بوونی خۆی دەداتە پاڵی.

ئەگەر پەناگرتن ئەم دوو جۆرەی تێدا کۆببێتەوە دروستە بوترێ: پەناگرتن بۆ کەس ناگونجێ ئیلا خوای گەورە، چونکە هەردووکیان پێکەوە کردەوەی دڵیشی تێدایە، هەروەک باسمان کرد کردەوەی دڵ بە یەک دەنگی هەموو زانایان بۆ کەس ناگونجێ ئیلا بۆ خوا نەبێت، ئەگەر مەبەست بە پەناگرتن تەنها کردەوەی ئاشکرا بێت یان داواکردنی لاچوونی شەڕ بێت بێ ئەوەی کردەوەی دڵی لەگەڵ بێت، ئەوا دروستە پەنا

به مخلوق بگریت ئەگەر لەتوانای دا بێت، لەسەر ئەمە بەڵگە هاتوون بۆ دروستی پەناگرتن بە مخلوق)[١].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ابن تيميه دەڵێت: دروست نییە پەنا بگریت بە دروستکراوەکان لای هیچ زانایەک، ئەمە لەسەر ڕەهایی خۆی نییە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە لە توانای کەسدا نەبێت ئیلا خوا، چونکە کەس ناتپارێزێ لەشەڕ مەگەر خوا، لەوانە پەناگرتن بە گۆڕەکان، چونکە ئەوانە نە زیان دەبەخشن و نە سوودیان هەیە، پەناگرتن پێیان شیرکە)[٢].

کەواتە زانایان سەبارەت بە پەناگرتن دەڵێن:

١- ئەگەر پەنا بگریت بە دروستکراوێک کە لەتوانای دابێت، ئەمەیان نابێتە شیرک ئەگەر کردەوەی دڵی لەگەڵ نەبێت.

٢- ئەگەر پەنا بگرێت بە دروستکراوێک کە لەتوانای کەس دا نییە ئیلا خوا نەبێت، ئەمەیان شیرکی گەورەیە.

٣- پەنا دەگرێت بە دروستکراوێک بەڵام ئامادە نییە، یان پەنا دەگرێت بە مردوویێک، یان پەنا دەگرێت بە جنۆکە، ئەمەیان شیرکی گەورەیە.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (١٦٧-١٦٨).

[٢] القول المفيد (٣٣٠/١).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا۝٦﴾ [الجن: ٦]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویّت: (بەڕاستی پیاوانێک لەنێو مرۆڤەکان دا پەنایان دەبردە بەر پیاوانێک لە جن، وایان دەکرد لە مرۆڤەکان کە ترسیان زیاد بکات و زیرە بکەن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾: عەرەب لە سەردەمی نەزانین کاتێک دادەبەزین بۆ دۆلێک بە بەرزترین دەنگ دەیان گوت: پەنا دەگرم بە گەورەی ئەم دۆڵە.

﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾: جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان بۆ لێک دانەوەی ئەم ئایەتە، دوو وتە هەیە:

- هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون واوی ضمیر بۆ جنۆکەیە و (هاء) بۆ مرۆڤەکانە، واتە: جنۆکە ترسیان زیاد دەکرد بۆ مرۆڤەکان.

- هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون پێچەوانەیە، واتە: مرۆڤەکان لەخۆبایی بوونی بۆ جنۆکە زیاد کرد.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویّت: (وتەی ڕاست وتەی یەکەمە)[1].

﴿رَهَقًا﴾: أی: (خوفا)، (رهق) توندترە لە (خوف)، (خوف) بۆ دڵە بەڵام (رهق) بۆ لاشە و ڕۆحە.

---

(١) القول المفید (٣٢٤/١).

**هۆكاری باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری كتاب ئەم ئایەتەی باسكردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە كە پەناگرتن بە (جن) شیركە.

**ســوودەكانی ئەم ئایەتە:**

**١-** هۆشداری دان لە پەناگرتن بە جگە لەخوا بە جنەكان، كە زیاتر زەلیلی و لاوازی بۆ كەسەكە زیاد دەكات، لەبەر وتەی: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾.

**٢-** پەناگرتن بە مردووەكان یان زیندووەكانی ئامادە نەبوو كە لەتوانایاندا نییە شیركە، لەبەر وتەی: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾[١].

زانایان سەبارەت بە پەناگرتن دەڵێن:

- ئەگەر پەنا بگریت بە دروستكراوێک كە لەتوانای دابێت، ئەمەیان نابێتە شیرک ئەگەر كردەوەی دڵی لەگەڵ نەبێت.

- ئەگەر پەنا بگرێت بە دروستكراوێک كە لەتوانای كەسدا نییە مەگەر خوا نەبێت، ئەمەیان شیركی گەورەیە.

- پەنا دەگرێت بە دروستكراوێک بەڵام ئامادە نییە، یان پەنا دەگرێت بە مردوویێک، یان پەنا دەگرێت بە جنۆكە، ئەمەیان شیركی گەورەیە.

(١) (شرح ثلاثة الأصول) لابن عثيمين لاپەڕە (٦٤).

لەوانەیە یەکێک بڵێت بۆچی پەناگرتن بە مرۆڤ ئەگەر لەتوانای دا بێت و ئامادە بێت نابێتە شیرک، بەڵام پەناگرتن بە جنێک ئامادەیە و لەتوانای دایە دەبێتە شیرک، چ جیاوازی هەیە؟

وەڵام: سەبارەت بە جیاوازی نێوان پەناگرتن بە جن و مرۆڤ ئەگەر ئامادە بن و لە توانایان دا بێت لە دوو ڕووەوەیە:

- مرۆڤی زیندوو ئامادەیە بەکردەوە، بەڵام جن ئەگەر چی ئامادەش بێت بە غائب حساب دەکرێ، چونکە ئێمە نایبینین، وەک مرۆڤێکی غائب وایە.

- پەناگرتن بە مرۆڤی زیندووی ئامادە بوو بەڵگە لەسەر ڕێگەپێدانی هاتووە، بەڵام پەنا گرتن بە جنی زیندووی ئامادەبوو هیچ بەڵگە لەسەر ڕێگەپێدانی نەهاتوون.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە ئیمان بە جن بهێنیت، جنۆکە عالەمێکی شاراوەیە، ئێمە نایان بینین، لەگەڵ ئێمە دەژین ئەوان مکلفن وەک ئێمە بە فەرمان و نەهی.

ئیمان هێنان بە بوونیان ئیمان هێنانە بە غەیب، بەڕاست دانانی خەبەری خوا و پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بوونی جنۆکە جێگیر بووە بە کتاب و سوننەت و ئیجماع، هەر کەسێک ئینکاری بوونی جنۆکە بکات کافرە، چونکە خوا و پێغەمبەر و ئیجماعی بەدرۆخستۆتەوە [(١)].

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە جن نێر و مێ هەیە، واتە: ژن و پیاویان هەیە، سوود وەردەگیرێت لەم ئایەتە لە جنۆکە پیاو هەن، وە مێینەش هەن، هەندێک جار پیاوی جن جووت دەبێ لەگەڵ مێینەی نەوەی ئادەم و بە پێچەوانەشەوە پیاوی نەوەی ئادەم جووت دەبێ لەگەڵ

(١) إعانة المستفيد (١/٢٦٠).

مێینەی جن، زانایان جیاوازیان باسکردووە سەبارەت بە واجب بوون غوسل بەم جووت بوونە[١].

(١) القول المفيد.

**وعن خولة بنت حكيم رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (من نزل منزلا فقال: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق، لم يضره شيء حتى يرحل من منزله ذلك) [رواه مسلم]**[1].

واته: خەولەی کچی حەکیم گوتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (هەر کەسێک لە مەنزلێکدا (شوێنێکدا) دابەزی و پاشان (بە دڵ و زمان) گوتی: (أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق)، واتە: پەنا دەگرم بە کەلیمە تەواوەکانی خوا، لە دەست زیان و بەدی هەر دروستکراوێک کە زیانی و بەدی تێدا بێت، ئەوا هیچ شتێک زیانی پێ ناگەیەنێت هەتا ئەو مەنزلەی بەجێ دەهێڵێت).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(من نزل منزلا):** واتە: هەر کەسێک لە شوێنێک دابەزێت، جا چ بۆ نیشتەجێ بوون و مانەوەی بێت یان بۆ ماوەیەکی کاتی، بەڵگە نەکرە هاتووە و سیاقەکە مەرجە، نەکرە ئەگەر هات وە سیاقەکە مەرج بوو ئەوە مانای گشتی هەڵدەگرێت.

**(كلمات):** وشەکان مەبەست پێی وشەی کەونی و شەرعی یە.

**(التامات):** تەواوی وشە لە دوو شتە:

١- ڕاستی لە خەبەر.

٢- دادپەروەری لە ئەحکامەکان.

**(لم يضره شيء):** نەکرە سیاقی نەفی یە مانای گشتی هەڵدەگرێت، واتە شەڕی هەموو جن و مرۆڤ و بێجگە لە ئەمانە، وە شەڕی ئاشکراو و شاراوە، زانایان دەڵێن فەرمووی:

---

[1] أخرجه مسلم (٢٧٠٨).

(هیچ شتێک زیانی پێ ناگەیەنێت)، نەیفەرموو تووشی هیچ نابێت، واتە: ئەگەر تووشی شتێکیش بوو زیانی پێ ناگەیەنێت.

## هۆکاری باسکردنی فەرموودەکە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە پەناگرتن نابێت بە کەس مەگەر بە خوا یان سیفەتەکانی.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە قورئان دروستکراو (مخلوق) نییە، (كلمات الله)، مەبەست پێی وتەی خوای گەورەیە کە بۆ پێغەمبەری دابەزاندووە و پەناگرتن بە قورئان لەشەرِ ڕێگەپێدراوە، چونکە قورئان وتەی خوای گەورەیە و پەناگرتن بە قورئان پەناگرتنە بە سیفەتێک لە سیفەتەکانی خوای گەورە، کە وتەیە نەک پەناگرتن بێت بە دروستکراوێک.

ئەهلی سوننە و جەماعە ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە قورئان مخلوق نییە، چونکە دروست نییە پەنا بگریت بە (مخلوق)، ئەگەر قورئان مخلوق بوایا وەک جەهمی و موعتەزیلە دەڵێن، ئەوە ئەمە دەبووە پەناگرتن بە مخلوق و دەبووە شیرک، هەروەک فەرموودەکە بەڵگەیە دروستە پەنا بگریت بە خوا و واز لە پەناگرتنی بێجگە لەخوا بهێنیت)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پەناگرتن نابێت بە کەس تەنها خوا نەبێت یان سیفەتەکانی.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (بەڵگەیە توسل بە سیفەتەکانی خوای گەورە دروستە، هەندێک لە پێشینەکان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە قورئان مخلوق

[1] إعانة المستفيد (٢٦١/١-٢٦٢).

نییه، چونکه دروست نییه پەنابگریت بە بێجگە لەخوا، فەرمووده‌که بەڵگەیە وتە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوای گەورە و پەناگرتن پێی دروستە و مخلوق نییە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تەواوی قورئان و گونجانی بۆ هەموو کات و سەردەمێک.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی ئەم دوعایە و کردەوە پێکردنی هۆکارە بۆ ئەوەی مرۆڤ پارێزراو بێت لە شەڕی جن و مرۆڤ.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پەناگرتن دروست نییە تەنها بەخوا یان سیفەتێک لە سیفەتەکانی، لەبەر ئەوە پەناگرتن عیبادەتە، بۆ بێجگە لەخوا دەبێتە شیرک.

---

[1] التعليق المفيد.

## باب من الشرك أن يستغيث بغير الله أو يدعو غيره

**وقوله تعالى:** ﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ﴾ [يونس: ١٠٦-١٠٧]

**وقوله:** ﴿فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ﴾ [العنكبوت: ١٧]

**وقوله:** ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾﴾ [الأحقاف: ٥-٦]

**وقوله:** ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ﴾ [النمل: ٦٢]

**وروي الطبراني بإسناده أنه كان في زمن النبي منافق يؤذي المؤمنين، فقال بعضهم: قوموا بنا نستغيث برسول الله (ﷺ) من هذا المنافق. فقال النبي: (إنه لا يستغاث بي، وإنما يستغاث بالله)[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** أن عطف الدعاء على الاستغاثة من عطف العام على الخاص.

**الثانية:** تفسير قوله: {ولا تدع من دون ا لله ما لا ينفعك ولا يضرك} .

**الثالثة:** أن هذا هو الشرك الأكبر.

---

[1] أخرجه الطبراني في "المعجم الكبير" من حديث عبادة بن الصامت رضي الله عنه كما قال الهيتمي في "مجمع الزوائد" (١٥٩/١٠)، وأخرجه أحمد (٣١٧/٥ رقم ٢٢٧٠٦) ولفظه : "لا يقام لي، إنما يقام لله".

**الرابعة:** أن أصلح الناس لو يفعله إرضاء لغيره صار من الظالمين.

**الخامسة:** تفسير الآية التي بعدها. السادسة: كون ذلك لا ينفع في الدنيا مع كونه كفرا.

**السابعة:** تفسير الآية الثالثة .

**الثامنة:** أن طلب الرزق لا ينبغي إلا من الله، كما أن الجنة لا تطلب إلا منه.

**التاسعة:** تفسير الآية الرابعة.

**العاشرة:** أنه لا أضل ممن دعا غير الله.

**الحادية عشرة:** أنه غافل عن دعاء الداعي لا يدري عنه.

**الثانية عشرة:** أن تلك الدعوة سبب لبغض المدعو للداعي وعداوته له.

**الثالثة عشرة:** تسمية تلك الدعوة عبادة للمدعو. الرابعة عشرة: كفر المدعو بتلك العبادة.

**الخامسة عشرة:** أن هذه الأمور سبب كونه أضل الناس.

**السادسة عشرة:** تفسير الآية الخامسة.

**السابعة عشرة:** الأمر العجيب وهو إقرار عبدة الأوثان أنه لا يجيب المضطر إلا الله، ولأجل هذا يدعونه في الشدائد مخلصين له الدين. الثامنة عشرة: حماية المصطفى حمى التوحيد والتأدب مع الله.

## باب من الشرك أن يستغيث بغير الله أو يدعو غيره

## هاوار بردن بۆ بێجگە لەخوا یان داوا کردن

## لە بێجگە لە خوا جۆرێکە لــە شیرك

جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان سەبارەت بە داوا کردن لە کاتی تەنگانە، ئایا کەی دەبێتە شیرک؟

یەکەم: هەندێ زانا دەڵێن: (إذا استغاث بالمخلوق فيما لايقدر عليه إلا الله)، واتە: ئەگەر داوای لە دروستکراوەکان کرد لە توانایان دا نییە ئیلا لە توانای خوای گەورە دایە.

دووەم: هەندێک زانای تر دەڵێن: (اذا استغاث بالمخلوق فيما لايقدر عليه ذالك المخلوق)، واتە: ئەگەر داوای لە دروستکراوەکان کرد لە توانای دروستکراوەکان دا نەبوو.

جیاوازی نێوان ئەم دوو وتەیە بە نموونە: ئەگەر یەکێک تووشی ناخوشیەک ببێت بکەوێتە ناو ئاو بە کەسێک بڵێت کە مەلەوانیش نازانێت (أستغيث بك)، داوات لێ دەکەم رزگارم بکە، لەسەر وتەی یەکەم نابێتە شیرک و لەسەر وتەی دووەم دەبێتە شیرک کە وتەی ڕاست وتەی یەکەمە.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: ((استغاثة): جۆرێکە لە جۆرەکانی دوعا هەروەک باسمان کرد، چونکە (استغاثة) داوا کردنە و داوا کردنیش دوعایە.

وشەی دوعا گشتییە (استغاثە) و (استعاذە) و هەموو جۆرەکانی دوعا دەگرێتەوە.

(استغاثە) داوا کردن غوثە، وە غوثیش دێتە دی بۆ کەسێک تووشی تەنگانە و ناخۆشییەک بوو بێت ترسی ئەوەی هەبێت زیانێکی توندی بەر بکەوێت یان بە هیلاک بچێت.

بەڵام کەی استغاثه بە بێجگە لە خوا دەبێتە شیرک؟ هەندێ زانا دەڵێن دەبێتە شیرکی گەورە، ئەگەر داوای لە دروستکراوەکان کرد و لە توانای دروست کراوەکان دا نەبوو.

هەندێکی تر دەڵێن دەبێتە شیرکی گەورە، ئەگەر داوای لە دروست کراوەکان کرد لە توانای دروست کراوەکان دا نییە مەگەر لە توانای خوای گەورە دابێت، ئەم دوو وتانە لێک جیاوازن، وتەی ڕاست وتەی کۆتاییە)[١].

زانایان دەڵێن نابێت لە کاتی تەنگانە داوا لە مردوو یان لە کەسێکی غائب یان لە زیندوو بکەیت کە لە توانایان دا نەبێت ئیلا خوای گەورە، چونکە ئەمە شیرکی گەورەیە و لە دین دەردەچێت پەنا بەخوا.

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (جیاوازی نێوان دوعا و (استغاثه) ئەوەیە کە دوعا گشتی یە بۆ هەموو حاڵەکان، بەڵام (استغاثه) دوعا کردنە لەکاتی تەنگانە)[٢].

عبدالله بن جار الله دەفەرموویێت: (جۆرەکانی (الإستغاثة) سێ جۆرن:

١- واجب: ئەویش ئەوەیە تەنها داوا لەخوا دەکرێ.

٢- حەرام: ئەویش ئەوەیە داوا لە بێجگە لەخوا دەکرێ لە شتێک لە توانای کەس دا نییە ئیلا خوا نەبێت، وەک: استغاثه بە مردووەکان و کەسانێک ئامادە نین بۆ ڕاکێشانی سوود و لادانی زیان.

---

[١] التمهید لاپەڕە ١٧٥ ـ ١٧٦.

[٢] القول السدید لاپەڕە ٤٨ - ٤٩.

٣- دروست: ئەویش استغاثەیە بە کەسێکی زیندووی ئامادەبوو لەتوانای دایە سەری بخات .[١]

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هەر کەسێک واستە لەنێوان خۆی و خوا دابنێت، هەروەها توکل بخاتە سەری و داوای لێ بکات، ئەوا تووشی کوفر بووە بە یەک دەنگی هەموو زانایان)[٢].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ((من الشرك) من: للتبعيض، بە مانای هەندێک دێت، واتە شیرک تایبەت نییە بەمە، استغاثە داوا کردنی غوثە، کە لادانی ناخۆشی یە لە کاتی تەنگانەدا.

وتەی دانەری کتاب لەسەر اطلاقی خۆی نییە، بەڵکو تقید کراوە بەوەی کە لە توانای کەسەکەدا نەبێت، یان لەبەر ئەوەی مردووە یان لەبەر ئەوەی غائبە، یان شتێکە لە توانای کەس دا نییە ئیلا خوا نەبێت، ئەگەر استغاثە بە مردوو بکات بۆ ئەوەی شت لەسەری لابچێت، یان غائیبێک یان زیندوویێکی ئامادەبوو بۆ ئەوەی باران بباریێنێت، ئەگەر پەنا بگرێت بە زیندوویێکی ئامادەبوو لە توانای دا بێت ئەوە دروستە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ﴾ [القصص: ١٥].

ئەگەر داوای غوث لە کەسێک بکەیت لە توانایدا بێت، ئەوە واجبە لەسەرت تەوحیدی خۆت ڕاست بکەی، باوەڕت وابێ ئەمە هۆکارە و خۆدی هۆکارەکە کاریگەر نییە بۆ لادانی نەخۆشی، چونکە هەندێک جار پشتی پێ دەبەستیت و دروستکاری هۆکار لەبیر دەکەیت، ئەمە بریندار کردنە لە تەواوی تەوحید.

---

[١] الجامع الفريد لاپەڕە (٥٩).

[٢] مجموع الفتاوى (١٢٤/١)، (٤٧/١٩).

وتەی: (أو يدعو غيره) معطوفه لەسەر وتەی (أن يستغيث) ماناکەی بەم شێوەیە: لە شیرکە دوعا لە بێجگە لە خوا بکەیت، چونکە دوعا عیبادەتە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ۝٦٠﴾ [غافر: ٦٠]، (عبادتي)؛ أي: (دعائي)، خوای گەورە دوعای ناو ناوە بە عیبادەت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (إن الدعاء هو العبادة) ....

(أو يدعو) ئەمە لە بابی عطفی عامە لەسەر خاص، چونکە استغاثە دوعاکردنە بۆ لاچوونی ناخۆشی لە کاتی تەنگانەدا، دوعا گشتی یە بۆ ڕاکێشانی سوود، یان لادانی زیان)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: ((الإستغاثة): داواکردنی غوثە، ئەمەش نابێت ئیلا کاتی تەنگانە نەبێت، بەڵام دوعا گشتی یە، بۆ کاتی تەنگانە و کاتی تر، عطف کردنی دوعا بەسەر استغاثە عطف کردنی عامە لەسەر خاص)[2].

[1] القول المفيد.

[2] إعانة المستفيد (١/٢٦٧).

**وقوله تعالى:** ﴿وَلَا تَدۡعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَۖ فَإِن فَعَلۡتَ فَإِنَّكَ إِذٗا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ۝١٠٦ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ﴾ [یونس: ١٠٦-١٠٧]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (داوا مەکە لە بێجگە لەخوا، ئەوە سوودت پێ ناگەیەنێت ئەگەر بیپەرستی، وە زیانت پێ ناگەیەنێت ئەگەر نەیپەرستی "یان نە سوودت پێ دەگەیەنێت و نە زیان"، ئەگەر وات کرد ئەوە تۆ لە ستەمکارەکانیت).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾: واتە: داوا مەکە لە بێجگە لەخوا، یان داوا مەکە لە کەس لەگەڵ خوای گەورە.

﴿مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ﴾: واتە: ئەوە سوودت پێ ناگەیەنێت ئەگەر بیپەرستی، وە زیانت پێ ناگەیەنێت ئەگەر نەیپەرستی، یان نە سوودت پێ دەگەیەنێت و نە زیان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار الله دەفەرموویێت: (لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی لەم بابە هێناوە چونکە کەس سوود ناگەیەنێت و زیان لا نادات ئیلا خوا نەبێت، هەر کەسێک داوا لە بێجگە لەخوا بکات ئەوە شەریکی بۆ خوا بڕیار داوە)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

[1] الجامع الفرید لاپەڕە (٦٠).

**١-** زەمی شیرک و ئەهلی شیرک کردن، پەرستراوەکانیان هیچ سوود و زیانیان نییە، لەبەر وتەی: ﴿مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ﴾.

**٢-** شیرک گەورەترین ستەمە، موشریکەکان ستەمکارن، لەبەر وتەی: ﴿فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾.

**٣-** هەر شتێک تووشی مرۆڤ بێت لە بەلا و موسیبەت و ناخۆشی هەمووی بە قەدەری خوای گەورەیە، لەبەر وتەی: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ﴾.

**٤-** ئەوەی ناخۆشی و زیان هەڵدەگرێت و لادەدات تەنها خوای گەورەیە، بۆیە دەبێت تەنها داوا لەخوا بکرێت و پەیوەست بیت بە خواوە، لەبەر وتەی: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ﴾.

**٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نابێت داوا لە بێجگە لەخوا بکەیت لە شتێک لە توانای کەس دا نییە مەگەر خوا، چونکە نەهی کراوە.

**٦-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە خطاب ئاراستە کردن بۆ پێغەمبەران مانای ئەوە ناگەیەنێت کە شتەکە ڕوو بدات.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ظاهری ئایەتەکە وایە خطاب بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) جا تایبەت بێت پێی یان گشتی بێت بۆی و بۆ کەسانی تر، هەندێک زانا دەڵێن ناکرێت بۆ پێغەمبەر بێت، چونکە مەحالە پێغەمبەر (ﷺ) تووش ببێت، ئایەتەکە تقدیری هەیە، ئەمە وتەیە زۆر لاوازە، چونکە دەرچوواندنی ئایەتە لەسەر ماناکەی خۆی.

وتەی ڕاست یان تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ) و وە حوکم بۆ ئەوە و کەسانی ترە، یان عامە بۆ هەموو کەسانێک و وە پێغەمبەریش داخل دەبێت.

خطاب ئاراستە کردن مانای ئەوە ناگەیەنێت کە شتەکە ڕوو بدات، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ [الزمر: ٦٥]، خطاب بۆ پێغەمبەرە و بۆ هەموو پێغەمبەرەکانە، ناکرێ پێغەمبەر تووشی شیرک بێت بە گوێرەی حالی کە پێغەمبەرە، نەک بە گوێرەی ئەوەی مرۆڤە.

کەواتە حیکمەت لە نەهی ئەوەیە کەسانی تریش پابەند بن پێوە، ئەگەر ئەم نەهی یە ئاراستەی کەسێک کرابێت ناکرێ تووش ببێت (واتە: تووشی شیرک نابێ) ئەوە کەسانی تر لەپێش ترن کە ئەگەری تووش بوونیان هەیە بە شیرک)[1].

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەر کەسێک داوا لە بێجگە لەخوا بکات لە ستەمکارانە.

**٨-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بێجگە لەخوا ناتوانن سوود و زیانتان پێ بگەیەنن.

**٩-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ڕاکێشانی سوود و لادانی زیان تایبەتمەندی خوایە.

---

[1] القول المفيد (١/٣٣٧-٣٣٨).

**وقوله:** ﴿فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ﴾ [العنكبوت: ١٧]

واته: خوای گەورە دەفەرموویێت: (داوای ڕزق و ڕۆزی تەنها لەخوا بکەن و تەنها ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ دامەنێن، تەنها شوکری خوا بکەن لەسەر نیعمەتەکانی، لەڕۆژی قیامەتیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ﴾: داوای ڕزق و ڕۆزی تەنها لەخوا بکەن و تەنها ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ دامەنێن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار الله دەفەرموویێت: (خوای گەورە فەرمانی کردووە بە داوا کردنی رزق تەنها لە خۆی، چونکە خۆی باڵادەستە بەسەری، هەر کەسێک داوا لە بێجگە لەخوا بکات لە توانای دا نەبێت ئەوە تووشی شیرک بووە)[١].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دەبێت داوای ڕزق تەنها لەخوا بکەیت.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە استغاثە و دوعا گەورەترین شتن دروستکراوەکان پێوە پەیوەست بن بۆ داوا کردنی ڕزق، چونکە داواکردنی ڕزق گەورەترین هۆکاری ژیانە، هەر کەسێک ڕزقی لەلا نەبێت نزیکە بەهیلاک بچێت، لەبەر ئەوە ئیمام ئەم ئایەتەی باسکردووە وەک

[١] الجامع الفرید لاپەڕە ٦١.

دەق بۆ تەوحید لە ڕووی داوا کردنی ڕزق وڕۆزی، چونکە گەورەترین شت حالی ئەوانەی داوا دەکەن لە کاتی تەنگانە داواکردنی ڕزق و ڕۆزی یە.

ڕزق ناوێکی گشتی یە هەموو شتێک دەگرێتەوە گونجاو و چاک بێت، ئەمانە داخل دەبن: لەش ساغی و تەندروستی و مال و خواردن و خانوو ئاژەڵ و هەموو شتێک کە مرۆڤ پێویستی پێی هەبێت)[1].

[1] التمهيد لاپەڕە (١٨١).

**وقوله:** ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ۝٦﴾ [الأحقاف: ٥-٦]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (کێ لەو کەسە گومڕاترە کە جگە لەخوا لە کەسێکی دیکە داوا دەکات یان دەیپەرستێت، کە ئەو داوا لێکراوە هەر کەسێک بێت یان هەر شتێک بێت، تا ڕۆژی قیامەت جوابی ناداتەوە، ئەو کەسانەی کە داوایان لێکراوە حاڵیان وایە کە لە داواکردن و پەرستنەکەی ئەمانە بێ ئاگان، کاتێک کە دروستکراوەکان حەشر کران، ئەوان دەبن بە دوژمنی ئەمانە، ئەو کاتە بەرامبەر عیبادەت و پەرستنی ئەمانیش، بەری بوون و دووری خۆیان ڕادەگەیەنن و حاشایان لێ دەکەن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾: ئەم ئایەتە بەشێوەی استفهام ئینکاری هاتووە زۆر بەهێزترە لە نەفی، بێگومان کەس لەو کەسە گومڕاترە نییە کە عیبادەتی جگە لەخوا دەکات و هانا و هاواری بۆ دەبات.

﴿وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾: ڕۆژ قیامەت ئەم پەرستراوانە دەبن بە دوژمنی ئەوانەی پەرستوویانە، نەفرەت لە یەکتر دەکەن و خۆیان لە یەکتری بەری دەکەن، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُمْ بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُمْ بَعْضًا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ نَاصِرِينَ۝٢٥﴾ [العنكبوت: ٢٥]

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار دەفەرموویت: (ئەم ئایەتەی لەبەر ئەوە هێناوەتەوە لەم بابە، خوای گەورە خەبەری داوە كەس لەو كەسە ستەمكارتر نییە كە داوا لە بێجگە لەخوا دەكات، چونكە شەریكی بۆ خوا بڕیار داوە لە عیبادەتدا)[1].

**سوودەكانی ئایەتەكە:**

١- كەس لەو كەسە گومڕاتر نییە كە عیبادەتی پەیكەر دەكات كە هیچ سوودی نییە، كە پەیكەر نە دەبیستێت و نە وەڵامی دەداتەوە، بەڵكو لە بێ گیانەكانە و بێ ئاگایەكانە، لەبەر وتەی: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾.

٢- وتەی: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ۝ وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ۝٦﴾، بەڵگەیە دەبێت مرۆڤ هەموو پەیوەست بوونەكانی ببڕێت تەنها بە خواوە نەبێت، عیبادەتی خوا بكات و لێی بترسێت و ئومێدی پێی هەبێت، وە تەنها داوا لەخوا بكات و خۆشی بوێت و بەگەورەی دابنێت، تا ببێتە بەندەی ڕاستەقینە، هەواو و ویست و خۆشەویستی و ڕق لێ بوونەوەی و دۆستایەتی و دوژمنایەتی تەنها بۆ خوا بێت و لەپێناو خوا بێت.

٣- وتەی: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾، بەڵگەیە كەس گومڕاتر نییە لەو كەسە كە داوا لە جگە لەخوا دەكات.

[1] الجامع الفريد لاپەڕە (٦١).

ابن باز ڕەحمەتی خوای لیَ بێت دەفەرموویێت: (ئەم ئایەتە ڕوونی کردۆتەوە کەس لەو کەسە ستەمکارتر نییە کە داوا لە بێجگە لەخوا دەکات لە شتێک کە تەنها لە توانای خوا دایە، چونکە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت لە دونیا، وە لە ئاخیرەت لە خەسارەتمەندەکان دەبێت و بۆ ناو ئاگرە.

وەسفی ئەوانەی داوایان لێکراوە بە چوار سیفەت:

یەکەم: ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە تا ڕۆژی قیامەت.

دووەم: ئەوان بێ ئاگان لە دوعاکانیان، یان لەبەر ئەوەی مردوون، یان بێ گیانن هەستیان نییە و هەست بە هیچ ناکەن، یان سەرقالن، یان فریشتەیەکە زانستی نییە بەو کەسەی داوای لێ دەکات.

سێیەم: ئەوان لە ڕۆژی قیامەت دەبنە دوژمنی ئەوانە کە بەندایەتیان کردووە.

چوارەم: ئەوان خۆیان بەری دەکەن و ئینکاریان دەکەن)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ابن تیمیە لە زۆر لە نامەکانی باس دەکات، بەم مانایە: هەرشتێک گۆڕ پەرستان بەدەست دێنن لە پێویستیەکانی خۆیان کە داوایان لە گۆڕ کردووە و بەدەستیان هێناوە، ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ڕاستی مەزهەبیان، چونکە مەبەست لەمە تاقیکردنەوەیە لە لایەن خواوە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕایان بکێشێت، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: "﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴿٤٤﴾﴾ [القلم: ٤٤]" ...)[٢].

---

(١) التعليق المفيد لاپەڕە (٩٢).
(٢) إعانة المستفيد (١/٢٦٧).

**٤-** وتەی: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾، وەسفی پەیکەرەکان کراوە بەوە وەڵام نادەنەوە و بێ ئاگان، لەگەڵ ئەوەش حاڵیان دیارە، لەبەر لاوازی و بیرهێنانەوەی لاوازی حاڵیانە.

**٥-** جێگیرکردنی ڕۆژی قیامەت حەشر و حساب، لەبەر وتەی: ﴿وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ﴾.

**٦-** کاتێک کە خەڵکی کۆ دەکرێنەوە بۆ لێ پرسینەوە، پەیکەر و پەرستراوەکان دەبنە دوژمن بۆ ئەو کەسانە کە لەدونیادا دەیانپەرستن، بەهیچ شێوەیەک بڕوایان پێ ناکەن، بەڵکو بەدرۆیان دەخەنەوە، لەبەر وتەی: ﴿وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾.

**وقوله تعالى:** ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴿٦٢﴾﴾ [النمل: ٦٢]

واته: خوای گەورە دەفەرموویت: (پێم بڵێن ئەوانەی کە ئێوە کردووتانە بە شەریکی خوا، ئەوانە باشترن یان خوا؟! کێ دێت بەهانای هەر کەسێکەوە کە لە تەنگانە و نارەحەتیدا بێت، نارەحەتی و تەنگانەکەی لەسەر لادەدات، کاتێ هاوار بۆ دەبات هەر ئەو بەلا و زەرەر و زیان لادەدات، و ئێوەی کردووە بە جێگرەوەی قەومەکەی پێش خۆتان، و کەسانی دیکەش دەکات بە جێگری ئێوە لە دوای نەمانی ئێوە، ئایا هیچ پەرستراوێکی دیکە هەیە لەگەڵ الله کە بتوانێت ئەو کارانە بکات، هەتا ئێوە بڕۆن عیبادەتی بۆ بکەن و لەوەدا بیکەن بە شەریکی الله، زۆر کەم بیر دەکەنەوە لە شتێ کە ببێتە مایەی هیدایەتیان، بۆیە شەریک بۆ خوا دادەنێن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ﴾: واتە: کێ دێت بەهانای هەر کەسێکەوە کە لە تەنگانە و نارەحەتیدا بێت، نارەحەتی و تەنگانەکەی لەسەر لادەدات، کاتێ هاوار بۆ دەبات.

﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ﴾: واتە: ئێوەی کردووە بە جێگرەوەی قەومەکەی پێش خۆتان، و کەسانی دیکەش دەکات بە جێگری ئێوە لە دوای نەمانی ئێوە.

﴿قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ﴾: واتە: زۆر کەم بیر دەکەنەوە لە شتێ کە ببێتە مایەی هیدایەتیان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار الله دەفەرموویت: (ڕووی کردنە بەڵگە هەر کەسێک داوا لە بێجگە لەخوا بکات ئەوە شەریکی بۆ خوا بڕیار داوە)[١].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دەبێت تەنها داوا لەخوا بکرێت، کەس ناتوانێت ئەمە بکات مەگەر خوا، نابێت داوا لە کەس بکرێت ئیلا خوا[٢].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئیخلاس هۆکارە بۆ قبول بوونی دوعا.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە تەنها خوا وەڵامی دوعای لێ قەوما دەداتەوە.

---

[١] الجامع الفريد لاپەڕە (٦٣).
[٢] التعليق المفيد لاپەڕە (٩٣).

**وروي الطبراني بإسناده أنه كان في زمن النبي منافق يؤذي المؤمنين، فقال بعضهم: قوموا بنا نستغيث برسول الله (ﷺ) من هذا المنافق. فقال النبي: (إنه لا يستغاث بي، وإنما يستغاث بالله).**

واته: تەبەڕانی دەگێڕێتەوە کە لە زەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) دووڕوویێک هەبوو ئازاری ئیمانداارانی دەدا، هەندێکیان گوتیان: با هەستین هاوار بەرین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە دەست ئەو دووڕووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هاوار بۆ من ناهێنرێت، بەڵکو هاوار تەنها بۆ خوا دەبردرێت).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ((منافق) ئەو کەسەیە کە ئیسلامی خۆی بەدیار دەخات و لەناخی کوفر هەیە، ئەمانە بەدیارکەوتن دوای غەزوەی بەدر، ناوی ئەم دووڕووە باس نەکراوە لە فەرموودە، لەوانەیە عبدالله بن أبي بێت، چونکە بەناو بانگ بووە بە ئازاردانی موسلمانان، وە لەوانەش کەسی تر بێت، بزانە ئازاردانی موسلمانان لە لایەن دووڕووەکانەوە بە لێدان و شەڕ نەبووە، چونکە خۆیان وا دەردەخست کە موسلمانانی خۆش دەوێت، بەڵام بە قسە و خستنەڕوو موسلمانانیان ئازار دەدا هەروەک چیڕۆکی بوختان دانە پاڵ عائیشە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: ((كان رجل) ناوی باس نەکراوە لێرە، ڕیوایەت هاتووە کە عبدالله بن أبي بووە، گەورەی دووڕووەکان.

(منافق): نیفاق: بەدیارخستنی خێرە و شاردنەوەی شەڕە، نیفاق دوو جۆرە: نیفاقی بیروباوەڕ و نیفاقی کردەوە، نیفاقی بیروباوەڕ کوفری گەورەیە، وە خاوەنەکەی لە ژێرەوەی ئاگرە، ماناکەی بەدیارخستنی ئیمانە و شاردنەوەی کوفرە.

---

[1] القول المفيد.

هۆكاری نیفاق: كاتێک ئیسلام بەهێز بوو دوای كۆچ كردنی پێغەمبەر (ﷺ)، خەلكانێک ویستیان بژین لەگەڵ موسلمانان، بەڵام نەیان توانی بژین لەگەڵ موسلمانان ئیلا بە دیار خستنی ئیسلام، ئەوان ئیسلامیان ناوێت و ئیسلامیان خۆش ناوێ، پەنایان بردە بەر فێڵێک ئەویش: بەدیارخستنی ئیسلام بۆ ئەوەی بژین لەگەڵ موسلمانان، وە لەناخی خۆیان لەسەر كوفرن، ئەمانە ناونران بە دووڕوو، ئەمە نیفاقی بیروباوەڕە.

سەبارەت بە نیفاقی كردەوە: هەندێک موسلمانان بیروباوەڕیان سەلامەتە و ئیمانیان بەخوا هەیە، بەڵام هەندێک سیفەتی دووڕوویانی تێدایە، وەک: درۆ لە قسە كردن دا، و غەدر كردن، وە بەڵێن شكاندن، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا ئتمن خان)، ئەمە نیفاقی كردەوەیە، خاوەنەكەی موسڵمانە، بەڵام سیفەتێک لە سیفەتەكانی نیفاقی تێدایە، ئەمەیان زۆر ترسناكە، هەندێک جار دەگات بە نیفاقی گەورە ئەگەر تەوبەی لێ نەكات. ....

(فقال بعضهم) ناوی بێژەر نەوتراوە: هەندێک ڕیوایەت هاتوون كە ئەبوبكر بووە خوا لێی ڕازی بێت)[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ڕیوایەتی تر هاتووە فەرموودەی عبادە بن صامت، باس دەكات دووڕووەكە عبدالله بن أبي بن سلول بووە، لە سەنەد هەندێک لاوازی هەیە.

هاوەڵان داوای غوثیان لە پێغەمبەر نەكرد (واتە غوثی شیركی)، چونكە توانای هەبوو ڕزگاریان بكات یان بە كوشتنی یان بە سجن كردنی، ئەوان دەیان زانی استغاثە بە زیندوو دروستە ئەگەر لەتوانایدا هەبێت، لەبەر ئەوە چوونە لای.

---

[1] إعانة المستفيد (٢٧٦/١-٢٧٧).

وتەی: (لا تستغاث بي) دوو ئەگەری هەیە:

یەکەم: پێغەمبەر (ﷺ) ناتوانێت بیکوژێت، چونکە کوشتنیان قەدەغەکراو بوو، بۆ ئەوەی خەلک نەڵێن محمد هاوەڵانی خۆی کوشت، ڕێگری کرا لە کوشتنی.

دوومەم: لەوانەیە ئەگەر خەبەرەکە صحیح بێت لەبەر ئەوە وای گوتبێ وەک داخستنی دەرگا ئەگەر چی تواناشی هەیە ڕزگاری بکات، بۆ ئەوەی تووشی ئەم وشەیە نەبن لە شتێک لە توانای کەسێک دا نییە.

ڕووی هێنانەوەی ئەم فەرموودە: استغاثە بە بێجگە لەخوا ناکرێ ئیلا لە شتێک کەسێکی زیندوو لەتوانایدا بێت)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ابن تیمیە لە مجموع الفتاوی (٢٥/٤)دا دەفەرمووێت: ئەهلی فەرموودە فەرموودەی لاواز ناکەنە بەڵگە بۆ أصولەکان، یان بە پاڵپشتی، واتە پاڵپشتی هەیە بۆ ئەصلەکە، یان بۆ فەرعێک لە فەرعەکان.

ئەمەش ڕێچکەی دانەری کتابە لەم کتابە، مانای فەرموودەکە دەکاتە بەڵگە ئەگەر چی فەرموودەکە لە سەنەد لاواز بێت بەڵام ماناکەی ڕاستە و پاڵپشتی هەیە بۆ ماناکەی)[2].

---

[1] التعليق المفيد.
[2] التمهيد لاپەڕە (١٨٥).

**باب قول الله تعالى:** ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾﴾ [الأعراف: ١٩١-١٩٢]

**وقوله:** ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾﴾ [فاطر: ١٣-١٤]

**وفي (الصحيح) عن أنس قال: شج النبي (ﷺ) يوم أحد وكسرت رباعيته، فقال: (كيف يفلح قوم شجوا نبيهم)؟ فنزلت:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨] [1]

**وفيه عن ابن عمر رضي الله عنهما أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول إذا رفع رأسه من الركوع في الركعة الأخيرة من الفجر: (اللهم العن فلانا وفلانا) بعدما يقول: (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) فأنزل الله تعالى:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨] [2]

**وفي رواية: يدعو على صفوان بن أمية، وسهيل بن عمرو والحارث بن هشام، فنزلت:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨] [3]

---

[1] أخرجه مسلم (١٧٩١)، والبخاري تعليقا في كتاب المغازي باب (ليس لك من الأمر شيء).

[2] أخرجه البخاري (٤٠٦٩).

[3] أخرجه البخاري (٤٠٧٠) مرسلا، والترمذي (٣٠٠٤)، وأحمد (٩٣/٢ رقم ٥٦٧٤).

**وفيه عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قام رسول الله (ﷺ) حين أنزل عليه:** ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ٢١٤﴾ [الشعراء: ٢١٤] **قال: (يا معشر قريش ـ أو كلمة نحوها ـ اشتروا أنفسكم، لا أغني عنكم من الله شيئا، يا عباس بن عبد المطلب لا أغني عنك من الله شيئا، يا صفية عمة رسول الله (ﷺ) لا أغني عنك من الله شيئا، ويا فاطمة بنت محمد سليني من مالي ما شئت لا أغني عنك من الله شيئا)**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الآيتين.

**الثانية:** قصة أحد.

**الثالثة:** قنوت سيد المرسلين وخلفه سادات الأولياء يؤمنون في الصلاة.

**الرابعة:** أن المدعو عليهم كفار.

**الخامسة:** أنهم فعلوا أشياء ما فعلها غالب الكفار. منها: شجهم نبيهم وحرصهم على قتله، ومنها: التمثيل بالقتلى مع أنهم بنو عمهم.

**السادسة:** أنزل الله عليه في ذلك ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾

**السابعة:** قوله: ﴿أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٢٨]

**الثامنة:** القنوت في النوازل.

---

[1] أخرجه البخاري (٢٧٥٣)، ومسلم (٢٠٦).

**التاسعة:** تسمية المدعو عليهم في الصلاة بأسمائهم وأسماء آبائهم.

**العاشرة:** لعنه المعين في القنوت.

**الحادية عشرة:** قصته (ﷺ) لما أنزل عليه: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾

**الثانية عشرة:** جده (ﷺ) في هذا الأمر، بحيث فعل ما نسب بسببه إلى الجنون، وكذلك لو يفعله مسلم الآن.

**الثالثة عشرة:** قوله للأبعد والأقرب: (لا أغني عنك من الله شيئا) حتى قال: (يا فاطمة بنت محمد لا أغني عنك من الله شيئا) فإذا صرح (ﷺ) وهو سيد المرسلين بأنه لا يغني شيئا عن سيدة نساء العالمين، وآمن الإنسان أنه (ﷺ) لا يقول إلا الحق، ثم نظر فيما وقع في قلوب خواص الناس الآن ـ تبين له التوحيد وغربة الدين.

## باب قول الله تعالى: ﴿أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ١٩١ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٢﴾ [الأعراف: ١٩١-١٩٢]

واته: خوای گەورە دەفەرموویێت: (چۆن شەریک بۆ خوا دادەنێن و چۆن کەسانێک دەپەرستن کە بێ توانان، ئەو کەسانە ناتوانن هیچ شتێک دروست بکەن، لەگەڵ ئەوەش دا خۆشیان دروستکراون، سەرەڕای ئەوەش ناشتوانن هیچ خراپە و زیانێک لەسەر ئەوانە لابدەن کە پەرستویانن، وە ناشتوانن هیچ خراپە و زیانێک لە خۆشیان لابدەن).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ١٩١ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَا أَنْفُسَهُمْ يَنْصُرُونَ﴾: ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە ئەم پەیکەرانە نابێت بپەرسترێن لەبەر چوار هۆکار، کە ئەمانەن:

١- ئەوانە ناتوانن شت دروست بکەن، ئەوەی شت دروست ناکات شایستەی ئەوە نییە بپەرسترێت.

٢- ئەوان دروستکراون لە نەبوونەوە، ئەوان هەژارن و پێویستیان بە کەسانی تر هەیە بۆ سەرەتا و بەردەوام بوون.

٣- ئەوان ناتوانن ئەوانە سەربێخن کە پەرستوویانن، وتەی ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾، بەهێزترە لە وتەی: (لا ينصرونهم)، چونکە ئەگەر بیگوتبا: (لا ينصرونهم)، لەوانەیە یەکێک بیگوتبا: دەتوانن سەریان بخەن، بەڵام کاتێ فەرمووی ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا﴾، ئەوە بەهێزترە بۆ بە دیارکەوتنی لاوازیان.

٤- ئەوان ناتوانن نەفسی خۆیان سەر بخەن)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سیفەتەکانی ئەوانەی دەپەرسترێن بێجگە لەخوا چوار سیفەتن، کە ئەمانەن:

١- ئەوان ناتوانن هیچ شتێک دروست بکەن.

٢- ئەوان خۆیان دروستکراون.

٣- ئەوان ناتوانن هیچ خراپە و زیانێک لابدەن لەسەر ئەوانەی کە پەرستویانن.

٤- هەروەها ناشتوانن هیچ خراپە و زیانێک لەسەر خۆشیان لابدەن)[٢].

شەوکانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەر کەسێک نەتوانێت نەفسی خۆی سەربخات، ئەوە بۆ سەرخستنی نەفسی کەسانی تر لاوازترە و ناتوانێت سەریان بخات).

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە کەس شیاوی ئەوە نییە داوای لێ بکەیت و عیبادەتی بۆ بکەیت ئیلا خوا نەبێت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

---

(١) القول المفید.

(٢) التعلیق المفید.

**١-** ئینکاری کردنی موشریکەکان و سەیری حاڵیان لەوە شەریک بۆ خوا بڕیار دەدەن ناتوانن هیچ شتێک دروست بکەن، بەڵکو خۆی دروستکراون، لەبەر وتەی: ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾.

**٢-** لاوازی ئەو پەرستراوانەی موشریکەکان پەرستوویانە جگە لەخوا، ناتوانن سەریان بخەن بەڵکو ناتوانن نەفسی خۆشیان سەربخەن، لەبەر وتەی: ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَا أَنْفُسَهُمْ يَنْصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِنْ تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَى لَا يَتَّبِعُوكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنْتُمْ صَامِتُونَ﴾.

**٣-** ئاماژەیە بۆ جەهلی موشریکەکان.

**وقوله:** ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ۝١٣ إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٍ ۝١٤﴾ [فاطر: ١٣-١٤]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویّت: (هەموو ئەوانەی کە ئێوە داوایان لێدەکەن و دەیانپەرستن، جگە لە "الله" خاوەنی توێکلی ناوکە خورمایەکیش نین، جا ئەگەر داوایان لێ بکەن گوێیان لە داوا و دوعاکانتان نابێت، ئەگەر گوێشتیان لێ بێت وەڵامتان نادەنەوە، لە ڕۆژی قیامەتیش دا بەرامبەر ئەو شیرک و هاوبەش دانانەی ئێوە خۆیان بەری دەکەن و دوژمنایەتیان بەرامبەر ئێوە ڕادەگەیەنێن، هیچ نییە وەک خوا کە خەبیرە خەبەری عاقیبەت و مەصیری کارەکانتان پێ ڕابگەیەنێت).

### ڕاقەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾: واتە: هەموو ئەوانەش کە ئێوە داوایان لێ دەکەن و دەیانپەرستن بێجگە لەخوا.

﴿مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ﴾: واتە: خاوەنی توێکڵی ناوکە خورمایەکیش نین.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە دەبێت تەنها ڕوو لەخوا بکەیت و نابێت داوا لە دروستکراوەکان بکەیت لە شتێک دا کە تەنها بەخوا دەکرێت.

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** بەکەم دانانی ئەو پەرستراوانەی موشریکەکان پەرستوویانە، کە خاوەنی کەمترین شت نین و هیچیان بەدەست نییە، لەبەر وتەی: ﴿وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ﴾.

**٢-** بەلاغەتی قورئان لە بەکەم دانانی پەرستراوەکانیان بۆ لێ دوورکەوتنەوەیان.

**٣-** ساویلکایەتی عەقلی موشریکەکان بەجۆرێک شتێک دەپەرستن گوێیان لە دوعاکانیان نییە، مردوون و بێ گیانن و لێیان بێ ئاگان، ئەگەر گوێشیان لێ بێت کە ئەمە دوورە، ئەوە ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە، لەبەر وتەی: ﴿إِنْ تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ﴾.

**٤-** کوفری پەرستراوەکان و خۆبەری کردن لەوانەی کردوویانە بە هاوەڵی خوا، لەبەر وتەی: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾.

**٥-** جێگیرکردنی قیامەت و لێپرسینەوە، لەبەر وتەی: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾.

**٦-** کەس خەبەری ڕاست تر نییە لەخوا، لەبەر باڵادەستی زانستی بە هەموو شتێک، لەبەر وتەی: ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾.

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ داواکردن لە کەسێک دەبێت کەسی داوا لێکراو ئەم سێ مەرجەی تێدابێت:

یەکەم: دەبێت خاوەنی ئەو شتە بێت کە داوای لێ دەکرێت.

دووەم: دەبێت گوێی لە داوای ئەو کەسە بێت کە داوای لێ دەکات.

سێیەم: دەبێت توانای وەڵام دانەوەی هەبێت.

ئەم سێ شتانە لە کەس دا نییە ئیلا لە خوا نەبێت، چونکە خاوەنی هەموو شتێکە و گوێی لە هەموو شتێکە و توانای وەڵام دانەوەی هەموو شتێکی هەیە، بەڵام ئەو پەرستراوانەی دەپەرسترێن بێجگە لەخوا، ئەوان:

یەکەم: هەژارن و هیچ موڵکیان نییە.

دووەم : گوێیان لە داوای ئەو کەسە نابێت کە داوایان لێ دەکەن.

سێیەم: ئەگەر گوێشیان لێ بێت ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە.

وتەی خوای گەورە: ﴿مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾، مەرجی یەکەمی نەفی کرد، هەروەها وتەی: ﴿إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُواْ دُعَآءَكُمْ﴾، مەرجی دووەمی نەفی کرد، وتەی: ﴿وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ﴾﴾، مەرجی سێیەمی نەفی کرد[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (وەسفی پەرستراوەکانی ئەوان کراوە بە چوار سیفەت:

١- ئەوان نابنە خاوەنی هیچ شتێک، تەنانەت توێکڵی خورماش.

٢- ئەوان گوێیان لە دوعای ئەوانە نابێ کە داوایان لێ دەکەن.

٣- ئەگەرچی گوێشیان لێ بێت ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە.

٤- ئەو پەرستراوانە خۆیان لەوان بەری دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا.

---

[١] إعانة المستفيد (٢٨٥/١).

ئەمە حاڵی موشریکەکانە کە خەسارەتمەندن لە دونیا و ئاخیرەت دا)[١].

**٨-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە مردوو گوێی لە زیندوو نابێت، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بەم بابەتە:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون مردوو گوێی لە زیندوو نابێت، کە ئەمە وتەی عائشە وابن عباس وابن مسعود و زۆربەی زانایان، وتەی ابن عابدين و وابن الهمام و ابن نجيم و والحصفكي و المازري و الباجي و القاضي عياض من المالكية و القاضي أبي يعلى من الحنابلة و الشيخ الألباني و باز و ابن عثيمين.

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون مردوو لە هەندێک حاڵەت دا گوێی لە زیندوو دەبێت نەک لە هەموو حاڵەتەکان.

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون مردوو گوێی لە زیندووە لە هەموو حاڵەتەکان، بەڵام ناتوانێ وەڵامیان بداتەوە و سوودی بۆیان هەبێت.

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم دەقانە و نموونەی تری وەک ئەمانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە مردوو هەندێک جار گوێی لێ دەبێت، نابێت گوێ لێ بوون بەردەوام بێت، بەڵکو حالەت هەیە گوێی لێ دەبێت و حاڵەت هەیە گوێی لێ نابێت)[٢].

ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ ٢٢﴾ [فاطر: ٢٢]، سیاقی ئایەتەکە مەبەستی ئەوەیە کافری دڵ مردوو ناتوانرێ شتێک بدرێتە بەر گوێی بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگریت، هەروەک چۆن ئەوانە لەناو

---

[١] التعليق المفيد.

[٢] مجموع الفتاوى (٣٦٦/٥).

گۆڕن ناتوانی شتێک بدەیتە بەر گوێیان و سوودی لێ وەربگرن، هیچ بەڵگە نەهاتوون کە خاوەنی گۆڕەکان هەرگیز گوێیان لە هیچ شتێک نابێت، چۆن پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە کە مردوو گوێی لە دەنگی نەعەلەکان دەبێت کاتێک زیندووەکان گۆڕستان جێ دێلن؟ خەبەری داوە بەوەی کە کوژراوەکانی بەدر گوێیان لێ بووە و ڕێگە دراوە سەلام لە مردووەکان بکەیت بە صیغەی خطاب و حاضر، وە خەبەری داوە هەر کەسێک سەلام لە برای ئیمانداری خۆی بکات وەڵامی سەلامی دەداتەوە)[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەمە تەفسیلی تێدایە، سەبارەت بەوەی گوێیان لە هەموو هەواڵەکان دەبێت نەخێر ئەمە ڕاست نییە، چونکە:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ [النمل: ٨٠]

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴿٢٢﴾﴾ [فاطر: ٢٢].

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (إذا مات ابن آدم انقطع عمله إلا من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له)، لەوانە گوێ لێ بوون قطع دەبێت ئیلا ئەوە نەبێت کە دەقی لەسەر هاتبێت، لەوانە: مردوو گوێی لە دەنگی نەعەلەکان دەبێت کاتێک جێی دەهێڵن، ئەمەیان دەق هاتووە لەم حاڵەتە گوێی لێ دەبێت، وە کاتێک فریشتە دێتە لای و پرسیاری لێ دەکات گوێی لێ دەبێت، من ربك؟ وما دينك؟ ئەمەیان دەقی لەسەر هاتووە.

سەبارەت بەوەی گوێی لە هەواڵیان دەبێت لە ماڵەوە نەخێر ئەمە ڕاست نییە، هیچ بەڵگەی لەسەر نەهاتووە، گوێی لێیان نابێت و هەواڵیان نازانێت.

---

[1] الروح لاپەڕە (٦٠).

سەبارەت بەوەی کەسێک دێتە لای و سەلامی لێ دەکات، لەمە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان خەبەر هاتووە بەڵام لاوازە، ئەگەر سەلامی لێ بکەیت دەتناسێتەوە و خوای گەورە ڕوحی دەگەڕێنێتەوە هەتا وەڵامی سەلام بداتەوە، ئەم وتەیە ڕوویەکی هەیە بۆ بەهێزی، لەو فەرموودە صحیحە وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (ما من أحد يسلم علي إلا رد الله علي روحي حتى أرد عليه السلام)، ئەم وتەیە بەهێزە، ئەگەر سەلامی لێ بکات لە دونیا بیناسێت، ئەوە خوای گەورە ڕوحی دەگەڕێنێتەوە هەتا وەڵامی سەلام دەداتەوە، وتەیەکی بەهێزە، بەڵام فەرموودەکە بۆ صحیحی تێڕوانینی لەسەرە کە لاوازە، دەوترێ: لەوانەیە ئەمە وابێت، والله أعلم)[1].

پوختەی وتەی زانایان:

١- وتەی ڕاست ئەوەیە مردوو ئاگای لە زیندوو نییە، ئیلا لەو حاڵەتانە نەبێت کە فەرموودەی پێ هاتووە.

٢- ئەو وتەیە ڕاست نییە کە دەڵێت مردوو گوێی لە هەموو قسەکانی زیندوو دەبێت.

٣- ئەگەر بڵێی هەندێک جار مردوو گوێی لە زیندوو دەبێت، ئەوا ئەو مردووە ناتوانێت وەڵامی زیندوان بداتەوە.

بەڵام بە پێچەوانە ئایا زیندوو گوێی لە مردوو دەبێت؟ زانایان دەڵێن مرۆڤ و جنۆکە گوێیان لە مردوو نابێت، زانایان دەڵێن دوو فەرموودەی جیاواز هاتوون سەبارەت بەم بابەتە:

---

[1] نور على الدرب.

١ـ له أبي سعيد الخدري دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاتێک جەنازە دادەنرێت و پیاوەکان هەڵی دەگرن بەرەو گۆڕستان ئەگەر مردووەکە باش بێت دەفەرموویێت: پەلە بکەن بۆ بەخاک سپاردنم، پەلە بکەن بۆ بەخاک سپاردنم، ئەگەر مردووەکە کەسێکی خراپ بێت دەڵێت: ئەی هاوار ئاهۆ و ناڵە بۆ کوێ دەمبەن، هەموو شتێک گوێی لە دەنگی دەبێت جگە لە مرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ گوێی لێ بوایا لەهۆش خۆی دەچوو)[1].

٢ـ فەرموودە البراء بن عازب کە بەناوبانگە دەفەرموویێت: (فریشتەیەکی کوێر و کەڕ و لاڵ قامچیەکی لە دەستە ئەگەر لە چیایەک بدات دەبێت بە خۆڵ، گورزێک لە کەسی خراپ دەدات تا دەبێت بە خۆڵ، پاشان جارێکی تر وەک خۆی لێ دێتەوە گورزێکی تری لێ دەدات قیژەیەکی لێوە دێت هەموو کەسێک دەیبیستێت جگە لە مرۆڤ و جن)[2].

مرۆڤ گوێی لە دەنگی سزادانی نابێت، ئەمەش لەبەر چەند حیکمەتێکی گەورەیە، لەوانە:

یەکەم: لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ئاماژەی بۆ کردووە نەوەک مردووەکانی خۆتان نەنێژن لە ترسان، فەرمووی: (لولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم من عذاب القبر).

دووەم: ئەمەیان شاردنەوە و داپۆشینی مردووی تێدایە.

---

(1) رواه البخاري (١٣١٤).

(2) رواه أحمد (٣٠/٥٧٨)، وصححه الألباني في (صحيح الترغيب) (٣/٢١٩).

سێیەم: نزیک و خزمەکانی ئیزعاج نابن، چونکە ئەگەر نزیکەکانی گوێیان لێ بێت سزا دەدرێت، ئەوە نارەحەت دەبن.

چوارەم: نزیکەکانی تووشی خەجاڵەت نابن، چونکە خەڵک دەڵێن: ئەمە مناڵی ئێوەیە! ئەمە باوکی ئێوەیە! ئەمە برای ئێوەیە! قسەی تری وەک ئەمانە دەکەن.

پێنجەم: ئێمە بە هیلاک دەچووین، چونکە دەنگی سزادان ئاسان نییە، بەڵکو دڵ نارەحەت دەبێت، مرۆڤ هەیە دەمرێت و هەیە لەهۆش خۆی دەچێت.

شەشەم: ئەگەر خەڵک گوێیان لە دەنگی سزادان بوایا، ئەوا ئیمان هێنان بە سزای گۆڕ لە بابی ئیمان هێنان دەبوو لە شتێکی بەرچاو و ئاشکرا، نەک لە بابی غەیب، ئەوکات مصلەحەتی تاقیکردنەوە تیادەچوو، چونکە خەڵک ئیمان بە شتێک دەهێنێت کە ببینێت و لە بەرچاوان بێت، بەڵام ئەگەر غەیب بێت، نەزانێت مەگەر بەڕێگای خەبەر، ئەوا ئەو کات لە بابی ئیمان هێنانە بە غەیب[١].

---

(١) مجموع فتاوى الشيخ العثيمين (٤٨٢/٨-٤٨٣).

**وفي الصحيح عن أنس قال: شج النبي (ﷺ) يوم أحد وكسرت رباعيته، فقال كيف يفلح قوم شجوا نبيهم؟ فنزلت:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨]

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: لە ڕۆژی ئوحود دا سەرو و ڕوخساری پێغەمبەر (ﷺ) زامدار بوو، ددانە چوارینەكانی شكێنرا، ئەویش فەرمووی: چۆن قەومێک سەرفراز دەبن کە ڕوخساری پێغەمبەرەکەیان زامدار کردووە؟ پاشان بەو هۆیەوە ئەو ئایەتە دابەزی: "ليس لك من الأمر شيء"، واتە: كاری خوا هیچی بە دەست تۆ نییە.

**ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:**

**(شج):** الشجة: برینێكە تایبەتە بە سەر و ڕوخسار.

**(وكسرت رباعيته):** دوو ددانی ناوەڕاست پێیان دەڵێن ثنایا، ئەوانەی دواتر پێی دەڵێن رباعیتین.

**(كيف يفلح قوم شجوا نبيهم):** استفهام مەبەست پێی استبعادە، واتە: دوورە قەومێک سەربكەوێ پێغەمبەری خوایان زامدار كردبێ.

**(يفلح):** فلاح سەركەوتنە بە بەدەست هێنانی داواكاری خۆی، هەروەها ڕزگاربوونە لە ترس لێكراو.

**(فنزلت:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ﴾: واتە: ئەم ئایەتە دابەزی، خطاب بۆ پێغەمبەرە (ﷺ)، (شيء) نەكیرە لە ڕستەی نەفی، بە مانای عموم دێت.

(الأمر): واتە: كاری دروستكراوەكان، كاروباری دروستكراوەكان بە دەست دروستكارە، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) هیچ بەشی تێدا نییە، ئەم ئایەتە خطاب بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) قەومێک ڕوخساریان زامدار كرد و ددانە چوارینەكانیان شكاند، لەگەڵ ئەمەش خوای گەورە

عوزری بۆ نەهێناوە بە یەک وشە: (کیف یفلح قوم شجوا نبیهم)، ئەگەر بۆ پێغەمبەر وابێت، ئەی دەبێت بۆ بێجگە لە پێغەمبەر چۆن بێت؟![١].

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەریش کاروباری دروستکراوەکانی بەدەست نییە، ئەویش بەندەیە و نابێت داوای لێ بکرێت و بپەرسترێت.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) کاروباری دروستکراوەکانی بە دەست نییە، وەک: پەیکەرەکان و پیاوچاکان و پێغەمبەران، کاروبار هەمووی تەنها بەدەست خوایە، هەروەک چۆن بە تەنها ئەو دروستکارە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کاروباری نەخستۆتە دەست کەس بێجگە لەخۆی، چونکە دروستکراو هیچی بەدەست نییە لە سوود و زیان بۆ نەفسی خۆی، ئەی چۆن دەبێتە خاوەن موڵک و سوود و زیان بۆکەسانی تر دەبێت؟! [٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مرۆڤ دەبێت زمانی خۆی بپارێزێت و بگرێتەوە لە شتێک کە لە مرۆڤدا دەیبینێت لەوەی کە تاقیکراوەتەوە بە تاوان، نابێت بەدووری بخەین لە ڕەحمی خوا، چونکە خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، ئەوانەی پێغەمبەریان بریندار کرد

---

[١] القول المفید.
[٢] القول المفید.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) بەدووری خستن لە ڕەحمی خوا لۆمەیانی کرد، پێی وترا: ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾.

وتەی: (فنزلت): فاء للسببية، لەسەر ئەمە: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەم ڕستەیە بوو: (كيف يفلح قوم شجو وجه نبيهم؟)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پووچ کردنەوەی شیرک، دروستکراوەکان ئەگەر بگەن بە پلەی بەرزیش ئەوا هەر دروستکراون، شایستەی هیچ شتێک نین لەعیبادەت، باشترینی دروستکراوەکان محمده (ﷺ) تووشی زیانیش بووە، ئەمە بەڵگەیە نابێت عیبادەتی بێجگە لەخوا بکرێت، ئەگەر بۆ پێغەمبەر بەم شێوەیە بێت ئەوا کەسانی تر لەپێشترن، نابێت عیبادەتی وەلی و پیاو چاکان بکرێت کەسانی تر لەپێشترن کە نابێت عیبادەتیان بکرێت)[2].

---

[1] القول المفيد.
[2] إعانة المستفيد (٢٨٨/١-٢٨٩).

**وفيه عن عبد الله بن عمر أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ مِنْ الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِنْ الْفَجْرِ يَقُولُ: اللَّهُمَّ الْعَنْ فُلانًا وَفُلانًا وَفُلانًا بَعْدَ مَا يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ۝١٢٨﴾ [آل عمران: ١٢٨]

واته: ابن عمر خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) سەری لە ركوع بەرز دەکردەوە، لە ڕەکاعەتی کۆتایی نوێژی بەیانی دا گوێم لێ بوو دەیفەرموو: خوایە نەفرەت بکە لە فڵان و فلان، ئەمەش لەدوای ئەوە بوو کە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد)، لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەو ئایەتی دابەزاند: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ۝١٢٨﴾

**وفي رواية: يدعوا على صفوان بن أمية، وسهل بن عمرو، والحارث بن هشام، فنزلت:** ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ۝١٢٨﴾ [آل عمران: ١٢٨]

واته: لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ دوعای دەکرد لە صفوان بن أمية و سهل بن عمرو و الحارث بن هشام، پاشان بەو هۆیەوە ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ۝١٢٨﴾.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(اللهم العن فلانا وفلانا):** اللعن: بەمانای دەرکردن و دوور خستنەوە دێت لە ڕەحمی خوای گەورە، واتە: یا الله دووریان بخەیتەوە لە ڕەحم و بەزەیی خۆت و دەریان بکەیت.

**(فلان و فلانا):** ڕیوایەتی دووەم ڕوونی کردۆتەوە: صفوان بن أمية و سهل بن عمرو و الحارث بن هشام.

**(بَعْدَ مَا يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ):** واتە: ئەمەی دەگوت دوای ئەوەی سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع و دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەریش بەندەیە و نابێت بیکەیتە شەریک لەگەڵ خوا و داوای لێ بکەیت.

### سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروست نییە نەفرەت لە کافر بکەیت بە دیارکراوی، جیاوازی هەیە لە نەفرەت کردن لە کەسێک بەوەی دیاری کەیت و نەفرەت کردن لە ئەهلی تاوان بەشێوەیەکی گشتی، یەکەمیان نەفرەت کردن بەشێوەیەک کەسەکە دیار بکەیت ئەوە ڕێگری کراوە، دووەمیان نەفرەت کردن لە ئەهلی تاوان بەشێوەیەکی گشتی ئەمەیان دروستە، ئەگەر کەسێکت بینی شتێکی داهێنا یان تاوانبارێکی حەواندەوە پێی مەڵێ: نەفرەتی خوات لێ بێت، بەڵکو بڵێ نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت تاوانبارێک دەحەوێنێتەوە یان بیدعە دادەهێنێت، بە شێوەیەکی گشتی نەفرەت بکە، بەڵگە پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە خەڵکانێکی موشریک کردووە هی سەردەمی جاهلی، بە وتەی: (اللهم العن فلانا وفلانا وفلانا)، نەهی لێی کرا بە وتەی ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ ١٢٨﴾[1]

---

[1] القول المفيد (٢٢٦/١).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە قنوت بکرێت لە نوێژی بەیانی و کاتی نەوازل، کاتێک شتێک بەسەر موسڵمانان دێت بە دەستی دوژمن، یان هاتنەدی بەڵایەکی گەورە بەسەر موسڵمانان، لەم حاڵەتە دروستە قنوت لە نوێژی بەیانی بکەیت، واتە دوعا دەکەن لە نوێژی بەیانی بۆ لاچوونی ئەو بەڵاییەی بەسەریان هاتووە، یان بەسەر برای موسڵمانیان، قنوتەکاتی نەوازل سوننەتە هەروەک لە فەرموودە هاتووە، بەڵام قنوت کردن لە نوێژی بەیانی بە بەردەوامی ئەگەر نەوازل نەبێت، ئەمە ڕێگە پێدراو نییە لای زۆربەی زانایان.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) غەیب نازانێت، ناتوانیت حوکم بدەیت بەدیار کراوی بۆ کەسێک بۆ دۆزەخ، ئیلا ئەو کەسە بێت کە خوا حوکمی لەسەر داوە لە قورئان، یان پێغەمبەر حوکمی لەسەر داوە بە ئیزنی خوای گەورە[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە قنوت دوای هەستانەوە لە ڕکوع دەخوێندرێت، بەڵام ئەگەر قنوت پێش ڕکوع بخوێندرێت ئەوا هیچی تێدا نییە.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سەبارەت بە قنوت خەڵک تێیدا دوو لایەنن و وە لایەینی مام ماوەند:

هەندێک لەوانە وای دەبینن قنوت ناکرێت ئیلا پێش ڕکوع بردن نەبێت و هەندێکی تر دەڵێن دوای ڕکوع بردن، بەڵام فوقەهاکانی ئەهلی فەرموودە وەک ئیمام ئەحمەد و کەسانی تر بۆ ئەوە چوون هەردوو حاڵەت دروستن و فەرموودەی لەسەر هاتوون، ئەگەر قنوت دوای ڕکوع هەڵبژێری باشترە، چونکە فەرموودەی زیاتری لەسەر هاتووە و گونجاو ترە، چونکە گوێ لێ بوون و قبوول بوونی دوعا گونجاوە لەبەر وتەی بەندە: (سمع الله

---

[1] إعانة المستفيد (٢٩٢/١).

لمن حمده)، سوننەتە مەدحی خوا بکەیت پێش دوعا، هەروەک چۆن فاتیحە لەسەر ئەمە بنیات نراوە، سەرەتاکەی مەدح کردنە و کۆتاییەکەی دوعایە)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (زۆربەی فەرموودەکان و زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن قنوت دوای ڕکوع دەخوێندرێت، ئەگەر قنوت پێش ڕکوع بخوێندرێت ئەوا هیچی تێدا نییە، بەئارەزووی خۆیەتی لەنێوان ئەوەی ڕکوع ببات ئەگەر قورئان خوێندنەوەی تەواو کرد، ئەگەر هەستاوە لە ڕکوع دەڵێت: (ربنا ولك الحمد)، و قنوت دەخوێنێ، هەروەها بە ئارەزووی خۆیەتی قنوت بخوێنێت ئەگەر قورئان خوێندنەوەی تەواو کرد، پاشان الله أكبر بکات و ڕکوع ببات، هەموو ئەمانە سونەت پێی هاتوون)[2].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مرۆڤ چەند گومڕا بێت و تووشی کوفر ببێت بێ ئومێد نابێت لە ڕەحمەتی خوا و هیدایەتی، ئەم سێ کەسەی موسڵمان بوون خوا لێیان ڕازی بێت، لێی وردبەوە ئێستا دوژمنایەتی گۆڕدرا بە دۆستایەتی، چونکە دڵ بەدەست خوایە، ئەگەر کارەکە بە گومانی پێغەمبەر (ﷺ) بوایا، ئەوە دەبوایا ئەوان لەسەر کوفر بمێننەوە، ئەگەر دوعای قبول ببوایا ئەوە دەردەکران لە ڕەحمەتی خوای گەورە، جگە لە سزا هیچیان بۆ نەدەما.

بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هیچی بەدەست نەبوو، کاروبار هەمووی بەدەست خوایە، لەبەر ئەوە خوای گەورە هیدایەتی ئەو قەومەی دا، بوون بە وەلی یەکانی خوا و لەسەر ئاینی پیرۆزی

---

[1] مجموعة الفتاوي (٢٣/١٠٠).

[2] الشرح الممتع (٤/٦١).

ئیسلام بەردەوام بوون، دوای ئەوەی کە دوژمنی خوا بوون، خوای گەورە منەت لەگەڵ هەر کەسێک دەکات کە بییەوێت.

بەدووری مەزانە لەم بابەتە چیرۆکی أصیرم بن عبدالأشهل الأنصاری بەناوبانگ بوو بەوە دوژمنایەتی ئیسلامی دەکرد کاتێک پێغەمبەر هات، کاتێک جەنگی ئوحد هات خوای گەورە ئیسلامی خستە ناو دڵی بێ ئەوەی پێغەمبەر بزانێت یان بێ ئەوە یەکێک لە قەومەکەی بزانێت دەرچوو بۆ جیهاد و شەهید بوو، کاتێک جەنگ تەواو بوو خەڵک لەکوژراوی خۆیان دەگەڕان، لەناکاو ئەم پیاوەیان بینی، وتیان: ئەی فلانە کەس چی وای لەتۆ کردووە بێیت بۆ ئێرە؟ خزمایەتی و قەوم وای لەتۆ کردووە، یان ئارەزووی ئیسلام؟ فەرمووی: ئارەزووی ئیسلام، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە ئیلا (الله) نەبێت، و محمدیش نێردراوی خوایە، خەبەری من بدەن بە پێغەمبەری خوا، خەبەریان پێدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەو بۆ بەهەشتە"، ئەم پیاوە یەک ڕەکاعەت نوێژیشی بۆ خوا نەکرد، لەگەڵ ئەمەش خوای گەورە بە ئەهلی بەهەشتی دانا، خوای گەورە حەکیمە و هیدایەتی کەسێک دەدات بییەوێت لەبەر حیکمەتی خۆی، وە کەسێک گومڕا دەکات بییەوێت لەبەر حیکمەتی خۆی، ئەوەی گرینگ بێت ئێمە هیچ مرۆڤێک بە دووری ناخەین و دەری ناکەین لە ڕەحمی خوا[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (کاتێک خەڵک هەڵگەڕانەوە دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ)، سوهەیلی کوڕی عەمر وتاری بۆ خەڵکی مەککە دەدا و لەسەر ئیسلام جێگری کردن، پێیانیانی فەرموو: ئەی ئەهلی مەککە لەو کەسانە مەبن کە کۆتا کەس بن بۆ موسڵمان بوون و یەکەم کەسیش مەبن بۆ پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، خەڵکی مەککە

[1] القول المفید.

لەسەر ئیسلام جێگیر بوون، پاشگەز نەبوونەوە بەهۆی ئەم پیاوە کە خوای گەورە خێر و بەرەکەتێکی زۆری خستە ئەم پیاوەوە.

ئەمە بەڵگەیە مرۆڤ چەند گومڕا بێت و تووشی کوفر ببێت، ئەوا بێ ئومێد نابێت لەڕەحمی خوای گەورە و هیدایەت دانی، چونکە دڵەکان بەدەستی خوای گەورەن)[1].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەر بەندەیە و سوود و زیانی بەدەست نییە، نابێت بپەرسترێت، بەڵگەیە نابێت عیبادەتی بێجگە لەخوا بکەیت.

---

[1] إعانة المستفيد.

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ) قَالَ: (يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ - أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا - اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی لە سورەتی شوعەرا کە دەفەرموویێت: (ئینزاری قەومە نزیکەکەی خۆت بکە)، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا وەک وتار خوێن فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی قورەیش خۆتان بکڕنەوە بە "ئیمان هێنان" من ناتوانم هیچ سوودێکتان پێ بگەیەنم بەرامبەر خوا، ئەی عباس بن عبدالمطلب من ناتوانم هیچ سوودێکت پێ بگەیەنم بەرامبەر خوا، ئەی صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا، ناتوانم هیچ سوودێکت پێ بگەیەنم بەرامبەر خوا، ئەی فاتیمەی کچی محمد (ﷺ) چیت دەوێ لە ماڵ و سامان لێم داوا بکە، من ناتوانم هیچ سوودێکت پێ بگەیەنم بەرامبەر خوا).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(قام):** واتە: هەستا وەک وتار خوێن.

**(اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا):** واتە: خۆتان بكڕنەوە بە "ئیمان هێنان" من ناتوانم هیچ سوودێكتان پێ بگەیەنم بەرامبەر خوا.

**(وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا):** واتە: ئەی فاتیمەی كچی محمد چیت دەوێ لە ماڵ و سامان لێم داوا بكە، من ناتوانم هیچ سوودێكت پێ بگەیەنم بەرامبەر خوا.

ئەگەر وترا: چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (عبدالمطلب)، لەگەڵ ئەمە دروست نییە عبد زیاد بكرێ مەگەر بۆ خوا؟

وەڵام: ئەمە ناو لێنان نییە، بەڵكو ئەمە وەك خەبەرە، ناوی (عبدالمطلب)ە، پێغەمبەر ئەم ناوەی لێ نەناوە، بەڵكو بەو ناوە بەناوبانگ بووە، لەبەر ئەوە خۆی داوەتە پاڵی، فەرمووی:

أنا النبي لا كذب        أنا ابن عبدالمطلب

گریمان وا دابنێ باوكت ناوی (عبدالمطلب)ە یان (عبدالعزى)یە، وە تۆ دەدرێیتە پاڵی، ئەمە نابێتە بەڵگە كە تۆ بەمە ڕازی، بەڵكو خەبەرێكە لە واقع، هەروەك ئەوە وایە بڵێیت فلانە كەس كوفری كرد و فلانە كەس دووڕوویی كرد، نموونەی تری وەك ئەمانە.

ئەگەر نزیكی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ سوودی نەبێت بۆ خزمەكانی، بەڵگەیە دروست نییە تەوەسل بە جاهی پێغەمبەر بكەیت، چونكە جاهی پێغەمبەر هیچ سوودی نییە ئیلا پێغەمبەر نەبێت، لەبەر ئەوە ڕاسترین وتەی زانایان ئەوەیە تەوەسول بە جاهی پێغەمبەر حەڕامە[1].

## هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

---

[1] القول المفيد.

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) ناتوانێ هیچ سوود و زیانێک بە کەس بگەیەنێت، کەواتە نابێت پشت بە پێغەمبەر ببەستیت و داوای لێ بکەیت، ئەی چۆن دەبێت لە کەسانی تر بکەیت.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەسەب هیچ سوودی بۆ کەس نییە، ئەگەر سوودی بۆ کەسێک هەبوایا ئەوا سوودی بۆ ئەمانە دەبوو: عبدالمطلب و صفیە و فاطمە، نابێت پشت بە پیاوچاکان ببەستیت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە نابێتە بەڵگە ناتوانێت شەفاعەت بکات، چونکە چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا هاتوون بۆ شەفاعەت.

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (وتەی: (لا أغني شيئا)، ئیلا ئەوە نەبێت خوای گەورە ئیزنی داوە بە شەفاعەت کردن)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە بۆ ئینزاردان لە نزیکەکانی خۆت دەست پێ بکەیت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە خزمە نزیکەکانی دەست پێ کرد[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە دەست پێشخەری بکەیت لە جێ بەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە[٣].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پەلە کردن لە جێ بەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە.

---

[١] فتح الباري (٥٠٢/٨).
[٢] إعانة المستفيد (٣٠٣/١).
[٣] إعانة المستفيد (٣٠٣/١).

## باب قول الله تعالى:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٢٣﴾ [سبأ: ٢٣]

**وفي (الصحيح) عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي (ﷺ) قال: (إذا قضى الله الأمر في السماء ضربت الملائكة بأجنحتها خضعانا لقوله، كأنه سلسلة على صفوان ينفذهم ذلك. حتى إذا فزع عن قلوبهم قالوا: ماذا قال ربكم؟ قالوا: الحق وهو العلي الكبير فيسمعها مسترق السمع ـ ومسترق السمع هكذا بعضه فوق بعض ـ وصفه سفيان بكفه فحرفها وبدد بين أصابعه ـ فيسمع الكلمة فيلقيها إلى من تحته، ثم يلقيها الآخر إلى من تحته، حتى يلقيها عن لسان الساحر أو الكاهن فربما أدركه الشهاب قبل أن يلقيها، وربما ألقاها قبل أن يدركه، فيكذب معها مائة كذبة فيقال: أليس قد قال لنا يوم كذا وكذا: كذا وكذا فيصدق بتلك الكلمة التي سمعت من السماء)[1].**

**وعن النواس بن سمعان رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (إذا أراد الله تعالى أن يوحي بالأمر تكلم بالوحي أخذت السماوات منه رجفة ـ أو قال رعدة ـ شديدة خوفاً من الله عز وجل. فإذا سمع ذلك أهل السماوات صعقوا وخروا سجدا. فيكون أول من يرفع رأسه جبريل، فيكلمه الله من وحيه بما أراد، ثم يمر جبريل على الملائكة، كلما مر**

---

[1] أخرجه البخاري (٤٨٠٠، ٤٧٠١).

**بسماء سأله ملائكتها: ماذا قال ربنا يا جبريل؟ فيقول جبريل: قال الحق وهو العلي الكبير فيقولون كلهم مثل ما قال جبريل. فينتهي جبريل بالوحي إلى حيث أمره الله)**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الآية.

**الثانية:** ما فيها من الحجة على إبطال الشرك، خصوصا من تعلق على الصالحين، وهي الآية التي قيل: إنها تقطع عروق شجرة الشرك من القلب.

**الثالثة:** تفسير قوله: ﴿قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٢٣﴾

**الرابعة:** سبب سؤالهم عن ذلك.

**الخامسة:** أن جبريل هو الذي يجيبهم بعد ذلك بقوله: (قال كذا وكذا).

**السادسة:** ذكر أن أول من يرفع رأسه جبريل.

**السابعة:** أن يقول لأهل السماوات كلهم، لأنهم يسألونه.

**الثامنة:** أن الغشي يعم أهل السماوات كلهم.

**التاسعة:** ارتجاف السماوات لكلام الله.

---

[1] أخرجه البيهقي في "الأسماء والصفات" (٤٦٣/١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٢٧/١ رقم ٥١٥)، وأبو الشيخ في "العظمة" (٥٠١/٢ رقم ٤٦)، وابن خزيمة في "التوحيد" (١٩٧)، وضعفه الألباني في "تخريج السنة" لابن أبي عاصم (٢٢٧/١).

**العاشرة:** أن جبريل هو الذي ينتهي بالوحي إلى حيث أمره الله. الحادية عشرة: ذكر استراق الشياطين.

**الثانية عشرة:** صفة ركوب بعضهم بعضا.

**الثالثة عشرة:** إرسال الشهب .

**الرابعة عشرة:** أنه تارة يدركه الشهاب قبل أن يلقيها، وتارة يلقيها في أذن وليه من الإنس قبل أن يدركه.

**الخامسة عشرة:** كون الكاهن يصدق بعض الأحيان.

**السادسة عشرة:** كونه يكذب معها مائة كذبة. السابعة عشرة: أنه لم يصدق كذبه إلا بتلك الكلمة التي سمعت من السماء.

**الثامنة عشرة:** قبول النفوس للباطل، كيف يتعلقون بواحدة ولا يعتبرون بمائة؟!.

**التاسعة عشرة:** كونهم يلقي بعضهم إلى بعض تلك الكلمة ويحفظونها ويستدلون بها.

**العشرون:** إثبات الصفات خلافا للأشعرية المعطلة.

**الحادية والعشرون:** التصريح بأن تلك الرجفة والغشي كانا خوفا من الله عز وجل.

**الثانية والعشرون:** أنهم يخرون لله سجدا.

## باب قول الله تعالى:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴿٢٣﴾﴾ [سبأ: ٢٣]

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت: (کاتێ ترسەکە لە دڵی فریشتەکاندا لادرا، ئەو کات بە یەکتری دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرموو: واتە چ فەرمانێکی داوە و چ قەدەرێکی بڕیار داوە، هەر فریشتەکان لەنێوان خۆیان گوتیان: پەروەردگارمان حەقی وتووە و ئەو لە هەموو شتێ بەرزترە و لەهەموو شتێ گەورەترە).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ﴾: واتە: کاتێ ترسەکە لە دڵی فریشتەکاندا لادرا.

﴿قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾: واتە: ئەو کات بە یەکتری دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرموو، واتە چ فەرمانێکی داوە و چ قەدەرێکی بڕیار داوە.

﴿قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾: واتە: هەر فریشتەکان لەنێوان خۆیان گوتیان پەروەردگارمان حەقی وتووە و ئەو لە هەموو شتێ بەرزترە و لەهەموو شتێ گەورەترە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەم بابە باسی ڕوونکردنەوەی بەڵگەکان دەکات لەسەر پووچیێتی شەریک دانان بۆ خوا و پەرستنی بێجگە لەخوا.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (هۆکاری بوونی ئەم بابە لە کتابی تەوحید هەروەک پێشتر باسمان کرد، بەڵگەیە ئەوەی شایستەی عیبادەت بێت خوایەی گەورەیە، چونکە هەمیشە وەسف کراوە بە سیفەتی تەواو)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسەبەی ئەم ئایەتە لە کتابی تەوحید: ئەگەر خوای گەورە بەتەنیا بێت لە بەرزی و گەورەیی، دەبێت بەتەنیا بێت لە عیبادەتیش)[٢].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە پووچیێتی عیبادەت کردنی فریشتەکان ڕوون دەکاتەوە، چونکە فریشتەش پەرستراون واتە "مرۆڤ فریشتەشی پەرستووە"، ئەم بابە تەواوکەری بابی پێشووە، کە بابی پێشوو ڕوونی کردۆتەوە عیبادەتی بێجگە لەخوا پووچە و حەرامە، جا چ پێغەمبەران یا وەلی یا پیاوچاک یا فریشتەکان بن، چونکە ئەگەر دروست نەبێت عیبادەتی ئەمانە بکەیت، عیبادەتی کەسانی تر لەپێشترە دروست نەبێت، ئەگەر دروست نەبێت عیبادەتی فریشتە بکەیت کە بەهێزترین دروستکراوی خوان و نزیکترینیانن لە خوا، ئەوا عیبادەتی کەسانی تر لە جن و مرۆڤ لەپێشترە دروست نەبێت، ئەمە تێگەیشتنی ئەم بابەیە)[٣].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- جێگیرکردنی کەلام بۆ خوای گەورە، قسە دەکات بە دەنگی بیستراو فریشتەکان گوێیان لێ دەبێت، لەبەر وتەی: ﴿حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٢٠١).
[٢] القول المفيد.
[٣] إعانة المستفيد (٣٠٥/١).

**٢-** گەورەیی کەلامی خوای گەورە، چونکە ئاسمانەکان و ئەهلەکەی دەلەرزن و لەهۆش خۆیان دەچن و دەبوورێنەوە.

**٣-** وتەکانی خوای گەورە هەمووی حەقن، لەبەر وتەی: ﴿قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾.

**٤-** جێگیرکردنی پەروەردگاریەتی تایبەتی خوا بۆ وەلی یەکانی، پەروەردگاریەتی گشتی خوا بۆ هەموو دروستکراوەکان، لەبەر وتەی: ﴿مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾.

**٥-** تووندی ترسی فریشتەکان لەخوای گەورە و بیستنی وتەی خوا و تێگەیشتنیان و قسەکردنیان.

**٦-** جێگیرکردنی ناوی (العلي) و سیفەتی بەرزی زات و سیفەتی، لەبەر وتەی: ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ﴾.

**٧-** جێگیرکردنی ناوی (الكبير) و گەورەیی زات و سیفەتی، لەبەر وتەی: ﴿الْكَبِيرُ﴾.

**٨-** فریشتەکان دڵیان هەیە و فریشتەکان لاشەن نەک تەنها ڕوحن و عەقڵیان هەیە، پێچەوانەی وتەی ئەوانەی دەڵێن عەقڵیان نییە.

**وفي (الصحيح) عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي (ﷺ) قال: (إذا قضى الله الأمر في السماء ضربت الملائكة بأجنحتها خضعانا لقوله، كأنه سلسلة على صفوان ينفذهم ذلك. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾ [سبأ: ٢٣]، فيسمعها مسترق السمع ـ ومسترق السمع هكذا بعضه فوق بعض ـ ووصفه سفيان بكفه فحرفها وبدد بين أصابعه ـ فيسمع الكلمة فيلقيها إلى من تحته، ثم يلقيها الآخر إلى من تحته، حتى يلقيها عن لسان الساحر أو الكاهن فربما أدركه الشهاب قبل أن يلقيها، وربما ألقاها قبل أن يدركه، فيكذب معها مائة كذبة فيقال: أليس قد قال لنا يوم كذا وكذا: كذا وكذا فيصدق بتلك الكلمة التي سمعت من السماء)[1].**

واته: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاتێک خوای گەورە ئەمرێکی فەرموو لە ئاسمانەکان، فریشتەکان باڵەکانیان دەدەن بەیەکدا بۆ دەربڕینی ملکەچییان بۆ وتەکەی خودا، ترسەکەیان لە دەنگی فەرمایشتەکەی خوادا وەک ترسی کەسێکە لە زنجیرێک کە بەسەر تاشەبەردێکی سافدا کێش بکرێت، ئەو دەنگە کار دەکاتە سەر دڵی فریشتەکان و لە ترسا لەهۆش خۆیان دەچن، هەتا ئەو ترسە لەسەریان لادەبردرێت، ئەو کاتە لەناو خۆیان دا لە یەکتر دەپرسن، پەروەردگارتان چی فەرموو؟

هەر فریشتەکان لەنێوان خۆیان گوتیان: پەروەردگارمان حەقی وتووە و ئەو لە هەموو شتێ بەرزترە و لەهەموو شتێ گەورەترە.

ئەوجا "ئەو جنۆکەیە" فڕێنەری وتە بیسراوەکەیە، گوێ بیستی وتەی فریشتەکان دەبێت، فڕێنەری وتە بیسراوەکە ئاوایە، ئینجا سوفیانی کوڕی عویەینە بە لەپی دەستی وەسفی کردن کە چۆن دەچنە سەر یەکتر، پەنجەکانی بڵاودەکردەوە و دەستەکانی لەسەر یەکتر دادەنا، ئەوەی سەرەوە کە گوێی لە کەلیمە دەبێت، دەیدات بە گوێی ئەوەی ژێر خۆیدا،

---

[1] أخرجه البخاري (٤٨٠٠، ٤٧٠١).

ئینجا ئەویش دەیدات بە ئەوی ژێر خۆی هەتا دەیخەنە سەر زمانی ساحیرێ یان فاڵگرەوەیەک، جا لەوانەیە پێش ئەوەی بیگەیەنێت نەیزەکی لێی بدات، وە یان ئەگەری ئەوە هەیە بیگەیەنێتە جێ پێش ئەوەی لێی بدات، ئەوەی سەر زەویش سەد درۆی پێوە دەکات.

پاشان خەڵکی دەڵێن: ئەرێ فلانە ڕۆژ ساحیرەکە ئاواو ئاوای نەگوت "ڕێک واش دەرچوو" جا بەهۆی ئەو کەلیمەوە کە لە ئاسمان واتە: "ئاسمانی دونیا" لەدەمی فریشتەکانەوە بیستراوە، کەسانێک باوەڕ بە ساحیر و کاهینەکان دەکەن درۆکانیشی بە ڕاست دەزانن).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(إِذَا قَضَى اللَّهُ الْأَمْرَ فِي السَّمَاءِ):** واتە: کاتێک خوای گەورە ئەمرێکی فەرموو لە ئاسمانەکان.

**(ضَرَبَتْ الْمَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ):** واتە: فریشتەکان باڵەکانیان دەدەن بەیەکدا بۆ دەربڕینی ملکەچییان بۆ وتەکەی خودا.

**(صفوان):** واتە: بەردێکی لوس.

**(مسترق السمع):** واتە: ئەو جنۆکەیە فڕێنەری وتە بیسراوەکەیە، گوێ بیستی وتەی فریشتەکان دەبێت.

**(وَمُسْتَرِقُ السَّمْعِ هَكَذَا بَعْضُهُ فَوْقَ بَعْضٍ):** واتە: لەوانەیە ئەمە وتەی پێغەمبەر بێت (ﷺ) و لەوانەشە وتەی ئەبو هورەیرە بێت، وە لەوانەشە وتەی سوفیان بێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە فریشتەکان لەخوا دەترسن و عیبادەتی خوا دەکەن، کەواتە نابێت داوایان لێ بکەیت.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فریشتەکان باڵیان هەیە و بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی ناو و سیفەت بۆ خوای گەورە، وەک بەرزی بەسەر دروستکراوەکانی و قسەکردن لەگەڵ مخلوقات.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فریشتەکان لەخوای گەورە دەترسن، ئەوانیش بەندەی خوان و لاوازن بەرامبەر بە خوا، کەواتە نابێت بیبانپەرستی، ئەگەر دروست نەبێت فریشتە بپەرستی ئەی چۆن دەبێت کەسانی تر بپەرستی؟!.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فەرموودە تەفسیرە بۆ قورئان، سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) تەفسیرە بۆ قورئان، ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتەی تەفسیر کردووە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾، وەلامە بۆ ئەو کۆمەڵە پیسەی سوننەت ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن تەنها قورئان، ئەگەر بڵێی تەنها قورئان ئەی چۆن قورئان تەفسیر بکەین؟ قورئان تەفسیر دەکرێت بە یەکێک لەم چوارانە:

یەکەم: قورئان بە قورئان تەفسیر دەکرێت.

دووەم: ئەگەر تەفسیری قورئان بە قورئان نەبوو، ئەوا تەفسیر دەکرێ بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

سێیەم: ئەگەر تەفسیری نەبوو لە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوا تەفسیر دەکرێ بە وتەی صحابی، چونکە قوتابی پێغەمبەرن، لە پێغەمبەرەوە فێربوونە و شتیان وەرگرتووە، ئەوان باشترینی خەڵک بوون لە دەست گرتن بە سوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

چوارەم: ئەگەر تەفسیری صحابی نەبوو، ئەوا تەفسیر دەکرێ بە زمان، سەیری مانای وشەکە دەکەیت لە زمانی عەرەب، تەفسیر دەکرێ بە زمانی عەرەبی ئەو زمانەی قورئان پێی دابەزیوە.

تەفسیر کردنی قورئان بە بێجگە لەم ڕێگایانە باطلە، یان بە قورئان دەکرێ یان بە سونەت یان بە وتەی صحابی، یان بە زمانی عەرەبی ئەو زمانەی قورئانی پێ دابەزیوە، قورئان تەفسیر ناکرێت بە بێجگە لەم ڕووانە.

بەڵێ جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە وتەی تابعی ئایا قورئانی پێ تەفسیر دەکرێت یان نا؟ هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون قورئان بە وتەی تابعیش تەفسیر دەکرێ، چونکە تابعی تایبەتمەندی خۆیان هەیە، چونکە تابعی قوتابی صحابی یە تایبەتمەندییەکی هەیە لەگەڵ کەسێکی تر قوتابی بێجگە لە صحابی بێت[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە فڕێنەری وتە بیسراوەکە بوونیان هەیە (واتە: مسترق السمع)، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان ئایا فڕێنەری وتەی بیسراو قطع بووینە "واتە: مەنع کراون" دوای هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) هەتا هەتایی، یان قطع بووینە تەنها لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)؟ وتەی دووەم نزیکترە، تەنها لە کاتی وەحی قطع بوون، هەتا وتەی کاهینەکان تێکەڵ بە

---

[1] إعانة المستفيد (٣١٢/١-٣١٣).

وەحی نەبێت، پاشان دوای ئەمە سەبەبەکە لاچوو کە فرێنەری هەواڵ دابڕدرابوون لە پێناوی[١].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کاهینەکان درۆزنترینی خەڵکن، چونکە سەد درۆ دەکەن لەگەڵ یەک ڕاستی هەتا خەڵک گومڕا بکەن.

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ زۆری ژمارەی جنۆکەکان، چونکە دەچنە سەر یەکتر بۆ ئاسمان، مانای ئەوە دەگەیەنێت ئەوان زۆرن، لاشەیان خەفیفە و دەفڕن[٢].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەفس حەز لە شتی پووچ و درۆ دەکات، چۆن دڵیان دەبەستنەوە بە یەک وتەی ڕاست و لە سەد درۆ پەند وەرناگرن؟!

---

[١] القول المفيد.

[٢] القول المفيد.

**وعن النواس بن سمعان رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (إذا أراد الله تعالى أن يوحي بالأمر تكلم بالوحي أخذت السماوات منه رجفة ـ أو قال رعدة ـ شديدة خوفا من الله عز وجل. فإذا سمع ذلك أهل السماوات صعقوا وخروا سجدا. فيكون أول من يرفع رأسه جبريل، فيكلمه الله من وحيه بما أراد، ثم يمر جبريل على الملائكة، كلما مر بسماء سأله ملائكتها: ماذا قال ربنا يا جبريل؟ فيقول جبريل: قال الحق وهو العلي الكبير فيقولون كلهم مثل ما قال جبريل. فينتهي جبريل بالوحي إلى حيث أمره الله عزوجل) .**

واتە: نەواسی کوڕی سمعان خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: (ﷺ) فەرمووی: (کاتێ خوا ویستی وەحی بنێرێت بە هەر فەرمانێک ئەوا قسە دەکات بە وەحی، ئاسمانەکان لە ترسی خوای گەورە لەرزینێکی توند دەیانگرێت، جا کاتێک خەڵکی ئاسمانەکان گوێیان لە وتەی خوای گەورە دەبێت، لەهۆش خۆیان دەچن، پاش ئەوەی کە بەئاگا دێنەوە دەڕۆنە سوجدەوە سەر بەرز ناکەنەوە، هەتا یەکەمیان کە سەری بەرز دەکاتەوە لە سوجدە جبریل دەبێت، ئەوجا خوا قسەی لەگەڵ دەکات بە وەحی، بە هەر چییەک کە خۆی بییەوێت پاشان جبریل بەلای فریشتەکان دا تێپەڕ دەبێت، هەر جارێ کە تێپەڕ دەبێ بە ئاسمانێکدا فریشتەکانی ئەو ئاسمانە پرسیاری لێ دەکەن، ئەی جبریل پەروەردگارمان چی وت و چ ئەمرێکی داوە؟

جبریلیش وتەکەی خوایان بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێت: پەروەردگارمان حەقی وت و ئەو لەهەموو شتێ بەرزترە، ئەو لەهەموو شتێ گەورەترە، ئەوجا فریشتەکان هەموویان وەک جبریل چی گوت ئەوانیش دەیڵێنەوە، ئینجا جبریل وەحیەکە دەگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە خوای گەورە فەرمانی پێداوە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(تكلم بالوحي):** واتە: قسە دەکات بە وەحی.

**(أخذت السمـاوات منه رجفة):** واته: ئاسمانه‌كان له‌ ترسی خوای گه‌وره‌ له‌رزینێكی توند ده‌یانگرێت.

**(صعقوا وخروا سجدا):** واته: له‌هۆش خۆیان ده‌چن، پاش ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ئاگا دێنه‌وه‌ ده‌ڕۆنه‌ سوجده‌وه‌.

### هۆكاری باسكردنی ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ له‌م بابه‌:

قه‌رعاوی ده‌فه‌رموویێت: (فه‌رمووده‌كه‌ به‌ڵگه‌یه‌ فریشته‌كان گه‌وره‌ترین مخلوقاتن له‌ خوا ده‌ترسن، له‌به‌ر ئه‌وه‌ عیباده‌ت كردنی كه‌سانی تر باطله‌)[١].

### سووده‌كانی فه‌رمووده‌كه‌:

**١-** ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ به‌ڵگه‌یه‌ ئاسمانه‌كان حه‌وت چینن، له‌ هه‌موو ئاسمانێک فریشته‌ لێی نیشته‌جێن، ئاوه‌دانی ده‌كه‌ن به‌ عیباده‌تی خوای گه‌وره‌ و ته‌سبیح و لا إله إلا الله و به‌گه‌وره‌ دانانی خوای گه‌وره‌[٢].

**٢-** ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ به‌ڵگه‌یه‌ فریشته‌كان غه‌یب نازانن، پرسیاریان كرد له‌و شته‌ی لێیان بزر بوو[٣].

---

[١] الجديد ١٥٣ .

[٢] إعانة المستفيد (٣٢٣/١-٣٢٤).

[٣] إعانة المستفيد (٣٢٤/١).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزلی جبریل (علیه السلام)، وەحی پێی سپێردراوە و فریشتەكان هەموو پرسیاری لێ دەكەن، خوای ئێمە چی گوت؟ ئەمە بەڵگەیە لەسەر فەزل و پلە و پایەی جبریل لای خوای گەورە[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی وتەی خوای گەورە و گەورەیی قورئان، چونكە وتەی خوای گەورەیە، وە وەحی یە لە لایەن خواوە، دەبێت بەگەورەی دابنێیت، وتەی خوای گەورە دەبێت بەگەورە دابنرێت و ڕێزی لێ بگیرێت و هەیبەتی خۆی هەبێت، وەک وتەی دروستكراوان نییە، هەروەها وتەی پێغەمبەریش دەبێت بەگەورە دابنرێت، چونكە وەحیە لەلایەن خواوە[٢].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فریشتەكان بەندەن و زۆر لاوازن بەرامبەر بە خوای گەورە، نابێت عیبادەتیان بۆ بكەیت، ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ موشریكەكان ئەوانەی فریشتەكان دەپەرستن، دەڵێن فریشتەكان لەخوا نزیكت دەكەنەوە، هەروەک چۆن نزیكەكانی مەلیک دەستیان دەڕوات و پێویستی یەكانی خەڵک دەگەینن بەمەلیک، خالق قیاس دەكەن لەسەر دروستكراوەكان.)[٣].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستكراوەكان ئەگەر چی ڕوحیشیان نەبێت هەست بە گەورەیی خوا دەكەن[٤].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیركردنی سیفەتی ئیرادە بۆ خوای گەورە.

---

[١] إعانة المستفيد (٣٢٣/١).

[٢] إعانة المستفيد (٣٢٣/١).

[٣] إعانة المستفيد (٣٢٢/١-٣٢٣).

[٤] القول المفيد.

## باب الشفاعة

وقول الله تعالى: ﴿وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ [الأنعام: ٥١]

وقوله: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا﴾ [الزمر: ٤٤]

وقوله: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ [البقرة: ٢٥٥]

وقوله: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾ [النجم: ٢٦]

وقوله: ﴿قُلِ ٱدْعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [سبأ: ٢٢-٢٣]

**قال أبو العباس: نفى الله عما سواه كل ما يتعلق به المشركون، فنفى أن يكون لغيره ملك أو قسط منه، أو يكون عونا لله، ولم يبق إلا الشفاعة، فبين أنها لا تنفع إلا لمن أذن له الرب، كما قال تعالى: ﴿ولا يشفعون إلا لمن ارتضى﴾ فهذه الشفاعة التي يظنها المشركون، هي منتفية يوم القيامة كما نفاها القرآن، وأخبر النبي ﷺ أنه يأتي فيسجد لربه ويحمده، لا يبدأ بالشفاعة أولا، ثم يقال له: ارفع رأسك، وقل يسمع، وسل تعط، واشفع تشفع[1].**

---

[1] أخرجه البخاري (٣٣٤٠)، ومسلم (١٩٤) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

**وقال له أبو هريرة: من أسعد الناس بشفاعتك يا رسول الله؟ قال: (من قال لا إله إلا الله خالصا من قلبه)[١].**

**فتلك الشفاعة لأهل الإخلاص بإذن الله، ولا تكون لمن أشرك بالله.**

**وحقيقته: أن الله سبحانه هو الذي يتفضل على أهل الإخلاص فيغفر لهم بواسطة دعاء من أذن له أن يشفع، ليكرمه وينال المقام المحمود. فالشفاعة التي نفاها القرآن ما كان فيها شرك، ولهذا أثبت الشفاعة بإذنه في مواضع، وقد بين النبي صلى الله عليه وسلم أنها لا تكون إلا لأهل التوحيد والإخلاص. انتهى كلامه[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الآيات.

**الثانية:** صفة الشفاعة المنفية.

**الثالثة:** صفة الشفاعة المثبتة. الرابعة: ذكر الشفاعة الكبرى، وهي المقام المحمود.

**الخامسة:** صفة ما يفعله صلى الله عليه وسلم، وأنه لا يبدأ بالشفاعة أولا، بل يسجد، فإذا أذن الله له شفع.

**السادسة:** من أسعد الناس بها؟.

**السابعة:** أنها لا تكون لمن أشرك بالله.

**الثامنة:** بيان حقيقتها.

---

[١] أخرجه البخاري (٦٥٧٠).

[٢] مجموع الفتاوى (٧/٧٧-٧٨).

# باب الشفاعة

## باسی شەفاعەت کردن

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب باسی شەفاعەتی کردووە لە کتاب التوحيد، چونکە موشریکەکان ئەوانەی پەیکەریان دەپەرست دەیان گوت: ئەمانە لای خوای گەورە شەفاعەتمان بۆ دەکەن، ئەوان موشریک بوون بە خوا لە دوعا و هاوارکردن لە کاتی تەنگانە و شتی تری وەک ئەمانە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (شەفاعەت دوعایە، داواکردنی شەفاعەت داواکردنی دوعایە، ئەگەر بڵێت: (أستشفع برسول الله)، وەک ئەوە وایە بڵێت: داوا لە پێغەمبەر دەکەم دوعام بۆ بکات لای خوا گەورە، کەواتە شەفاعەت داوا کردنە.

واتە: ئەگەر یەکێک بچێتە لای گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ)، یان گۆڕی پیاو چاکێک، یان گۆڕی کەسانی تری وەک ئەمانە و بڵێت: (أستشفع بك، یان أسال الشفاعة)، ماناکەی ئەوەیە داوای لێکردوە دوعای بۆ بکات، چونکە داوای لە بێجگە لەخوا کردووە و ڕووی کردۆتە بێجگە لەخوا کە ئەمەش شیرکە و داوا کردنە لە بێجگە لەخوا، داواکردنە لەم مردووە و وە ڕووی کردۆتە ئەم مردووە بە داواکردن و دوعا.

ئەگەر مانای شەفاعەت و حوکمی داواکردنت زانی لە مردووەکان کە شیرکی گەورەیە، بزانە زیندووەکان ئەوانەی لەم دونیایەدان دروستە داوای شەفاعەتیان لێ بکەیت، واتە: دروستە داوایان لێ بکەیت، هەندێک جار وەڵامی داوایان دەدرێتەوە و هەندێک جاریش وەڵامیان نادرێتەوە، ئەمەش دیارە لە شەفاعەتی هەندێک خەڵک بۆ هەندێک خەڵکی تر لە شەفاعەتی باش یان شەفاعەتی خراپ بۆ یەکتر کردن، هەروەک خوای گەورە

---

[1] القول المفيد (٤٢٢/١-٤٢٣).

دەفەرموویێت: ﴿مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةً﴾ [النساء: ٨٥]، هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً﴾ [النساء: ٨٥]

بابەتی شەفاعەت یەکێکە لەو بابەتانەی شاراوە بووە لای زۆر لە زانایان، لەبەر ئەوە هەندێک هەڵە دەبینیت لە بابەتی داواکردنی شەفاعەت لە پێغەمبەر (ﷺ)، هەندێ زانا چەند چیرۆکێکیان باسکردووە لە کتابەکانی خۆیان داوای شەفاعەتیان لە پێغەمبەر کردووە بێ ئەوەی ئینکاری بکەن، هەروەک ئیمام النووی ئەمەی کردووە لە کتابی الأذکار لاپەڕە ١٦٠، وە ابن قدامە لە المغني (٢٩٨/٢)، وە کەسانی تریش بێجگە لە ئەمانە.

ئەمە نابێتە خیلاف لەم بابەتە، چونکە ئەم خیلافە دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە حەقیقەتی ئەم بابەتە، بابەتی شەفاعەت یەکێکە لەو بابەتانە هەندێک شاراوەیە، لەبەر ئەوە هەندێک لە ئەهلی عیلم دەڵێن: إقامة الحجة لە بابەتەکانی تەوحید جیاوازن بەگوێرەی بەهێزی شوبهەکانیان)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (شەفاعەت ماناکەی: واستە کردن و داوا کردنە لە کەسێک بۆ شتێک پێویستی پێیەتی، پێی دەڵێن شەفاعەت چونکە سەرەتا کەسەکە خۆی بە تەنیا بووە، کاتێک داوای لە کەسێک کرد بۆ حاجەتێک، ئەو کات بوون بە دوو کەس، چونکە دوو کەسن لە داواکردن دا)[2].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٠٦-٢٠٨).

[2] إعانة المستفيد (٣٢٥/١).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ۝٥١﴾ [الأنعام: ٥١]

واته: خوای گەورە دەفەرمووێت: (بەم قورئانە ئینزاری ئەوانە بکە کە دەترسن حەشر بکرێن و کۆبکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، کە لەو ڕۆژەدا هیچ کەس نییە دۆست و تکاکاریان بێت مەگەر بە ئیزنی خوا، ئەو ئینزارەش بۆ ئەوەیە لەم دونیایەدا کارێک بکەن کە لە سزای خوا ڕزگاریان بکات).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَأَنْذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْ يُحْشَرُوا إِلَى رَبِّهِمْ﴾: واتە: بەم قورئانە ئینزاری ئەوانە بکە کە دەترسێن حەشر بکرێن و کۆبکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان.

﴿لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾: واتە: هیچ کەس نییە دۆست و تکاکاریان بێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە هیچ کەس ناتوانێت شەفاعەت بکات بەبێ ئیزنی خوا.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە کەس ناتوانێت شەفاعەت بکات بێ ئیزنی خوا، لەم ئایەتە نەفی شەفاعەتی کردووە لە بێجگە لە خوا، واتە: بێ ئیزنی خوای گەورە، ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت شەفاعەت هەیە بە ئیزنی خوای گەورە ئەمە مەبەستی دانەری کتابە، شەفاعەت لە بێجگە لەخوا مەحاڵە و شەفاعەت بە ئیزنی دەکرێت، بەڵام لای مەلیکەکانی دونیا

دروستە بە ئیزن و بێ ئیزن، دەکرێ کەسێک نزیک بێت لە کاربەدەست شەفاعەت بکات بێ ئەوەی ئیزن وەربگرێت[1].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ترساندنی خەڵک بە قورئان.

---

[1] القول المفيد.

**وقوله:** ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًاۖ﴾ [الزمر: ٤٤]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (ئەی پێغەمبەر بڵێ: شەفاعەت کردن هەر هەمووی موڵکی خودایە و حەقی خۆیەتی بە تەنها).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ﴾: مبتدأ و خبر، وقدم الخبر للحصر، واتە: شەفاحەت تەنها بۆ خوایە هەمووی.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە شەفاعەت تەنها موڵکی خوایە، نابێت کەس بکەیتە شەریک لەگەڵ خوا و دەبێت داوای شەفاعەت تەنها لەخوا بکرێت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە شەفاعەت هەمووی موڵکی خوایە و دەبێت تەنها داوای شەفاعەت لە خوا بکرێت، هیچ شتێک نییە دەربچێت لە ئیزن و ویستی خوای گەورە[١].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە شەفاعەت چەند جۆرێکە، لەبەر وتەی: ﴿جَمِيعًاۖ﴾، زانایان شەفاعەتیان دابەش کردووە بۆ دوو بەشی سەرەکی:

بەشی یەکەم: شەفاعەتی تایبەت بە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش چەند جۆرێکە:

---

[١] القول المفيد.

یەکەم: شەفاعەتی عظمی، ئەویش مقامی محمودە خوای گەورە بەڵێنی پێداوە.

دووەم: شەفاعەت کردن بۆ ئەهلی بەهەشت بۆ ئەوەی داخلی ناو بەهەشت بن، چونکە کاتێک لە پردی صراط تێپەڕ دەبن دەبینن دەرگا داخراوە، داوا دەکەن یەکێک شەفاعەت بکات بۆیان، پێغەمبەر (ﷺ) داوا لەخوا دەکات دەرگای بەهەشتیان بۆ بکاتەوە.

سێیەم: شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مامی خۆی بۆ ئەوەی سزای لەسەر سووک ببێت.

بەشی دووەم: شەفاعەتی گشتی، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات و خەڵکی تریش دەکات، ئەویش چەند جۆرن:

١- شەفاعەت کردن بۆ خەڵکانێک مستەحەقی چوونە ناو ئاگرن بۆ ئەوەی نەچنە ناوی، بەڵگە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (ما من مسلم يموت فيقوم على جنازته أربعون رجلا لا يشركون بالله شيئا، إلا شفعهم الله فيه)، ئەم شەفاعەتە پێش چوونە ناو ئاگرە.

٢- شەفاعەت کردن بۆ ئەوانەی چووینە ناو ئاگر بۆ ئەوەی دەربهێنرێن، فەرموودەکان بە متواتری هاتوون و هەموو هاوەڵان یەک دەنگن لەسەر ئەمە، وە هەموو موسلمانان یەک دەنگن لەسەر ئەمە ئیلا موعتەزیلە و خەوارج نەبن، ئەوان ئینکاری شەفاعەت دەکەن بۆ ئەهلی تاوان، چونکە ئەوان دەڵێن خاوەنی تاوانی گەورە لە دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت، هەر کەسێک شایستەی هەتا هەتای بێت شەفاعەت سوودی بۆی نییە، ئەوانە ئینکاری ئەوە دەکەن پێغەمبەر (ﷺ) یان کەسانی تر شەفاعەت بۆ ئەهلی تاوانی گەورە بکەن کە نەچن بۆ ناو ئاگر، یان لەئاگر دەربهێنرێت، بەڵام وتەیان پووچە پێچەوانەی دەق و ئیجماعە.

٣- شەفاعەت کردن بۆ بەرز بوونەوەی پلەکانی ئیمانداران، ئەمەش وەردەگیرێت لە دوعا کردنی هەندێک موسڵمان بۆ هەندێک موسڵمانی تر، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت

به ئەبو سەلەمە فەرمووی: (اللهم اغفر لأبي سلمة، وارفع درجته في المهديين، وافسح له في قبره، ونور له فيه، واخلف في عقبه)[١].

[١] القول المفيد.

**وقوله:** ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ﴾ [البقرة: ٢٥٥]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (کێ هەیە لای خوا شەفاعەت بکات "واتە: هیچ کەسێک نییە" مەگەر کەسێک خوا خۆی ئەمری پێ بکات و ئیزنی پێ بدات).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿مَن ذَا ٱلَّذِى﴾: من: اسم استفهام بمعنى النفي، واتە: کەس شەفاعەت ناکەت لای خوا مەگەر بە ئیزنی خوا.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی تەحەدای ئەوە بکات کەسێک هەبێت شەفاعەت بکات بەبێ ئیزنی خوا.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە مەرج بۆ شەفاعەت کردن ئیزنی خوای گەورەیە، کەس ناتوانێت شەفاعەت بکات بەبێ ئیزنی خوای گەورە.

**٢-** بەڵگەیە مرۆڤ دەبێت پشت بەخوا ببەستێت و پەیوەست نەبێت بە دروستکراوەکانەوە، چونکە دروستکراو خاوەنی هیچ نییە ئەگەر چەندیش باش بێت، هەموو شتێک بە دەست خوایە و بە ئیزنی خوایە.

**وقوله:** ﴿۞وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾ [النجم: ٢٦]

واته: خوای گەورە دەفەرموویّت: (زۆرێک لە فریشتەکان لە ئاسمانەکان هەن شەفاعەتەکەیان هیچ سوودی نییە و هەرگیز سوودی نابێت، ئیلا دوای ئەوەی کە خوای گەورە خۆی ئیزن دەدات و ڕازی دەبێت لە هەردوو لا، واتە: لە تکاکار و تکا بۆکراو).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿۞وَكَم مِّن مَّلَكٍ﴾: واتە: زۆرێک لە فریشتەکان، (کم) خبرية للتكثير.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە مەرج بۆ شەفاعەت ئیزنی خوای گەورەیە و ڕازی بوونە لەو کەسەی شەفاعەت دەکات و لەو کەسەی شەفاعەتی بۆی دەکرێت

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە شەفاعەت دوو مەرجی هەیە.

یەکەم: ئیزن لەخوای گەورە، لەبەر وتەی: ﴿إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ﴾.

دووەم: ڕازی بێت لەو کەسەی شەفاعەت دەکات و لەو کەسەی شەفاعەتی بۆی دەکرێت، لەبەر وتەی: ﴿وَيَرۡضَىٰٓ﴾.

**٢-** ئەگەر فریشتەكان لە ئاسمانەكان هیچیان بەدەست نەبێت بۆ شەفاعەت ئیلا دوای ئیزنی خوای گەورە و ڕەزامەندی خوا؛ ئەی چی دەڵێیت بۆ لات و عوزا لە زەوی دا!؟[1].

[1] القول المفيد.

**وقوله:** ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ۝٢٢ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ﴾ [سبأ: ٢٢-٢٣]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (بەو موشریکانە بڵێ ئادەی بپاڕێنەوە و داوا بکەن لەوانەی کە ئێوە دیعایە "بانگەشە" دەکەن کە گوایە سوود و زیانیان بەدەست بێت جگە لە خوا، دەی بزانن:

یەکەم: خۆ ئەوان خاوەنی هیچ نین تەنانەت خاوەنی یەک مسقالە زەڕەیەک نین، نە لە ئاسمان و نە لە زەویدا.

دووەم: لە موڵک و سامانی خواش دا بە هیچ جۆرێک شەریک نین.

سێیەم: بەهیچ جۆرێ هاوکار و یارمەتیدەری خوا نین.

چوارەم: هیچ شەفاعەت و تکایەک لای خوا هیچ سوودێکی نییە، مەگەر بۆ کەسێک خوا خۆی ئیزن بدا کە شەفاعەتی بۆ بکرێت).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾: واتە: بڵێ بەو موشریکانە: ئادەی بپاڕێنەوە و داوا بکەن لەوانەی کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن گوایە سوود و زیانیان بەدەستە جگە لە خوا.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەرئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە شەفاعەت نییە ئیلا بە ئیزنی خوا، هەروەها شەفاعەتی سەربەخۆ نییە وەک شەفاعەتی دونیا.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هیچ شەفاعەت و تکایەک لای خوا هیچ سوودێکی نییە، مەگەر بۆ کەسێک خوا خۆی ئیزن بدا کە شەفاعەتی بۆ بکرێت.

١- خاوەنداریەتی: گومانیان وابوو خاوەنی شتێکن، خوای گەورە هەر خۆی خاوەنی هەموو شتێکە.

٢- شەریکایەتی: گومانیان وابوو شەریکن لە موڵک و سامان لەگەڵ خوا.

٣- پشت و پەنا: گومانیان وابوو پشت و پەنا و یارمەتی دەریان هەیە لەگەڵ خوا، ئەمەش باطلە.

٤- شەفاعەت: گومانیان وابوو ئەوانەی داوای لێ دەکەن شەفاعەتی بۆ دەکەن.

ڕوونی کردەوە شەفاعەت نییە مەگەر بە ئیزنی خوا، هەروەها شەفاعەتێکی سەربەخۆ نییە وەک شەفاعەتی دونیا[١].

---

[١] التعلیق المفید.

**قال أبو العباس: نفى الله عما سواه كل ما يتعلق به المشركون، فنفى أن يكون لغيره ملك أو قسط منه، أو يكون عونا لله، ولم يبق إلا الشفاعة، فبين أنها لا تنفع إلا لمن أذن له الرب، كما قال تعالى:**

**ولا يشفعون إلا لمن ارتضى، فهذه الشفاعة التي يظنها المشركون، هي منتفية يوم القيامة كما نفاها القرآن، وأخبر النبي أنه يأتي فيسجد لربه ويحمده، لا يبدأ بالشفاعة أولا، ثم يقال له: ارفع رأسك، وقل يسمع، وسل تعط ، واشفع تشفع.**

**وقال له أبو هريرة: من أسعد الناس بشفاعتك يا رسول الله؟ قال: (من قال لا إله إلا الله خالصا من قلبه) فتلك الشفاعة لأهل الإخلاص بإذن الله، ولا تكون لمن أشرك بالله.**

**وحقيقته: أن الله سبحانه هو الذي يتفضل على أهل الإخلاص فيغفر لهم بواسطة دعاء من أذن له أن يشفع، ليكرمه وينال المقام المحمود.**

**فالشفاعة التي نفاها القرآن ما كان فيها شرك، ولهذا أثبت الشفاعة بإذنه في مواضع، وقد بين النبي (ﷺ) أنها لا تكون إلا لأهل التوحيد والإخلاص. انتهى كلامه[١].**

واته: ابن تيمييه دەفەرموویت: هەرچییەک کە موشریکەکان بەتەمای بن و ئومێدیان پێی بێت لای خوا، ئەوا خوا وەڵامی داوەتەوە، سەرنج بدە وەڵامی ئەوەی داوەتەوە کە بێجگە لە خۆی خاوەنی هیچ شتێک بێت، یان بەشێکی هەبێت یان هاوکاری خوا بێت، ئەو جا ڕوونی کردەوە کە شەفاعەت کردن هیچ سوودی نییە مەگەر بۆ کەسێ کە خوا خۆی ئیزن بدات شەفاعەتی بۆی بکرێت، هەروەک فەرمووی: (ولا يشفعون إلا لمن ارتضى)، واتە: شەفاعەت ناکەن مەگەر بۆ کەسێک کە خوا ڕازی بێت لە شەفاعەتکار و شەفاعەت بۆ کراو.

---

[١] مجموعه الفتاوى (٧٧/٧).

جا ئەو جۆرە تکا و شەفاعەتەی کە موشریکەکان گومان دەبەن سوودێکی هەبێت لە ڕۆژی قیامەت دا بوونی هەر نییە و هەروەک قورئان نەفی کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە: (کە خۆی دێت سوجدە دەبات بۆ پەروەردگاری، سوپاس و ستایشی دەکات) ئەوەتە یەکەم جار دەست ناکات بە شەفاعەت کردن، پاشان پێی دەگوترێ: (ئەی محمد سەرت بەرزبکە و قسە بکە دەبیسترێت، داوا بکە پێت دەدرێت، شەفاعەت بکە، واتە: تکا بکە تکات لێ وەردەگیرێت).

ئەبو هورەیرە پرسیاری لە پێغەمبەر کرد (ﷺ): چ کەسێ کامەران دەبێت بەوەی کە بەر شەفاعەتی تۆ بکەوێت ؟ فەرمووی: (هەر کەس لە ناخی دڵەوە بڵێت: لا إله إلا الله بە ئیخلاصەوە بڵێت).

کەواتە: ئەو شەفاعەتە بۆ ئەهلی ئیخلاصە بەئیزنی خوا، ئەوە بۆ یەکێک نییە کە شەریکی بۆ خوا دانابێت، حەقیقەت و چۆنییەتی یەکەشی ئەوەیە: کە خوا خۆی فەزل و چاکەی خۆی دەدات بەسەر ئەهلی ئیخلاص دا، بەو جۆرە کە بەهۆی دوعای کەسێکەوە کە خۆی ئیزنی داوە هەم لە تاوانبارەکە خۆش دەبێت هەم ڕێز لە شەفاعەتکار و تکاکارەکە دەنێت و مەقامی مەحمودی پێ دەبەخشێت.

ئەو شەفاعەتەش کە قورئان نەفی کردووە و بەرپەرچی داوەتەوە ئەوەیە کە شیرکی تێدا بێت، هەر لەبەر ئەوەشە کە لە چەندین شوێندا خوای گەورە شەفاعەتی چەسپاندووە بە ئیزنی خۆی، ئەڵبەتە پێغەمبەریش دروود و سەلامی خوای لێ بێت ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو شەفاعەتە بۆ هیچ کەسێک نییە جگە لە ئەهلی تەوحید و ئیخلاص[1].

---

(1) مجموع الفتاوى (٧/٧٧).

## باب قول الله تعالى:

﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ [القصص: ٥٦]

**وفي (الصحيح) عن ابن المسيب عن أبيه قال: «لما حضرت أبا طالب الوفاة جاءه رسول الله (ﷺ) وعنده عبد الله بن أبي أمية وأبو جهل، فقال له: «يا عم، قل: لا إله إلا الله، كلمة أحاج لك بها عند الله» فقالا له: أترغب عن ملة عبد المطلب؟ فأعاد عليه النبي (ﷺ)، فأعادا فكان آخر ما قال: هو على ملة عبد المطلب وأبى أن يقول: لا إله إلا الله. فقال النبي صلى الله عليه وسلم : (لأستغفرن لك ما لم أنه عنك)فأنزل الله:** ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ﴾ **الآية. وأنزل الله في أبي طالب:** ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[1]

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير قوله: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾

**الثانية:** تفسيرقوله: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ﴾.

**الثالثة:** وهي المسألة الكبرى تفسير قوله (ﷺ): (قل: لا إله إلا الله) بخلاف ما عليه من يدعي العلم.

**الرابعة:** أن أبا جهل ومن معه يعرفون مراد النبي (ﷺ) إذ قال للرجل: (قل لا إله إلا الله). فقبح الله من أبو جهل أعلم منه بأصل الإسلام.

**الخامسة:** جده (ﷺ) ومبالغته في إسلام عمه.

---

[1] أخرجه البخاري (١٣٦٠)، ومسلم (٢٤).

**السادسة:** الرد على من زعم إسلام عبد المطلب وأسلافه.

**السابعة:** كونه (ﷺ) استغفر له فلم يغفر له، بل نهي عن ذلك.

**الثامنة:** مضرة أصحاب السوء على الإنسان.

**التاسعة:** مضرة تعظيم الأسلاف والأكابر.

**العاشرة:** الشبهة للمبطلين في ذلك، لاستدلال أبي جهل بذلك.

**الحادية عشرة:** الشاهد لكون الأعمال بالخواتيم، لأنه لو قالها لنفعته .

**الثانية عشرة:** التأمل في كبر هذه الشبهة في قلوب الضالين، لأن في القصة أنهم لم يجادلوه إلا بها، مع مبالغته (ﷺ) وتكريره، فلأجل عظمتها ووضوحها عندهم، اقتصروا عليها.

## باب قول الله تعالى:

﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ﴾ [القصص: ٥٦]

باسی کردنی وتەی خوای گەورە: (تۆ هیدایەتی کەسێ نادەیت کە پێت خۆشە هیدایەت بدرێت، بەڵکو خوا خۆی هیدایەتی هەر کەسێک دەدات کە بیەوێت، هەر خۆی زاناترە و دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە).

### هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان:

سەعیدی کوڕی موسەییەب دەگێڕێتەوە کە باوکی گوتی: کاتێ مەرگی ئەبو تالیب نزیک بوویەوە و نیشانەکانی مەرگی لێ بەدیار کەوت، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای لەو کاتەدا (عبدالله بن أمية) و (أبو جهل) لە لای بوون، "چونکە مامی شارەزا بوو لە واتای شایەتوومان و تەوحید" پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی مامە بڵێ: (لا إله إلا الله)، ئەو وشەیە بڵێ منیش لە ڕۆژی قیامەت دا دەیکەمە بەڵگە بۆ ئەوەی سوودت پێ بگەیەنێت، ئەبو تالیبش خەریک بوو بیڵێت، ئەو دوو کەسە زانییان بە گوتنی ئەو دوو کەلیمەیە دەبێت پشت لە دینی باب و باپیرانیان بکات، لەبەر ئەوە یەکسەر گوتیان: (ئایا واز لە دینی عبدالمطلب دەهێنی؟)

پێغەمبەریش (ﷺ) هەمان وتەی خۆی دووبارە کردەوە، ئەوانیش هەمان وتەی خۆیان دووبارە کردەوە، لەبەرئەوە ئاخر وتەی ئەبو تالب ئەوە بوو کە وتی: (خۆم لەسەر دینی عبدالمطلبم)، ملی نەدا بڵێت: (لا إله إلا الله)، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (وەڵڵاهی داوای لێ خۆش بوونت بۆ دەکەم تا نەهیم لێ دەکرێت)، پاشان بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴿١١٣﴾﴾ [التوبة: ١١٣].

واتە: نابێت پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی ئیمانیان هێناوە داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ موشریکەکان، جا با کەسانی نزیکی خۆشیان بن.

ئەو ئایەتەش دابەزی لەبارەی ئەبو تالیبەوە کە دەفەرموویت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[1].

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکان و ماناکەیان:**

﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾: ظاهری ئایەتەکە وایادرە پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو تالیبی خۆش ویستووە، ئایەتەکە چۆن تەفسیر دەکرێت؟

وەڵام لە سێ ڕووووەوەیە:

١- یان دەوترێ: تەقدیری تێدایە مفعولێکی شاراوەی تێدایە، تەقدیرەکەی: تۆ ناتوانی هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە حەز دەکەی هیدایەتی بدەیت، نەک تۆ ناتوانی هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە خۆشت دەوێ.

٢- یان دەوترێ: مامی خۆش ویستووە وەک خۆشەویستی سروشتی، وەک خۆشەویستی کوڕ بۆ باوکی ئەگەر چی کافریش بێت.

٣- یان دەوترێ ئەمەش پێش نەهی کردن بووە لە خۆش ویستنی موشریکان.

وتەی یەکەم نزیکترە، واتە: تۆ ناتوانی هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە حەز دەکەی هیدایەتی بدەیت، نەک خۆش ویستنی کەسەکە، ئەمە عامە بۆ ئەبو تالیب و کەسانی ترە

(١) أخرجه البخاري (١٣٦٠)، ومسلم (٢٤).

و دروسته کەسێکت خۆش بوێت وەک خۆشەویستی خزمایەتی، ئەمەش نەفی خۆشەویستی شەرعی ناکات.

## هۆکاری باسکردنی ئەم بابە لە پەرتووکی تەوحید:

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مناسبەی هێنانەوەی ئەم بابە جۆرێکە لە جۆرەکانی بابی پێشتر، ئەگەر کەس نەتوانێت سوود بە کەسی تر بگەیەنێت بە شەفاعەت بۆ کردن و ڕزگار کردن لە سزا، ئەوا ناتوانێت هیدایەتی کەس بدات، ئەو هیدایەتەی خوای گەورە نەفی کردووە هیدایەتی تەوفیقە، ئەوەی جێگیرکراوە هیدایەتی دلالة و إرشادە)[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەران هەموویان و باشترینیان کە محمدە (ﷺ) هیچیان بەدەست نییە مەگەر ئەوەی خوای گەورە پێی داون، ناتوانن هیدایەتی مرۆڤەکان بدەن مەگەر ئەو هیداتە نەبێت کە لەخواوەیە، ئەوان پەروەردەکراون و هیچیان بە دەست نییە و ناتوان تصرف لە هیچ شتێک بکەن، لەبەر ئەوە نابێت بێجگە لەخوا بپەرسترێت، ئەوانیش وەک هەموو مرۆڤەکانی ترن، بەڵام ئەوە نەبێت خوای گەورە فەزڵی لەگەڵ کردوون بە ریسالە و پێغەمبەرایەتی، لەوە زیادەیان هەیە لە فەزل و شەڕەف, بەڵام بەهۆی ئەم پێغەمبەرایەتی یە نابێت بیانکەین بە شەریک لەگەڵ خوا لە بەڕێوەبردنی کەون، یان زانستی غەیب و هیدایەت، ئەگەر پێغەمبەر نەتوانێت هیدایەتی ئەبو تالیب و ئەبو لەهب بدات، ئەمە بەڵگەیە هیدایەت بە دەستی خوایە و دەبێت داوا لە خوا بکرێت.

---

[1] القول االمفید (٤٤٧/١).

ئەم بابە ڕوونی کردۆتەوە هیدایەتی وەرگرتنی حەق و ڕازی بوون کەس خاوەنی نییە مەگەر خوای گەورە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناتوانێ هیدایەتی تەوفیقی کەسێک بدات خۆشی بوێت، ئەوانی تر لەپێشترن نەتوانێ هیدایەتیان بدات، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾.

**٢-** خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ مامی خۆشەویستی سروشتی یە نەک دینی.

**٣-** دروستی خۆش ویستنی کافر ئەگەر حەربی نەبێت، خۆشەویستی سروشتی نەک شەرعی.

**٤-** خوای گەورە هیدایەتی کەسێک دەدات بییەوێت بە فەزل و ڕەحمەتی خۆی، کەسێک گومڕا دەکات بە دادپەروەری خۆی، لەبەر وتەی: ﴿وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾.

**٥-** خوای گەورە زاناترە بەوە کێ ئەهلە بۆ هیدایەت و هیدایەتی دەدات بە فەزلی خۆی، کێش ئەهلە بۆ گومڕایی، لەبەر وتەی: ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾.

**٦-** لەسەر ئیماندارە بانگەواز بکات بەگوێرەی توانا، هیدایەتی دڵ بەدەست خوای گەورەیە.

**وفي (الصحيح) عن ابن المسيب عن أبيه قال: «لما حضرت أبا طالب الوفاة جاءه رسول الله (ﷺ) وعنده عبد الله بن أبي أمية وأبو جهل، فقال له: (يا عم، قل: لا إله إلا الله، كلمة أحاج لك بها عند الله) فقالا له: أترغب عن ملة عبد المطلب؟ فأعاد عليه النبي (ﷺ)، فأعادا فكان آخر ما قال: هو على ملة عبد المطلب وأبى أن يقول: لا إله إلا الله. فقال النبي (ﷺ): (لأستغفرن لك ما لم أنه عنك)، فأنزل الله:** ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾﴾ [التوبة: ١١٣].

**وأنزل الله في أبي طالب:** ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[1]

سەعیدی کوڕی موسەییەب دەگێڕێتەوە کە باوکی گوتی: کاتێ مەرگی ئەبو تالیب نزیک بوویەوە و نیشانەکانی مەرگی لێ بەدیار کەوت، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای لەو کاتەدا (عبدالله بن أمیة) و (أبو جهل) لە لای بوون، "چونکە مامی شارەزا بوو لە واتای شایەتوومان و تەوحید" پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی مامە بڵێ: (لا إله إلا الله)، ئەو وشەیە بڵێ منیش لە ڕۆژی قیامەت دا دەیکەمە بەڵگە بۆ ئەوەی سوودت پێ بگەیەنێت، ئەبو تالبیش خەریک بوو بیڵێت، ئەو دوو کەسە زانییان بە گوتنی ئەو دوو کەلیمەیە دەبێت پشت لە دینی باب و باپیرانیان بکات، لەبەر ئەوە یەکسەر گوتیان: (ئایا واز لە دینی عبدالمطلب دەهێنی؟)

پێغەمبەریش (ﷺ) هەمان وتەی خۆی دووبارە کردەوە، ئەوانیش هەمان وتەی خۆیان دووبارە کردەوە، لەبەرئەوە ئاخر وتەی ئەبو تالب ئەوە بوو کە وتی: (خۆم لەسەر دینی

[1] أخرجه البخاري (١٣٦٠)، ومسلم (٢٤).

عبدالمطلبم)، ملی نەدا بڵێت: (لا إله إلا الله)، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (وەڵڵاهی داوای لێ خۆش بوونت بۆ دەکەم تا نەهیم لێ دەکرێت)، پاشان بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴿١١٣﴾﴾ [التوبة: ١١٣].

واتە: نابێت پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی ئیمانیان هێناوە داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ موشریکەکان، جا با کەسانی نزیکی خۆشیان بن.

ئەو ئایەتەش دابەزی لەبارەی ئەبو تالیبەوە کە دەفەرموویت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[1].

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لما حضرت أبا طالب الوفاة جاءه رسول الله):** واتە: کاتێ مەرگی ئەبو تالیب نزیک بوویەوە و نیشانەکانی مەرگی لێ بەدیار کەوت، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەران و نێردراوان و زانایان و فریشتەکان هیچیان بە دەست نییە بۆ هیدایەت دانی دڵی خەڵک، هیدایەتی توفیق بە دەست خوایە و کەس نابێتە خاوەنی نە پێغەمبەر و نە فریشتە و نە زانا و نە عابد و نە کەسانی تری بێجگە لە ئەمانە.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

---

(١) أخرجه البخاري (١٣٦٠)، ومسلم (٢٤).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە سەردانی نەخۆشی موشریک بکەیت، لەبەر بانگ کردنی بۆ دینی ئیسلام ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی مامی خۆی کردووە لە کاتێکدا موشریک بووە لەبەر بانگەوازی کردنی بۆ لای خوا.

پرسیار لە ابن تیمیە کراوە سەبارەت بە قەومێک کە گاورن و لەگەڵ موسڵمانان دەژین و نزیکن لێیانەوە، ئایا دروستە موسڵمان سەردانی گاور بکات ئەگەر نەخۆش بوو؟ وە ئەگەر مرد دروستە شوێن جەنازەی بکەوێت؟

لە وەڵام دا دەفەرموویێت: (الحمد لله رب العالمين، نابێت شوێن جەنازەی بکەویت، بەڵام سەبارەت بە سەردان کردنی هیچی تێدا نییە، چونکە دەکرێ سوودی هەبێت و دڵی بۆ ئیسلام رابکێشرێت، ئەگەر لەسەر کوفر بمرێت دۆزەخی بۆ واجب دەبێت، لەبەر ئەوە نابێت نوێژی لەسەر بکەیت، والله أعلم)[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (سەردانی نەخۆش بکە ئەگەر کافریش بێت، پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی ئەبو تالیبی کردووە لەکاتیکدا کافریش بووە، خزمەتکاری جوولەکە لە مەدینە نەخۆش کەوت پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی کرد، پێی فەرموو: (اشهد ألا إله إلا الله وأني رسول الله)، باوکی لەلای بوو، باوکی گوتی: بەگوێی أبا القاسم بکە، گوتی: أشهد ألا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله، پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو و گوتی: (الحمد لله الذي أنقذه بي من النار)، خزمەتکار بوو پێش ئەوەی فەرمان بکرێت بە دەرچوونی کافرەکان لە جزیرەی عەرەب، سەردانی کرد ئەو جوولەکە بوو و سەردانی ئەبو تالیبی کرد ئەویش موشریک بوو، بەتایبەتی ئەگەر سەردانەکە ئومێدی خێر و بانگ

---

[1] الفتاوي الكبرى.

كردنی تێدا بێت بۆ لای خوا، بەڵكو خوای گەورە ڕزگاری بكات بەهۆی ئەم بانگەواز كردنە)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە سەردانی نەخۆشی موشریک بکەیت لەبەر بانگ کردنی بۆ دینی ئیسلام، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی مامی خۆی کردووە کەچی موشریکیش بووە لەبەر بانگەوازی کردنی بۆ لای خوا)[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ترسناکی هاوڕێی خراپ، کە ئەمانە ئەبو تالیبیان ڕاکێشا و هۆکار بوون بۆ مردنی ئەبو تالیب لەسەر کوفر[٣].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەبو تالیب کافرە بووە و لەسەر کوفر مردووە، وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن ئەبو تالیب موسڵمان بووە، هەروەک ڕافضە ئەمە دەڵێن، خوای گەورە ڕوویان ڕەش بکات، چونکە دوا شت گوتی: هو على ملة أبي طالب، وأبى أن يقول: لا إله إلا الله[٤].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن ئەبو تالب موسلمان بوو، کە ئەمە وتەی شیعەکانە، چونکە دوا وتەی ئەوە بوو گوتی: من لەسەر دینی عبدالمطلبم، ڕازی نەبوو بڵێت: لا إله إلا الله)[٥].

---

[١] فتاوى الدروس.
[٢] إعانة المستفيد (٣٥٨/١).
[٣] إعانة المستفيد (٣٥٨/١-٣٥٩).
[٤] القول المفيد.
[٥] إعانة المستفيد (٣٥٩/١).

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ تەفسیری وشەی لا إله إلا الله، هەروەک دانەری کتاب وا دەڵێت، ماناکەی: تەرک کردنی عیبادەتی بێجگە لەخوایە، چونکە ئەبو جەهل و هاوڕێکەی هەردووکیان تێگەیشتن ئەگەر بڵێت: لا إله إلا الله ئەوا تەرکی دینی عبدالمطلبی کردووە، لا إله إلا الله تەنها وشە نییە بیڵێیت، بەڵکو کوفر کردنە بە تاغوت و ئیمان هێنانە بەخوا، بە پێچەوانەی بیروباوەڕی زۆرینەی کەسانی خوڕافی لەم سەردەمەدا کە دەڵێن: لا إله إلا الله، و دەڵێن: یا حسن، یا فلان، یا ئاژەڵ سەردەبڕن بۆ مردوو، یا لەکاتی تەنگانەدا داوا لە مردوو دەکەن، ئەوان دەڵێن: لا إله إلا الله، بەڵکو زیکری بەیانیان و ئێوارانیشیانی هەیە بە سەدەها جار دەیڵێن، پاشان ئاژەڵ سەردەبڕن و تەواف دەکەن بەدەوری گۆڕ و داوای لێ دەکەن لە کاتی تەنگانە.

ئەمە بەڵگەیە ئەبو جەهل زیاتر لەوان لە مانای لا إله إلا الله تێگەیشتووە، چونکە ئەبو جەهل تێگەیشتووە مانای لا إله إلا الله تەرک کردنی عیبادەتی گۆڕ و پەیکەر و کەسانی ترە، ئەمانە تێنەگەیشتوون، تێنەگەیشتوون لا إله إلا الله تەرک کردنی عیبادەتی گۆڕەکانە، ئەمە تێگەیشتنێکی گەورەیە و عەقیدەیەکی صحیحە، بانگخواز دەبێت لەمە تێبگات، چونکە ئەمە تێگەیشتنی بانگەوازە[1].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک بڵێت: لا إله إلا الله لێی وەردەگیرێت و بە موسڵمان حساب دەکرێت، حوکم بە ئیسلام بوونەکەی دەکرێت هەتا هەڵوەشێنەرەوەیەکی ئەم وشەیەی تێدا بەدیار نەکەوێت لە وتە یان کردەوە، ئەگەر هەڵوەشێنەرەوەی ئەم وشەیەی تێدا بەدیارکەوت ئەوا حوکم دەدرێت بە هەڵگەڕانەوەی لە دین، بەڵام ئەگەر لێی بەدیار نەکەوت ئەوا حوکم دەدرێت بە ئیسلام بوونی، ئەگەر ڕاستگۆ بێت لەنێوان خۆ و خوای گەورە ئەوا موسلمانێکی حەقە، ئەگەر درۆزن بێت لەنێوان خۆی و خوای

---

[1] إعانة المستفيد (٣٥٩/١).

گەورە ئەوە دووڕووە و کارەکانی بۆ لای خوای گەورەیە، بەڵام لای ئێمە هیچ نییە ئیلا ڕووکەش نەبێت[١].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەموو کردەوەیەک گرینگ کۆتاییەکەیەتی، ئەبو تالیب لەسەر کوفر و شیرک ژیا، بەڵام ئەگەر لە کاتی سەرەمەرگ وشەی "لا إله إلا الله" بگوتبا و وەڵامی پێغەمبەری بدابایەوە ئەوا موسڵمان دەبوو، ئەمە بەڵگەیە هەموو کردەوەیەک بە کۆتاییەکەیەتی، وتەی پێغەمبەریش ئەمە بەڕاست دادەنێت، فەرموودەی عبدالله بن مسعود: (إِنَّ الرجل مِنْكُمْ لَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَنَّةِ إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ كِتَابُهُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ وَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ )، هەموو_کردەوەکان گرینگترین شت کۆتاییەکەیەتی)[٢].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: کاتێک ئەبو تالیب کەوتە سەرەمەرگ کێشەیە لەگەڵ وتەی: ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ﴾ [النساء: ١٨]، ظاهري فەرموودەکە تەوبە قبولە لە کاتی سەرەمەرگ، وەڵام بۆ ئەمە لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: دەوترێ کاتێک ئەبو تالب کەوتە سەرەمەرگ، واتە: نیشانەکانی مردنی لێ بەدیارکەوتن نەک دابەزی بێت، بەڵام زانیوویەتی مردن هەر دێت مەحالە، لەسەر ئەمە پێچەوانەی ئایەتەکە نییە.

دووەم: ئەمە تایبەت بووە بە ئەبو تالیب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵگە لە دوو ڕووەوەیە:

---

[١] إعانة المستفيد (٣٥٨/١).

[٢] إعانة المستفيد (٣٥٨/١).

(أ) وتەی: (كلمة أحتج لك بها عند الله)، بەشێوەی بڕاوە نەی فەرمووە سوودی بۆ هەیە، نەیفەرمووە: (كلمة تخرجك من النار).

(ب) خوای گەورە ئیزنی داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بە شەفاعەت کردن بۆ مامی خۆی لەگەڵ ئەوەی لەسەر کوفر بوو، ئەمەش ناکرێت ئیلا دەبێت تایبەت بێت بە ئەبو تالیب، شەفاعەت بۆ ئەبو تالیب سزای لەسەر سووک کرا.

ڕووی یەکەم لاوازە کە دەڵێت ماناکەی نیشانەکانی مردنی بەسەریەوە دیار بوون، لەبەر ئەوە وتەکە دەڵێت: (لما حضرت أبا طالب الوفاة)، مطابقی تەواوە، لەبەر وتەی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ﴾، لەسەر ئەمە ڕوونترین وەڵام ئەوەیە بڵێیت ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەبو تالیب)[١].

**٧-** ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ مورجیئەکان و ئەوانەی دەڵێن: ئیمان تەنها زانین و بیروباوەڕە، ئەگەر بە دڵ زانیت یان باوەڕی بە (لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله) هەبوو، ئەوە موسلمانە ئەگەر کردەوەش نەکات، چونکە کردەوە مەرج نییە بۆ ئیمان، بەڵکو تەنها زانین یان بیروباوەڕ بەسە لای ئەوان، ئەمەش وتەیەکی باطلە[٢].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە موسڵمان داوای لێ خۆش بوون بۆ موشریکان بکات ئەگەرچی نزیکیشی بێت، ترسناکی وتەی هەندێک لە خەڵکی بۆ هەندێکی تریان لەسەر ئەو گەورانەیە کە لەسەر کوفر مردوون و دەڵێن: مرحوم، ئەمە حەڕامە، هەروەها حەڕامە ناخۆشی و خەم دەربڕیت لەسەر مردنیان یان شتی تر، جونکە ئیماندار دەبێت دڵ خۆش

---

[١] القول المفيد (٤٥٤/١-٤٥٦).

[٢] إعانة المستفيد (٣٥٩/١-٣٦٠).

بێت بە مردنیان، بەڵکو ئەگەر توانای هەبێت دەبێت شەڕیان لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی دین هەمووی بۆ خوا بێت[١].

زانایان دەڵێن دوعای ڕەحمەت و لێ خۆش بوون بۆ کافران لە دوو حاڵەت دایە:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر کافرەکە مردوو بێت، ئەمەیان دروست نییە دوعای ڕەحمەت و لێ خۆش بوونی بۆ بکەیت بە یەک دەنگی هەموو زانایان.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (داوای لێ خۆش بوون بۆ کافر دروست نییە بە بەڵگەی کتاب و سوننەت و یەک دەنگی هەموو زانایان)[٢].

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (نوێژ کردن لەسەر کافر و دوعا کردن بۆی بۆ لێ خۆش بوون حەڕامە بە دەقی قورئان و یەک دەنگی هەموو زانایان)[٣].

حاڵەتی دووەم: ئەگەر کافرەکە زیندوو بێت، ئەمەیان جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان دوو وتە هەیە:

یەکەم: هەندێ زانا دەڵێن دروستە دوعای ڕەحمەت و لێ خۆش بوون بۆ کافری زیندوو بکەیت.

دووەم: هەندێ زانای تر دەڵێن دروست نییە دوعای ڕەحمەت و لێ خۆش بوون بۆ کافری زیندوو بکەیت.

---

[١] القول المفيد.
[٢] مجموع الفتاوى (٤٨٩/١٢).
[٣] المجموع (١١٩/٥).

ابن تيمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (سەبارەت بە دوعای ڕەحمەت و لێ خۆش بوون بۆ کافری زیندوو زۆر وتە هەیە زانایان وتەیان هەیە کە دروستە، نەک مەبەست بە لێخۆش بوون ئەوە بێت ئەگەر لەسەر شیرک و کوفر مرد بێت، نەوەک ڕەحمی پێ ببات کەچی بگات بە خوا کافرە، بەڵکو دوعا کردن بۆی بۆ ئەوە بێت کە هۆکار بێت بۆ لێ خۆش بوون و ڕەحم پێدا بردن بۆ ئەوەی تەوفیقی بدرێت بۆ ئیسلام ، ئەمە یەکێک لە ڕووەکانە لە وتەی خوای گەورە لەسەر زمانی ابراهیم سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموویت ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي ۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾﴾ [إبراهيم: ٣٦]، وتەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (اللهُمَّ اِغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ). رواه البخاري (٣٢٩٠)، ومسلم (١٦٩٢)، واتە: یا الله لە تاوانی قەومی من خۆش ببە چونکە ئەوان نازانن)[١].

قرطبی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (زۆر لە زانایان دەڵێن هیچی تێدا نییە و دروستە پیاو دوعا بۆ دایک و باوکی خۆی بکات ئەگەر کافر بن، هەروەها داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکات ئەگەر زیندوو بن، بەڵام ئەگەر مردوو بێت ئەوا ئومێدی ئەوە بڕا و دوعای بۆ ناکرێت)[٢].

باشتر وایە دوعای هیدایەتیان بۆ بکەیت، ئەگەر دوعای ڕەحمەتیان بۆ بکەیت هیچ ڕێگریەک نییە ئەگەر مەبەستت ڕەحم پێدا بردن بێت بۆ هیدایەت و ئیسلام.

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ترسناکی دەمارگیری بۆ دینی باو و باپیران ئەگەر پێچەوانەی ئەوە بێت کە پێغەمبەران پێی هاتوون[٣].

---

[١] مجموع الفتاوى (٤٨٩/١٢).
[٢] تفسير القرطبي (٢٧٤/٨).
[٣] إعانة المستفيد (٣٦١/١).

**١٠-** ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ ئەوانەی پەیوەستن بە وەلی و پیاو چاکان داوایان لێ دەکەن، چونکە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) هیچی بەدەست نەبێت بۆ مامی خۆی ئەبو تالیب کە بە هیدایەت بێت، ئەوا بۆ کەسانی تر لەپێشترە کە هیچی بەدەست نەبێت، ئەمەش گونجاوە لەگەڵ ئەم بابە[1].

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە کافرت خۆش بوێت وەک خۆش ویستنێکی سروشتی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) مامی خۆی خۆش ویستووە، ظاهری فەرموودەکە وایادرە پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو تالیبی خۆش ویستووە، ئایەتەکە چۆن تەفسیر دەکرێت؟

وەڵام لە سێ ڕووەوەیە:

١- یان دەوترێ: تەقدیری تێدایە مفعولێکی محذوف ی تێدایە ، تەقدیرەکەی: تۆ ناتوانی هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە حەز دەکەی هیدایەتی بدەیت، نەک تۆ ناتوانی هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە خۆشت دەوێ.

٢- یان دەوترێ: مامی خۆش ویستووە وەک خۆشەویستی سروشتی، وەک خۆشەویستی کوڕ بۆ باوکی ئەگەر چی کافریش بێت.

٣- یان دەوترێ ئەمەش پێش نەهی کردن بووە لە خۆش ویستنی موشریکان.

وتەی یەکەم نزیکترە، واتە: تۆ ناتوانی هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە حەز دەکەی هیدایەتی بدەیت، نەک خۆش ویستنی کەسەکە، ئەمە عامە بۆ ئەبو تالیب و کەسانی ترە

---

[1] إعانة المستفيد (٣٦١/١).

و دروسته کەسێکت خۆش بوێت وەک خۆشەویستی خزمایەتی، ئەمەش نەفی خۆشەویستی شەرعی ناکات[1].

زانایان دەڵێن یەکێک لە گرینگترین بابەتەکانی بیروباوەر خۆش ویستن و پشتیوانی کردنی خۆشەویستانی خودایە، هەروەها دژایەتی کردنی ناحەزان و دوژمنانی خودایە، ئەم دوو کارە دژاودژی یەکترن، واتە دۆستایەتی خۆشەویستانی خودا ناکرێت هەتاکو دژایەتی ناحەزانی خودا نەکەیت، خۆش ویستن و ڕق لێ بوونەوە دەبێت لە پێناو خوا بێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (پتەوترین گرێی ئیمان ئەوەیە خۆش ویستن و ڕق لێ بونەوەت لەبەر خوا بێت و لەڕێگای خوا دا بێت).

زانایان دەڵێن دروستە مرۆڤ کافری خۆش بوێت بە خۆش ویستنی سروشتی جا چ لەبەر خزمایەتی یان چاکە بێت کە لەگەڵی کردووە، بەڵام دەبێت بەری بیت لە دینەکەی و ڕقیشی لێ بێت.

زانایان دەڵێن پشتیوانی و خۆش ویستنی کافر ئەم سێ حاڵەتانەن:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر خۆشت بوێت و پشتیوانی لێ بکەیت لەبەر کوفرەکەیان ئەمە کوفری گەورەیە.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر خۆشت بوێت و پشتیوانی لێ بکەیت و ڕێزی لێ بگری لەبەر دونیا ئەمەیان حەڕامە.

---

[1] القول االمفید.

حاڵەتی سێیەم: ئەگەر خۆشت بوێت و پشتیوانی لێ بکەیت لەبەر ئەوەی چاکەی لەگەڵت کردووە یان نزیکی خۆتە، ئەمەیان دروستە بەڵام حەربی نەبێت واتە شەڕ دژی موسڵمانان نەکات.

**١٢-** زانایان دەڵێن ڕاستە سورەتی تەوبە مەدەنی یە و چیرۆکی ئەبو تالیب مەککی یە، بەڵام هیچ مانع نییە دوو هۆکاری دابەزینی هەبێت، یان لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت ئەمەش داخلی ئەم ئایەتە دەبێت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (وتەی خوای گەورە: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴿١١٣﴾﴾، لە سورەت تەوبە لە کۆتاییەکان دابەزیوە و مەدەنی یە، چیرۆکی ئەبو تالب مەککی بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە کۆتاییەکان نەهی لە داوای لێ خۆش بوون کراوە بۆ موشریکان، لە بەرئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئیزنی وەرگرت داوای لێ خۆش بوون بکات بۆ دایکی کە دەچوو بۆ عومرە، ناکرێت ئیزن وەربگیرێت دوای دابەزینی نەهی، بەڵگەیە ئایەتەکە تاخیر دابەزیوە، مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە ڕوونی بکاتەوە ئەمەش داخلی ئەم ئایەتە دەبێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴿١١٣﴾﴾، نەک مانای ئەوە بێت ئەو کات ئایەتەکە دابەزی بێت و هیچ مانع نییە ئایەتەکە دوو هۆکاری دابەزینی هەبێت)[١].

---

[١] القول المفيد.

## باب ما جاء أن سبب كفر بني آدم وتركهم دينهم هو الغلو في الصالحين

**وقول الله عز وجل:** ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ [النساء: ١٧١]

**وفي (الصحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما في قول الله تعالى:** ﴿وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسۡرٗا﴾ [نوح: ٢٣]، **قال: (هذه أسماء رجال صالحين من قوم نوح، فلما هلكوا أوحى الشيطان إلى قومهم أن انصبوا إلى مجالسهم التي كانوا يجلسون فيها أنصابا وسموها بأسمائهم، ففعلوا، ولم تعبد، حتى إذا هلك أولئك ونسي العلم، عبدت)**[١].

**وقال ابن القيم: قال غير واحد من السلف: لما ماتوا عكفوا على قبورهم ثم صوروا تماثيلهم، ثم طال عليهم الأمد فعبدوهم**[٢].

**وعن عمر أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبد، فقولوا: عبد الله ورسوله) [أخرجاه]**[٣].

**وقال: قال رسول الله (ﷺ): (إياكم والغلو، فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو)**[٤].

---

[١] أخرجه البخاري (٤٩٢٠).

[٢] إغاثة اللهفان لابن القيم ١٨٤.

[٣] أخرجه البخاري (٣٤٤٥)، ومسلم (١٦٩١).

[٤] أخرجه أحمد (٣٤٧/١ رقم ٣٢٤٨)، والنسائي (٣٠٥٧)، وابن ماجه (٣٠٢٩) من حديث ابن عباس رضي الله عنه، وصححه الألباني في "الصحيحة" رقم (١٢٨٣).

**ولمسلم عن ابن مسعود أن رسول الله (ﷺ) قال: (هلك المتنطعون) قالها ثلاثا[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** أن من فهم هذا الباب وبابين بعده، تبين له غربة الإسلام، ورأى من قدرة الله وتقليبه للقلوب العجب.

**الثانية:** معرفة أول شرك حدث على وجه الأرض أنه بشبهة الصالحين.

**الثالثة:** أول شيء غير به دين الأنبياء، وما سبب ذلك مع معرفة أن الله أرسلهم.

**الرابعة:** قبول البدع مع كون الشرائع والفطر تردها.

**الخامسة:** أن سبب ذلك كله مزج الحق بالباطل، فالأول: محبة الصالحين، والثاني: فعل أناس من أهل العلم والدين شيئا أرادوا به خيرا، فظن من بعدهم أنهم أرادوا به غيره.

**السادسة:** تفسير الآية التي في سورة نوح.السابعة: جبلة الآدمي في كون الحق ينقص في قلبه، والباطل يزيد.

**الثامنة:** فيه شاهد لما نقل عن السلف أن البدعة سبب الكفر.

**التاسعة:** معرفة الشيطان بما تؤول إليه البدعة ولو حسن قصد الفاعل.

**العاشرة:** معرفة القاعدة الكلية، وهي النهي عن الغلو، ومعرفة ما يؤول إليه.

---

[1] أخرجه مسلم (٢٦٧٠).

**الحادية عشرة:** مضرة العكوف على القبر لأجل عمل صالح.

**الثانية عشرة:** معرفة: النهي عن التماثيل، والحكمة في إزالتها.

**الثالثة عشرة:** معرفة عظم شأن هذه القصة، وشدة الحاجة إليها مع الغفلة عنها.

**الرابعة عشرة:** وهي أعجب وأعجب: قراءتهم إياها في كتب التفسير والحديث، ومعرفتهم بمعنى الكلام، وكون الله حال بينهم وبين قلوبهم حتى اعتقدوا أن فعل قوم نوح هو أفضل العبادات، واعتقدوا أن ما نهى الله ورسوله عنه، فهو الكفر المبيح للدم والمال.

**الخامسة عشرة:** التصريح أنهم لم يريدوا إلا الشفاعة.

**السادسة عشرة:** ظنهم أن العلماء الذين صوروا الصور أرادوا ذلك.

**السابعة عشرة:** البيان العظيم في قوله صلى الله عليه وسلم: (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم) فصلوات الله وسلامه على من بلغ البلاغ المبين.

**الثامنة عشرة:** نصيحته إيانا بهلاك المتنطعين.

**التاسعة عشرة:** التصريح بأنها لم تعبد حتى نسي العلم، ففيها بيان معرفة قدر وجوده ومضرة فقده. العشرون: أن سبب فقد العلم موت العلماء.

# بــاب مـــا جـــاء أن سبب كفر بني آدم وتركهم دينهم هو الغلو في الصالحين

## هۆكاری كافر بوونی نەوەی ئادەم و دوور كەوتنەوەیان لە دینەكەیان زیادەڕۆیی كردنە لە مەدح و بەرزكردنەوەی پیاو چاك و ساڵحەكانە

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (والغلوا: هو مجاوزة الحد في الثناء مدحا أو قدحا، واتە: سنوور بەزاندنە لە باس كردن جا چ مەدح كردن بێت یان زەم كردن بێت)[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دانەری كتاب ڕوونی كردۆتەوە هۆكاری تووش بوونی نەوەی ئادەم بە كوفر زۆرینەی بۆ زیادەڕەوی كردن دەگەڕێتەوە لە پیاو چاكان، هەروەها هۆكاری تریشی هەیە وەك حەسوودی، زۆرینەیان پێغەمبەران و پیاو چاكانیان خۆش ویستووە هەتا زیادەڕەوی و كوفریان تێدا كرد)[2].

---

[1] القول المفيد (٤٤٦/١).

[2] التعليق المفيد.

**وقول الله عز وجل:** ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ [النساء: ١٧١]

واته: خوای گەورە دەفەرمووت: (ئەی ئەهلی کتاب بە هیچ جۆرێ زیادەڕۆیی مەکەن لە دینەکەتاندا، جگە لە حەق هیچی تر مەڵێن بە ناوی خواوە).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە و ماناکەی:**

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾: (الغلو: هو مجاوزة الحد في الثناء مدحا أو قدحا)، واته: سنوور بەزاندنە لە باسکردن جا چ مەدح کردن بێت یان زەم کردن بێت.

﴿لَا تَغۡلُواْ﴾: (تغلو): (فعل)ە لە سیاقی نەهی هاتووە، هەموو جۆرەکانی زیادەڕەوی دەگرێتەوە، واتە: زیادەڕەوی مەکەن بە هەر جۆرێک لە جۆرەکانی زیادەڕەوی کردن لە دین، نەهی کراوە لە هەر جۆرێک لە جۆرەکانی زیادەڕەوی، زیادەڕەوی کردن لە پیاوچاکان و کەسانی تر داخلی ئەم (عموم)ە دەبێت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- زیادەڕەوی کردنی گاورەکان لە ئایینەکەیاندا، وتە دانە پاڵ خوای گەورە بە ناحەق، لەبەر وتەی: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ الآية.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (واتە: زیادەڕەوی مەکەن لە مەدح کردن و زەم کردندا، واقعەکە باسی ئەهلی کتابە بەگشتی زیادەڕەوی کردن لە ئەهلی کتاب ڕوویدا، چونکە زیادەڕەوییان کرد لە عیسا (عليه السلام) بە مەدح کردن و زەم کردن، گاورەکان گوتیان: عیسا کوڕی خوایە، جولەکە وتیان: دایکی عیسا زیناکەرە و خۆیشی مناڵی زینایە، هەردوولا زیادەڕەوییان کرد لە دیندا و سنووریان بەزاند.

نەهی کراوە لە زیادەڕەوی کردن، چونکە چەند زیانێک لەخۆ دەگرێت، لەوانە:

- ئەو کەسەی زیادەڕەوی تێیدا کراوە لە شوێنی خۆی بەرزتر دانراوە ئەگەر مەدح بێت، ئەگەر زەم بێت لەشوێنی خۆی نزم تر دانراوە.

- سەر دەکێشێت بۆ عیبادەت کردنی ئەو کەسەی کە زیادەڕەوی تێیدا کراوە، هەروەک ئەمە ڕوویداوە لە واقع.

- لادەدات لە بەگەورە دانانی خوای گەورە، چونکە نەفس یان سەرقاڵ دەبێت بە باطل یان حەق، ئەگەر سەرقاڵ بوو بەزیادەڕەوی ئەگەر دروستکراوە و مەدحی کرد و بەگەورەی دانا، دڵی پەیوەست دەبێت بەو کەسە و لەبیر دەکات کە ئەو مافانە دەبێت بۆ خوا بن و تەنها خوا بپەرستێت و بەگەورە دابنرێت.

- ئەو کەسەی زیادەڕەوی تێیدا کراوە لە مەدح کردندا تووشی خۆ بە گەورە دانان و سەرسام بوون بە نەفسی خۆی دەبێت، هەروەها دوژمنایەتی و ڕق کینە و شەڕ و ئاژاوە دەکەوێتە نێوانیان، ئەگەر زیادەڕەوی بکەن لە زەم کردنیدا)[١].

**٢-** حەڕامی زیادەڕەوی کردن لە دیندا، چونکە خوای گەورە نەهی کردووە لە ئەهلی کتاب، نەهی بۆ ئەوان بۆ کەسانی تریشە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ): (إياكم والغلو، فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو)[٢].

(١) القول المفيد (١/٤٦٦-٤٧٠).

(٢) أخرجه النسائي (٥/٢٦٨)، وابن ماجه (٣٠٢٩)، وأحمد (١/٣٤٧،٢١٥)، وصححه الألباني في الصحيحة (١٢٨٣).

واتە: (ئاگاتان لە خۆ بێت نەکەونە زیادەڕەویەوە، چونکە پێش ئێوە تەنها بە زیادەڕەوی لە ناو چوون).

عن عمر أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبد، فقولوا: عبد الله ورسوله)[(١)].

واتە: لە عومەر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لە مەدح کردنی مندا زیادەڕەوی مەکەن، ئەگەرنا وەک گاورەکانتان بەسەر دێت کە لەبارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە زیادەڕەویان کرد، من تەنها بەندەیەکم پێم بڵێن بەندەی خوا و پێغەمبەری خوا).

(الإطراء): سنور بەزاندنە لە مەدح کردندا، بەڵام (غلو) گشتی یە و زۆر شت دەگرێتەوە، دەکرێت زیادەڕەوی کردن بێت لە مەدح و لە زەم و لە تێگەیشتن بێت، هەروەها لە زانست و کردەوە، بەڵام (الإطراء) زیادەڕەوی کردنە لە مەدح.

**٣-** حەرامی درۆ و وتە دانە پاڵ خوای گەورە بێ زانست، واجبی گوتنی وتەی حەق، لەبەر وتەی: ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾.

**٤-** زیادەڕەوی کردن لە دیندا وتە دانە پاڵ خوای گەورەیە بە باطل، لەبەر مفهومی وتەی: ﴿لَا تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾.

---

(١) أخرجه البخاري (٣٤٤٥)، ومسلم (١٦٩١).

**وفي (الصحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما في قول الله تعالى:** ﴿وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ [نوح: ٢٣]، **قال: (هذه أسماء رجال صالحين من قوم نوح، فلما هلكوا أوحى الشيطان إلى قومهم أن انصبوا إلى مجالسهم التي كانوا يجلسون فيها أنصابا وسموها بأسمائهم، ففعلوا، ولم تعبد، حتى إذا هلك أولئك ونسي العلم، عبدت)**[1].

واته: له صحیحی بوخاریدا لەبارەی ئەو ئایەتەوە: ﴿وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾، واته: لەگەل ئەوەشدا، گوتیان واز مەهێنن له پەرستراوەکانتان, واز مەهێنن له وەدد و سواع و یەغوس و یەعوق و نەسر.

له تەفسیری ئەو ئایەتەدا ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: ئەمانە ناوی پیاو چاکانێ بوون لەناو قەومی نوحدا، کاتێ ئەو پیاو چاکانە مردن، شەیتان وەسوەسەی بۆ بردن و بە قەومەکەیانی گوت: له شوێنی دانیشتن و کۆبوونەوەی ئەو پیاو چاکانە پەیکەریان بۆ دروست بکەن و پەیکەرەکانیش بەناوی ئەوانەوە ناو بنێن، ئەوانیش بەو جۆرەیان کرد و نەیان دەپەرستن، هەتا ئەو چینەی دووەم، یان ئەو نەوەیە لەناو چوون و زانستەکەش کە زانستی تەوحید بوو لەبیر برایەوە، واتە: کەس نەما ئاگاداریان بکاتەوە کە پەیکەر و مانەوە لەلای حەڕامە، سەرەنجام پەیکەر و بتەکان پەرستران.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەمە بەڵگەیە "بیدعه" دروست نییە ئەگەر چی ڕووکەشەکەشی خێر بێت، ئەگەرچی نییەتی خاوەنەکەی خێر بێت، ئەم بیدعەیان داهێنا و پەیکەری پیاو چاکەکانی خۆیان دروستکرد و عیبادەتیان نەکرد، چونکە لەسەر

[1] أخرجه البخاري (٤٩٢٠).

زانست و دین بوون، بەڵام کاتێک ئەو نەوەیە مرد، زانست نەما و نەوەی دواتر هات و عیبادەتی ئەم پەیکەرانەیان کرد)[١].

**وقال ابن القيم: قال غير واحد من السلف: لما ماتوا عكفوا على قبورهم ثم صوروا تماثيلهم، ثم طال عليهم الأمد فعبدوهم.**

واتە: ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (زۆرێک لە سەلەف وتوویانە: کاتێ مردن خەڵکەکە دەچوون لەسەر گۆڕەکانیان دەمانەوە "ئەمەش جۆرێکە لە عیبادەت"، پاشان وێنەی بتەکانیان کێشا، پاشان زەمانە درێژەی کێشا و ئەوجا دەستیان دایە پەرستنی پەیکەرەکان).

**سوودەکانی ئەم ئایەتە و ئەثەرە:**

**١-** ئەم ئایەت و ئەثەرە بەڵگەن لەسەر حەرامی زیادەڕەوی کردن لە حەقی پێغەمبەران و پیاوچاکان.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (حەرامە زیادەڕەوی بکرێت لە پیاوچاکان، بەو مانایەی باسمان کرد و سەردەکێشێت بۆ شیرک، چونکە زیادەڕەوی قەومی نوح لە پیاوچاکاندا سەری کێشا بۆ شیرک پەنا بەخوا)[٢].

**٢-** ئەم ئەثەر و ئایەتە بەڵگەن زیادەڕەوی کردن سوننەتی گاور و جوولەکە و ئومەتەکانی پێشترە.

---

[١] إعانة المستفيد (١/٣٦٧).

[٢] إعانة المستفيد (١/٣٦٩).

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم ئەثەر و ئایەتە بەڵگەن زیادەڕەوی کردن سوننەتی گاور و جوولەکە و ئومەتەکانی پێشترە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ [النساء: ١٧١]، زیادەڕەوی کردن لە پیاوچاکان سونەتی گاور وجوولەکەکانە، سونەتی موسڵمانان نییە، ئەم گۆڕ پەرستانە پێشینەیان گاور و جوولەکەکانن، خراپترین پێشینەن)[1].

**٣-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ ترسناکی پەیکەر دروست کردن، کە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (خۆ پاراستن لە وێنە کێشان و بڵاوکردنەوەیان، چونکە ئەمە وەسیلەیە بۆ شیرک، یەک شیرک لەسەر زەوی ڕوویدا بێت بەهۆی وێنە کێشان و دروستکردنی بووە (واتە: پەیکەر)، ئەمە یەکێکە لە عیلەتەکانی حەڕام کردنی وێنە، وێنە کێشان قدەغەکراوە لەبەر دوو عیللەت:

١- هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک.

٢- مضاهاة لخلق الله عزوجل)[2].

**٤-** ئەم ئایەت و ئەثەرە بەڵگەن حەڕامە بیدعە دابێنی لە دین دا، بیدعە شەڕەکەی گەورەیە لەسەر ئەو کەسەی دەیکات، و لەسەر ئەو کەسەی بەدوای دا دێت[3].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم ئایەت و ئەثەرە بەڵگەن حەڕامە بیدعە دابهێنی لە دین دا و سەر دەکێشێت بۆ شیرک، لەبەر ئەوە زانایان دەڵێن: بیدعە

(١) إعانة المستفيد (١/٣٦٩).
(٢) إعانة المستفيد (١/٣٦٩-٣٧٠).
(٣) التعليق المفيد.

سەردەكێشێت بۆ شیرک ئەگەر چی ماوەیەكی زۆریشی بەسەردا تێپەڕببێت، بیدعەی قەومی نوح گەیشتە شیرک، ئەمەش شتێكی ڕوون و ئاشكرایە)[١].

**٥-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە نییەتی باش كردەوەی ڕێگەپێنەدراو باش ناكات، چونكە قەومی نوح نییەتیان زۆر باش بوو، پەیكەریان كێشا مەبەستیان ئەوە بوو بۆ ئەوەی هاندەر بێت بۆ عیبادەت، بۆ ئەوەی حاڵی ئەم پیاو چاكانەیان بە بیر بهێنێتەوە، هەرگیز مەبەستی شیركیان نەبوو، بەڵكو نییەتێكی باشیان هەبوو[٢].

**٦-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ فەزڵی بوونی زانست و زانا لەناو خەڵكدا، چونكە شەیتان نەیتوانی بانگەواز بۆ شیرک بكات لەگەڵ بوونی زانست و زانا، بەڵكو دوای نەمانی زانست و مردنی زانا بانگەوازی بۆ شیرک كرد، ئەمە بەڵگەیە بوونی زانست و زانا لەناو خەڵک خێرێكی زۆری تێدایە بۆ ئوممەت و نەمانیان شەڕێكی زۆری تێدایە[٣].

**٧-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ خۆ پاراستن لە مەكری شەیتان، هەندێک شت وا دەردەخات لە ڕووكەش و ڕواڵەتدا باشە، هەتا خەڵک گومڕا دەكات، ئەمە لە ڕوویەک.

لە ڕوویەكی تر هەنگاو بە هەنگاو بۆ مرۆڤ دێت، چونكە هەنگاوی یەكەمی قەومی نوح بیركردنەوەیان بۆ عیبادەت و هاندان بوو، پاشان هەنگاوی دووەم بۆ نیەتی خراپ و شیرک بوو)[٤].

---

[١] إعانة المستفيد (٣٧٠/١).

[٢] إعانة المستفيد (٣٧١/١).

[٣] إعانة المستفيد (٣٧١/١).

[٤] إعانة المستفيد (٣٧١/١).

**٨-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە لادانی زیان لەپێشترە لە ڕاکیشانی سوود، کە قاعیدەیەکی بەناوبانگە، کە ئەمە قاعیدەیەکی بەناوبانگە، چونکە کردەوەی قەومی نوح سوودێکی جزئی هەیە، ئەویش بیرکردنەوەیە لە حاڵی پیاوچاکان، بەڵام زیانی گەورەتر لەمە ئەوەیە سەر دەکێشێت بۆ شیرک پەنا بەخوا[(١)].

**وعن عمر أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبد، فقولوا: عبد الله ورسوله) [أخرجاه][(٢)].**

واتە: لە عومەر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لە مەدح کردنی من دا زیادەڕەوی مەکەن، ئەگەرنا وەک گاورەکانتان بەسەر دێت کە

(١) إعانة المستفيد (٣٧٣/١).
(٢) أخرجه البخاري (٣٤٤٥)، ومسلم (١٦٩١).

لەبارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە زیادەڕەویان کرد، من تەنها بەندەیەکم پێم بڵێن بەندەی خوا و پێغەمبەری خوا).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(الإطراء):** مەدح کردنە بە نادروست[١]، (الإطراء): سنور بەزاندنە لە مەدح کردن دا، بەڵام غلو گشتی یە و زۆر شت دەگرێتەوە، دەکرێت زیادەڕەوی کردن بێت لە مەدح و لە زەم و لە تێگەیشتن، هەروەها لە زانست و کردەوە، بەڵام الإطراء زیادەڕەوی کردنە لە مەدح)[٢].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوی لێ بێت دەفەرمووێت: (الإطراء: زیادەڕەوی کردنە لە مەدح)[٣].

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە کە زیادەڕەوی کردن لە مەدح هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک کە ئەمەش سوننەتی ئەهلی کتاب بووە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

---

[١] فتح الباری.

[٢] التمهید لاپەڕە (٢٣٥).

[٣] القول المفید.

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زیادەڕەوی کردن لە مەدح دا سوننەتی گاورەکانە، چونکە گاورەکان وتیان عیسا خوایە یان کوڕی خوایە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرامە زیادەڕەوی بکەیت لە مەدح کردنی پێغەمبەران و پیاوچاکان.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هەندێ خەڵک وا گومان دەبەن (کاف) لە وتەی پێغەمبەر (کما أطرت النصاری)، مانای مثل دێت، واتە: زیادەڕەوی مەکەن لە عیسا وەک زیادەڕەوی کردنی گاورەکان لە کوڕی مەریەم، دەڵێن: گاورەکان زیادەڕەوییان کرد لە یەک شت دا، ئەویش ئەوەیە وتیان: کوڕی خوایە، کەواتە نەهی یەکە تەنها لەوە کراوە بڵێیت کوڕی خوایە، ئەگەر وابێت بێجگە لەم حاڵەتە دروستە، ئەمە تێگەیشتنی خوراڤی یەکانە بۆ ئەم نەهی یە، هەروەک بوصیری لەم مقامە دەڵێت:

دع ما ادعته النـصاری في نـبیهم

واحکم بما شئت مدحا فیه واحتکم

واتە مەڵێ: منالی خوا، یان کوڕی خوا، تەنها ئەمە نەهی لێکراوە، بۆت هەیە هەر شتێکی تر بڵێیت بێجگە لەمە، هیچت لەسەر نییە و هیچی تێدا نییە.

ڕووی دووەم: کە ئەمە تێگەیشتنی ڕاستە و سیاقەکەش بەڵگەیە (کاف) لێرە بۆ قیاسە، واتە: زیادەڕەوی مەکەن لە مەدح کردنی من دا وەک زیادەڕەوی کردنی گاورەکان لە عیسای کوڕی مەریەم، کافی قیاس تمثیلی ناقص دەکات، حەقیقەتەکەی لێرە چوواندنە لەنێوان پێش و پاش لە ئەصلی کارەکە)[1].

---

[1] التمهید لاپەڕە ٢٣٥-٢٣٦.

**٣-** فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانەری کتاب باسی کردووە، هۆی کافر بوونی نەوەی ئادەم و دوور کەوتنەوەیان لە دینەکەیان زیادەڕۆیی کردنە لە مەدح و بەرزکردنەوەی پیاو چاک و سالحەکانە.

ئەمە بەڵگەیە بۆ سۆز و بەزەیی پێغەمبەر بە ئومەتەکەی، بەجۆرێک ئومەتی خۆی ئاگادار کردۆتەوە لەوەی گاورەکان تووشی بوونە، هەروەها بەڵگەیە نەهی کراوە لە خۆ چوواندن بە کافرەکان[1] .

**وقال: قال رسول الله (ﷺ): (إياكم والغلو، فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو)[2].**

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئاگاتان لە خۆتان بێت نەکەونە زیادەڕەویەوە، چونکە پێش ئێوە تەنها بە زیادەڕەوی لە ناو چوون).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

---

[1] إعانة المستفيد (٣٧٧/١).

[2] أخرجه النسائي (٥/٢٦٨)، وابن ماجه (٣٠٢٩)، وأحمد (١/٣٤٧،٢١٥)، وصححه الألباني في الصحيحة (١٢٨٣).

**(إياكم والغلوا):** واتە: ئاگاتان لە خۆتان بێت نەکەونە زیادەڕەویەوە.

**(أهلك):** وتەی (أهلك)، ئەگەری دوو مانای هەیە:

یەکەم: مەبەست پێی هیلاکی دینە، لەسەر ئەمە هیلاک بەهۆی زیادەڕەوی کردن بووە، چونکە تەنها زیادەڕەوی کردن بە هیلاک چوونە.

دووەم: مەبەست پێی بەهیلاک چوونی لاشەیە، لەسەر ئەمە زیادەڕەوی کردن هۆکارە بۆ بەهیلاک چوون، واتە: کاتێک زیادەڕەوییان کرد و دەرچوون لە گوێڕایەلی خوا، خوای گەورە بەهیلاکی بردن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆئەوەی ترسناکی زیادەڕەوی ڕوون بکاتەوە کە هۆکارە بۆ تیاچوون و تووش بوون بە شیرک.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ترسناکی زیادەڕەوی و خۆپاراستن لە زیادەڕەوی کردن، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (ئاگاتان لە خۆتان بێت نەکەونە زیادەڕەویەوە).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تەنها بە زیادەڕەوی کردن ئەوانەی پێش ئێمە لە ناو چوون.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی گوت لە حەجی ماڵئاوایی کاتێک فەرمانی بە ابن عباس کرد حەوت بەرد هەڵبگرێت، فەرموودەکە رواه احمد و بعض أهل السنن بإسناد جيد فهو حديث صحيح)[١].

---

[١] التعليق المفيد.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئایا ئەم حصرە لە وتەی: (فإنما أهلك من كان قبلكم)، حەقیقی یە یان إضافی یە؟

وەڵام: ئەگەر بوترێ: حەقیقی یە کێشە دروست دەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) بەهیلاک چوونی داوەتە پاڵ کردەوەی تر بێجگە لە غلو، نموونە: (إنما هلك من كان قبلكم أنهم إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد)، ئەمانە دوو حصرن بەرامبەر یەکتر، ئەگەر بڵێین حصرەکە حەقیقی یە ئەوە تناقض هەیە لەنێوان ئەم دوو فەرموودەیە.

ئەگەر وترا: حصری إضافی یە، واتە بەگوێرەی کردەوەیەکی دیارکراو، ئەوە تناقض دروست نابێت، کەواتە حصرەکە إضافی یە)[1].

**ولمسلم عن ابن مسعود أن رسول الله (ﷺ) قال: (هلك المتنطعون) قالها ثلاثا.**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لەناو چوون ئەوانەی کە وتە و کردەوەکانیان زۆر قوڵ دەکەنەوە )، سێ جار ئەمەی فەرموو.

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(هلك):** واتە: لەناو چوون.

---

[1] القول المفيد.

**(المتنطعون):** واتە: ئەوانەی کە وتە و کردەوەکانیان زۆر قوڵ دەکەنەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە زیادەڕەوی کردن حەرامە و هۆکارە بۆ تیاچوون.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر حەرامی زیادەڕەوی کردن.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دووبارە کردنەوەی ئامۆژگاری تا جێگیر ببێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی دووبارە کردەوە: (هلك المتنطعون)، سێ جار ئەمەی گوت بۆ ئەوەی ئامۆژگارییەکە جێگیر ببێت لە دڵی گوێگرەکان[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زیادەڕەوی کردن هۆکارە بۆ بەهیلاک چوون.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: ((تنطع) و (الإطراء) و (غلو) هەموویان مانایان لێک نزیکە و سنوور بەزاندنە، (غلو) (الإطراء) و (تنطع) لەخۆ دەگرێت، هەموو (الإطراء) و (تنطع) بە (غلو) حساب دەکرێن، ناوێکی گشتی یە بۆ هەموو ئەمانە)[2].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم سێ فەرموودەیە هەموویان بەڵگەن لەسەر حەرامی زیادەڕەوی کردن بەوەی هۆکارە بۆ بەهیلاک چوون، واجبە لەسەر بەندە

---

[1] إعانة المستفيد (٣٨٩/١).
[2] التمهيد لاپەڕە (٢٣٧).

لەسەر ڕێچکەی مام ناوەند بڕوات، هەروەک چۆن ئەم ئوممەتە مام ناوەندە و دینەکەشی مام ناوەندە، دەبێت ڕۆیشتنیشی لەناو دیندا لەسەر ڕێگایی مام ناوەند بێت)[(١)].

---

(١) القول المفيد.

## باب ما جاء من التغليظ فيمن عبد الله عند قبر رجل صالح فكيف إذا عبده

في (الصحيح) عن عائشة رضي الله عنها أن أم سلمة ذكرت لرسول الله (ﷺ) كنيسة رأتها في أرض الحبشة وما فيها من الصور. فقال: (أولئك إذا مات فيهم الرجل الصالح أو العبد الصالح بنوا على قبره مسجدا، وصوروا فيه تلك الصور أولئك شرار الخلق عند الله)[1].

فهؤلاء جمعوا بين الفتنتين، فتنة القبور، وفتنة التماثيل.

ولهما عنها قالت: لما نزل برسول الله (ﷺ) طفق يطرح خميصة له على وجهه، فإذا اغتم بها كشفها، فقال ـ وهو كذلك: (لعنة الله على اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد) يحذر ما صنعوا، ولولا ذلك أبرز قبره، غير أنه خشي أن يتخذ مسجدا، [أخرجاه][2].

ولمسلم عن جندب بن عبد الله قال: سمعت النبي (ﷺ) قبل أن يموت بخمس وهو يقول: (إني أبرأ إلى الله أن يكون لي منكم خليل، فإن الله قد اتخذني خليلا، كما اتخذ إبراهيم خليلا، ولو كنت متخذا من أمتي خليلا، لاتخذت أبا بكر خليلا، ألا وإن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم مساجد، ألا فلا تتخذوا القبور مساجد، فإني أنهاكم عن ذلك)[3].

---

[1] أخرجه البخاري(٤٣٤)، ومسلم (٥٢٨).

[2] أخرجه البخاري(٤٣٦،٤٣٥)، ومسلم (٥٣١).

[3] أخرجه مسلم (٥٣٢).

**فقد نهى عنه في آخر حياته، ثم إنه لعن ـ وهو في السياق ـ من فعله، والصلاة عندها من ذلك، وإن لم يبن مسجد، وهو معنى قولها: خشي أن يتخذ مسجدا، فإن الصحابة لم يكونوا ليبنوا حول قبره مسجدا، وكل موضع قصدت الصلاة فيه فقد اتخذ مسجدا، بل كل موضع يصلى فيه يسمى مسجدا، كما قال (ﷺ): (جعلت لي الأرض مسجدا وطهورا)[١].**

**ولأحمد بسند جيد عن ابن مسعود مرفوعا: (إن من شرار الناس من تدركهم الساعة وهم أحياء والذين يتخذون القبور مساجد). [رواه أبو حاتم في صحيحه][٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** ما ذكر الرسول (ﷺ) فيمن بنى مسجدا يعبد الله فيه عند قبر رجل صالح، ولو صحت نية الفاعل.

**الثانية:** النهي عن التماثيل، وغلظ الأمر في ذلك.

**الثالثة:** العبرة في مبالغته صلى الله عليه وسلم في ذلك. كيف بين لهم هذا أولا، ثم قبل موته بخمس قال ما قال، ثم لما كان في السياق لم يكتف بما تقدم.

**الرابعة:** نهيه عن فعله عند قبره قبل أن يوجد القبر.

**الخامسة:** أنه من سنن اليهود والنصارى في قبور أنبيائهم.

---

[١] أخرجه البخاري (٣٣٥)، ومسلم (٥٢١) من حديث جابر رضي الله عنه.

[٢] أخرجه أحمد (٤٠٥/١ رقم ٣٨٤٤)، وابن حبان (٢٦٠/١٥ رقم ٦٨٤٧)، وابن حبان (٧٨٩).

**السادسة:** لعنه إياهم على ذلك.

**السابعة:** أن مراده صلى الله عليه وسلم تحذيره إيانا عن قبره.

**الثامنة:** العلة في عدم إبراز قبره.

**التاسعة:** في معنى اتخاذها مسجدا.

**العاشرة:** أنه قرن بين من اتخذها مسجدا وبين من تقوم عليهم الساعة، فذكر الذريعة إلى الشرك قبل وقوعه مع خاتمته.

**الحادية عشرة:** ذكره في خطبته قبل موته بخمس: الرد على الطائفتين اللتين هما شر أهل البدع، بل أخرجهم بعض السلف من الثنتين والسبعين فرقة، وهم الرافضة والجهمية. وبسبب الرافضة حدث الشرك وعبادة القبور، وهم أول من بنى عليها المساجد.

**الثانية عشرة:** ما بلي به (ﷺ) من شدة النزع.

**الثالثة عشرة:** ما أكرم به من الخلة.

**الرابعة عشرة:** التصريح بأنها أعلى من المحبة.

**الخامسة عشرة:** التصريح بأن الصديق أفضل الصحابة.

**السادسة عشرة:** الإشارة إلى خلافته.

## باب ما جاء من التغليظ فيمن عبد الله عنـد قبر رجـل صـالـح فكيف إذا عبـده

## بەڵگەی توووند و سەخت لە بارەی ئەو کەسەوە کە عیبادەتی خوا بکات لای گۆڕی پیاو چاکێک، ئەی ئەگەر پیاو چاکەکە بپەرستێت دەبێت چۆن بێت؟!

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (وتەی: (فيمن عبد الله عنـد قبر رجـل صـالـح)، واتە: هەرکردەوەیەک بکات خوا بپەرستێت، جا چ قورئان خوێندنەوە بێت یان نوێژ یان خێر یان شتی تر.

وتەی: (كيف إذا عبده)، ئەمە توندتر و گەورەترە، چونکە گۆڕستانی موسڵمانان و گۆڕی پیاو چاکان یان کەسانی تر موسلمان پێویستی بە دوعایە، ئەوان سەردانی دەکەن بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن نەک سوودی پێ بگەیەنن، ئیلا ئەوە نەبێت سەردانی گۆڕستان بکەیت وەک شوێن کەوتنی سونەت، پاداشت بەدەست دێت بەمە، بەڵام سوود لەو کەسەکانەوە نییە و بە هۆی ئەوانەوە بەدەست ناهێت، بەڵکو سوود بەهۆی کردەوەی خودی مرۆڤەکەیە سوننەتی جێ بەجێکردووە، سەردان کردن بە مەبەستی سوود وەرگرتن بێت لە مردووەکان سەردانێکی بیدعی یە، وە سەردان کردن مەبەست پێی سوود گەیاندن بێت بە مردووەکان و حاڵیان سەردانێکی شەرعی یە)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: ((فيمن عبد الله عنـد قبر رجـل صـالـح)، عیبادەتی خوا دەکات بە دوعا لەخوا کردن لەلای گۆڕ بە ئومێدی قبول بوون، گومانی

---

[١] القول المفيد.

وایە دوعا کردن لەم شوێنە هۆکارە بۆ قبول بوون، یان نوێژ، گومانی وایە نوێژ لە لای گۆڕ هۆکارە بۆ قبول بوون، یان ئاژەڵ سەربڕین لە لای گۆڕ، ئەگەر چی بکەر تەنها خوای گەورە دەپەرستێت، بەڵام کردەوەکەی لە لای گۆڕ ئومێدی ئەوەی هەیە قبول ببێت، عیبادەت کردن لای گۆڕ تایبەت مەندییەکی هەیە لەگەڵ عیبادەت کردن لە شوێنی تر، ئەمە بنیات نراوە لەسەر گومانی پوچ ، چونکە گۆڕەکان شوێنی عیبادەت نیین، وە عیبادەت کردن لە لای گۆڕ ئەگەر چی بە پاکی بۆ خوا دەکات بەڵام هۆکارە بۆ شیرک، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئوممەتی ئاگادار کردۆتەوە لە عیبادەت کردن لە لای گۆڕ وەک داخستی دەرگا نەوەک تووشی شیرک ببن.

بەڵام ئەگەر داوا لە گۆڕ بکات، ئیستیغاثەی پێ بکات، ئەمە شیرکی گەورەیە.

سەبارەت بەوە ئەگەر تەنها خوا بپەرستێت بە پاکی لەلای گۆڕ، ئەمە هۆکارە بۆ تووش بوون بەشیرک و ڕێگایە بۆ شیرک، ئەمە حەڕامە، ئەی دەبێت ئەوە چۆن بێت ئەگەر گۆڕەکە بپەرستێت؟!)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیارێزێت دەفەرموویت: (شێوەی ئەم بابە: کەسێک دێت بۆ لای گۆڕی پیاو چاکێک، دەزانێت کەسێکی باشە وەک ئەوەی پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەران، یان پیاو چاکێکی ئەم ئوممەتەیە، یان پیاو چاکێکی ئوممەتەکانی ترە، دێتە ئەم شوێنە بۆ ئەوەی تەنها خوا بپەرستێت و ئومێدی بەرەکەتی ئەم شوێنەی هەیە, زۆر لە خەڵک ئەم ئومێدەیان هەیە، باوەڕیان وایە دەوروبەری گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاکان مبارەکە، عیبادەت کردن لای گۆڕ وەک عیبادەت کردنی شوێنی تر نییە، پێغەمبەر (ﷺ) نەهییەکی توندی کردووە لەم بارەیەوە، لەگەڵ ئەمەش کەسەکە تەنها خوا دەپەرستێت، خاوەنی

---

[1] إعانة المستفيد (٣٩١/١).

گۆڕ ناپەرستێت، بەڵام ئەم شوێنەی کردۆتە شوێنی ئومێدی بەرەکەت و دابەزینی ڕەحمەت، هەروەک دەڵێن: ئومێدی دابەزینی فەزل و ڕەحمەتین لە خواوە، ئەم شوێنە هەلدەبژێرێت لەبەر بەرەکەتی شوێنەکە، بەڵام کەس ناپەرستێت ئیلا خوا نەبێت، لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی کردووە لەوانەی گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) و پیاو چاکان دەکەن مزگەوت.

وتەی: (فكيف إذا عبده؟) واتە: ئەگەر ئەم توندی و نەفرەتە هاتبێت بۆ کەسێک گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاکان بکاتە مزگەوت، ڕۆناکی لەسەر گۆڕ دادەگیرسێنێت، یان بەگەورەی دادەنێت، وە تەنها خوا دەپەرستێت لە لای گۆڕ، ئەگەر ئەمەیان نەفرەت لەسەر بکەرەکەی هاتبێت، وە خراپترینی خەڵک بێت لای خوای گەورە، ئەی دەبێت ئەو کەسە چۆن بێت کە عیبادەتی خاوەنی گۆڕەکە دەکات و داوای لێ دەکات، ئومێدی پێی هەیە و لێی دەترسێ، ئەمەلی پێی هەیە و ئیستیغاثەی پێ دەکات و نوێژی بۆ دەکات و ئاژەڵی بۆی سەر دەبڕێت، داوای شەفاعەتی لێ دەکات، گومانی تێدا نییە ئەمە گەورەترە لەوەی تەنها عیبادەتی خوا بکەیت لای گۆڕی پیاو چاکێک)[1].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٤١-٢٤٢).

**في "الصحيح" عن عائشة رضي الله عنها أن أم سلمة ذكرت لرسول الله (ﷺ) كنيسة رأتها في أرض الحبشة وما فيها من الصور. فقال: (أولئك إذا مات فيهم الرجل الصالح أو العبد الصالح بنوا على قبره مسجدا، وصوروا فيه تلك الصور أولئك شرار الخلق عند الله) فهؤلاء جمعوا بين الفتنتين، فتنة القبور، وفتنة التماثيل.**

واتە: لە عائیشە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: ئوم سەلەمە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باسیکرد کە لە ولاتی حەبەشە کەنیسەیەکی بینیوە، باسی ئەو وێنە و پەیکەرانەشی کرد کە لە کەنیسەکەدا دانرا بوون.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەوانەی کە باست کردن ئەگەر پیاوچاکێک، یان بەندەیەکی چاک لێ بمردایا، لەسەر گۆڕەکەی پەرستگایەکیان دروست دەکرد و ئەو وێنە و بتانەشیان بۆ دروست دەکردن، ئەوانەی ئەو جۆرە کارانە دەکەن خراپترین و بەدترینی مخلوقاتن لای خوا).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(أم سلم):** ئوم سەلەمە لەوانە بوو هیجرەتی کرد لەگەڵ پیاوی خۆی بۆ حەبەشە، کاتێک پیاوەکەی ئەبو سەلەمە مرد شووی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ)، لە کاتی سەرەمەرگ ئەمەی بە پێغەمبەری گوت.

**(من الصور):** ظاهري فەرموودەکە وا دیارە ئەم وێنانە لاشەیان هەبووە و لەسەر شێوەی پەیکەر بوون.

**(أولئك):** ئاماژەیە بۆ گاورەکانی حەبەشە، وە لەوانەیە مەبەستی هەر کەسێک بێت ئەم کردەوەی کردبێت.

**(الرجل الصالح أو العبد الصالح):** لێرە (أو) گومانە لە ڕاوی.

**(أولئك شرار الخلق عند الله):** چونکە کردەوەیە هۆکارە بۆ تووش بوون بە کوفر و شیرک.

**(فهؤلاء جمعوا بين الفتنتين: فتنة القبور وفتنة التماثيل):** ئەمە وتەی ابن تیمیەیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

**هۆی باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی هێناوەتەوە چونکە وەعیدێکی توند هاتووە سەبارەت بەو کەسەی عیبادەتی خوا دەکات لە کەنیسەیەک وێنەی تێدایە، چونکە گۆڕ و وێنە هۆکارن بۆ تووش بوون بە شیرک.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە وتەی: (أولئك شرار الخلق عندالله)، وەعیدێکی توندی تێدایە سەبارەت بەو کەسەی عیبادەتی خوا دەکات لە کەنیسەیەک گۆڕ و وێنەی تێدایە، چونکە گۆڕ و وێنە هۆکارن بۆ شیرک)[1].

**ســوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شیرک تاوانێکی زۆر گەورەیە، لەبەر بەگەورە دانانی تاوانی هۆکارەکانی تووش بوون بە شیرک و حەڕام کردنی و داخستنی دەرگاکانی تووش بوون بە شیرک، کاتێک ترسی ئەوە هەبوو خاوەنی گۆڕەکە بپەرسترێت حەڕام کرا و بە

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٤٥).

تاوانە گەورەکان دانرا، گەورەیی تاوانی هۆکارەکە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی تووش بوونەکە[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پارێزگاری کردنی شەریعەت لە لایەنی تەوحید بە پارێزگاری کردنێکی تەواو، بەجۆرێک هەموو دەرگاکانی تووش بوون بە شیرکی داخستووە[٢].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە مزگەوت دروست بکرێت لەسەر گۆڕ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی ئەوانەی کردووە بە خراپترین خەڵک، ئەوانەی مزگەوت دروست دەکەن لەسەر گۆڕەکان.

ئایا نوێژ دروستە لەو مزگەوتەی دروست کراوە لەسەر گۆڕ، یان نوێژ دروست نییە؟

وەڵام: لەمە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەهلی عیلم:

هەندێک دەڵێن: نوێژ دروستە، چونکە ئەوەی حەڕام بێت مزگەوت دروست کردنەکەیە، ئەمە جیایە لە نوێژ، هیچ فەرموودە نەهاتوون لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهی کردبێت لە نوێژ کردن لەو مزگەوتەی گۆڕی تێدایە، هەروەک نوێژ بکات لە شوێنێک دەست بەسەرداگیراو بێت، وتەی ڕاست نوێژی مرۆڤ لە شوێنێک دەستی بەسەردا گیراو بێت نوێژی دروستە لەگەڵ ئەوە تاوانباریش دەبێت، ئەمە وتەی هەر سێ مەزهەبەکانە.

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (٥٣٨/٢).
[٢] فتح ذي الجلال والإكرام (٥٣٨/٢).

وتەی دووەم: نوێژ کردن لەو مزگەوتە دروست نییە، چونکە نەهی لێکراوە بە ڕێگای لزوم، ئەویش ئەوە نوێژ لەم مزگەوتە هۆکارە بۆ عیبادەتی خاوەنی گۆڕ، کەواتە نەهی لێی کراوە بەڕێگای نەهی کردن لە هۆکار[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (یەکەم دەستە لەناو ئیسلام مزگەوتیان دروست کردبێت لەسەر گۆڕ هەروەک ابن تیمیە دەڵێت شیعە بوون، شیعەی فاطمی بوون، پاشان سۆفی یەکان شوێنیان کەوتن و پاشان کەسای تر، مزگەوتیان دروست کردن لەسەر گۆڕ لە ئەمصار)[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مزگەوت دروست کردن لەسەر گۆڕ خۆ چوواندنە بە جوولەکە و گاورەکان، وە هەر کەسێک خۆی بچووێنێت بە قەومێک ئەویش لەوانە، مەبەست لەم وتەیە خۆ پاراستنە لە کردەوەکەیان[٣].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مزگەوت دروست کردن لەسەر گۆڕ خۆ چوواندنە بە جوولەکە و گاورەکان، واقعی ئێستاش بەڕاست دانەری وتەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموویێت: (لترکبن سنن من کان قبلکم)، قالوا الیهود والنصاری؟ قال: (فمن)، لەسەر ئەمە ئەوەی مزگەوت دروست دەکات لەسەر گۆڕ بە تەواوی خۆی چوواندووە بە جوولەکە و گاورەکان)[٤].

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (٢/٥٣٨).
[٢] إعانة المستفيد (١/٣٩٤).

[٣] التعليق المفيد.
[٤] فتح ذي الجلال والإكرام (٢/٥٣٩).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ئەو مزگەوتە بڕوخێنرێت ئەگەر لەسەر گۆڕ دروستکرا، ڕووی کردنە بەڵگە:

یەکەم: ئەم مزگەوت دروست کردنە تاوانێکی گەورەیە، نابێت دان بە تاوان بنرێت.

دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە بە ڕوخاندنی مزگەوتی (ضرار) لەگەڵ ئەمەش لەسەر گۆڕ بنیان نەنرابوو، بەڵام زیانی هەبوو بۆ مزگەوتی تەنیشت خۆی، ئەوەی هۆکار بێت بۆ شیرک ڕوخاندنی لەپێشترە[١].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شەڕ و خراپەش وەک خێر و چاکە لێک جیاوازن، باشە هەیە باشتر لەوەی تر و خراپەش بەهەمان شێوە.

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (٥٣٩/٢-٥٤٠).

**ولهما عنها قالت: (لما نزل برسول الله (ﷺ) طفق يطرح خميصة له على وجهه، فإذا اغتم بها كشفها، فقال ـ وهو كذلك ـ: (لعنة الله على اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد) يحذر ما صنعوا، ولولا ذلك أبرز قبره، غير أنه خشي أن يتخذ مسجدا. [أخرجاه].**

واته: له عائیشه دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کاتی سەرەمەرگی هات دەستی دایە قوماشێکی خەتخەت و دەیدا بەسەر و ڕوخساری خۆیدا، جا کاتێک تەنگە نەفس بوو لایدەدا، بەو حاڵە سەختەوە دەیفەرموو: (نەفرەتی خوا لە جوولەکە و گاورەکان بێت گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکردە مزگەوت).

عائیشە دەڵێت: موسڵمانانی ئاگادار دەکردەوە نەکەن وەک ئەوان بکەن، ئەگەر لەبەر ترسی ئەوە نەبوایا لە دەشت و لەبەر چاوی خەڵک دەنێژرا، بەڵام لەبەر ئەوە پێغەمبەر و هاوەڵان ترسان گۆڕەکەی بکرێتە پەرستگا.

### ڕاڤەکردنی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لهما):** ئەم ضمیرە بۆ بوخاری و موسلم دەگەڕێتەوە.

**(لما نزل برسول الله):** واتە کاتێک کاتی ڕوح کێشانی هات و فریشتەی ڕوح کێشان دابەزی بۆ ئەوەی ڕۆحی بکێشێت.

**(خميصة):** پارچە قوماشێکی خەت خەتە.

**(لعنة الله على اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد):** لەوانەیە پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری دابێت خوای گەورە نەفرەتی لەوان کردووە، وە لەوانەش مەبەست پێی دوعا بێت، ئەوەی دیار بێت دوعای لێیان کردووە لەبەر ئەم کردەوەیەیان.

**(غير أنه خشي أي يتخذ مسجدا):** (خشي): دوو خوێندنەوەی هەیە:

١- خشي: خاء ضەمەی لەسەرە، واتەی ئەوانەی ترساون هاوەڵان بوون.

٢- خشي: خاء فەتحەی لەسەرە، واتە ئەوەی ترساوە پێغەمبەر بووە (ﷺ).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لەڕاستیدا هەردوو ترسەكان هاتۆنەتەدی، پێغەمبەر (ﷺ) ترساوە و وە هاوەڵانیش)[١].

## هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی هێناوەتەوە چونكە وەعیدێكی توونـد هاتووە سەبارەت بەوانەی گۆڕی پێغەمبەران دەكەن بە مزگەوت، پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە گاور و جوولەكەی كردووە لەبەر ئەم كردەوەیە، بەڵگەیە لەسەر ترسناكی هۆكارەكانی شیرك و تووش بوون بە شیرك.

## سوودەكانی ئـەم فەرموودەیـە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە بینایە دروست بكرێت لەسەر گۆڕ، چونكە ئەمە هۆكارە بۆ تووش بوون بە شیرك، چونكە گۆڕ ئەگەر بینایە لەسەری دروستكرا، یان داپۆشرا و ڕازێنداوە، ئەوە خەڵكی عەوام و نەزان تووشی فیتنە دەبن پێی، وا گومان دەبەن ئەم كردەوەیە ئیلا نهێنییێكی تێدایە و شوێنی عیبادەت كردنە و دوعا كردن و داوا لێ كردنە[٢].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئێمە دەڵێین وەڵام بۆ ئەمە لە چەند ڕوویێكەوەیە:

---

[١] القول المفيد.

[٢] إعانة المستفيد (٣٩٨/١).

ڕووی یەکەم: مزگەوت دروست نەکراوە لە سەر گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو مزگەوت دروست کراوە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك لەژیان دابووە.

ڕووی دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) نە نێژراوە لە مزگەوت تا بلێن ئەوە گۆڕی پیاو چاکانە لەناو مزگەوت بەلکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵەکەی خۆیدا نێژراوە .

ڕووی سێیەم: لە ناو نانی ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) و ماڵی عائشە لەگەل مزگەوت بە یەك دەنگی هاوەلان نەبووە، بەلکو زۆرینەیان لە ژیاندا نەمابوون مەگەر کەمێک نەبن، ئەمەیان کرد لەساڵی (٩٤) هـ بەنزیکەیی، هاوەڵان ڕێگەیان نەداوە یان لەسەری یەك دەنگ نەبوونە، لەگەل ئەوە هەندێکیان پێچەوانەیان کردووە لەوانەی کە پێچەوانەی ئەمانە بوون سەعیدی کوری موسەیب لە تابعین رازی نەبوو بەم کردەوەیە.

ڕووی چوارەم: گۆر لە ناو مزگەوت دا نییە هەتا ئەوکاتەی مزگەوت گەورە بوو، چونکە لە حوجرەیەکی سەربەخۆ دایە لەمزگەوت، هەر لەبەر ئەوە ئەو شوێنە پارێزراوە دەوری دراوە بەسێ دیوار)[1].

ابن باز ڕحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (هاوەڵان خوا لێیان رازی بێت پێغەمبەریان نەشاردۆتەوە لە ناو مزگەوت بەلکو لەماڵی عائشە رەزای خوای لێ بێت شاردوویانەوە، کاتێك وەلیدی کوری عبدالملك مزگەوتی فراوان کرد لە کۆتای سەدەی یەکەم حوجرە کەوتە ناو مزگەوت، هەڵەیان کرد لەمە هەندێک زانا ئینکاریان لێ کرد، بەڵام من وای دەبینم هیچی تێدا نییە لەبەر فراوان کردنی مزگەوت.

---

[1] القول المفيد.

نابێت موسڵمانان ئەمە بکاتە بەڵگە کە دروستە گۆڕ بنێژرێت لە ناو مزگەوتا یان مزگەوت دروست بکرێت لە سەر گۆڕ، چونکە پێچەوانەی فەرموودەی ڕاستە، هەروەها هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک و پەرستنی خاوەنی گۆڕەکان)[١].

زانایان دەڵێن مزگەوتێک گۆڕی تێدا بێت ئەم دوو حاڵەتەیە:

حاڵەتی یەکەم: پێشتر گۆڕەکە لەو شوێنە بووە ئینجا مزگەوتەکە دروستکراوە لەسەر گۆڕ، ئەمایان واجبە مزگەوتەکە بڕوخێنرێت و نوێژ تێیدا ناکرێت، ئەوەی مزگەوتەکەی دروستکردووە دەبێت بیڕوخێنێت، ئەگەر نەیڕوخێنێت دەبێت کاربەدەست بیروخێنێت.

حاڵەتی دووەم: پێشتر مزگەوت دروستکراوە پاشان گۆڕی تێدا نێژراوە، ئەمیان واجبە گۆڕەکە دەربهێنرێت لە ناو مزگەوت و پاشان بنێژرێت لە گۆڕستان.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە عیبادەت بکەیت لە لای گۆڕ، هەتا ئەگەر گۆڕ بینایەش لەسەری دروست نەکرابێت، نە دوعا و نە نوێژ و نە ئاژەڵ سەربڕین و نە نەزر و نە شتی تر، بەڵکو سونەتی ئیسلام ئەوەیە سەردانی گۆڕەکان بکەیت بۆ ئەوەی سەلام لە مردووەکان بکەیت، وە دوعای ڕەحمەت و لێ خۆش بوونیان بۆ بکەیت، وە ئەوەی سەردانیان دەکات پەند و ئامۆژگاری وەربگرێت لە حاڵی مردووەکان، ئەمە ڕێگای ئیسلامە بۆ گۆڕەکان، وە گۆڕەکان ئیهانە نەکرێن، بەڵکو دەبێت پارێزگاریان لێ بکرێت)[٢].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (گۆڕ کردنە مزگەوت سێ شێوەی هەیە:

[١] مجموعه فتاوی ابن باز (٣٨٨/٥-٣٨٩).
[٢] إعانة المستفيد (٣٩٩/١).

شێوەی یەکەم: سوجدە دەبات لەسەر گۆڕ، واتە گۆڕ دەکاتە شوێنی سوجدە بردن، وتەی: (اتخذوا قبور أنبيائهم مساجدا)، واتە: گۆڕ دەکاتە شوێنی سوجدە.

شێوەی دووەم: نوێژ دەکات ڕووەو گۆڕ، مەبەست پێی ئەوەیە گۆڕ بەرامبەریەتی، نوێژ دەکات بەجۆرێک گۆڕ لە قیبلەیەتی، ...

شێوەی سێیەم: گۆڕ بکاتە مزگەوت، واتە گۆڕ لەناو بینایەیە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە نەفرەت لە کافران و خاوەن تاوانی گەورە بکەیت بەشێوەیەکی گشتی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە جوولەکە و گاورەکانی کرد، ئەم نەفرەت کردنە بەشێوەیەکی گشتی بوو، نەفرەت کردنی کافر و خاوەنی تاوانی گەورە بەشێوەیەکی گشتی هیچی تێدا نییە، بۆ ئەوەی لەو کردەوەیە دوور بکەونەوە، بەڵام نەفرەت کردن بە شێوەیەکی دیاریکراو خیلاف هەیە[2].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە گرینگی بە عەقیدە بدرێت و بانگەوازی کردن بۆ عەقیدە پێش هەموو شتێک بێت، بە چاک بوونی عەقیدە دەست پێ دەکەین پێش چاک بوونی شتی تر، چونکە ئەمە مەنهەجی پێغەمبەران بووە (عليهم السلام)[3].

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٤٦-٢٤٨).
[2] إعانة المستفيد (٤٠٠/١).
[3] إعانة المستفيد (٤٠١/١).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر تەواوی حەریسی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئوممەتەکەی، وە ئامۆژگاری کردنی ئوممەتەکەی، ئامۆژگاری خۆی گەیاندووە هەتا لە دواساتەکانی ژیانی کە حالەتێکی ناخۆش و قورس بووە، کە کاتی سەرەمەرگ بووە[١].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ حیکمەتی شاردنەوەی پێغەمبەر لە ماڵی خۆی، زانایان دەڵێن دوو حیکمەت هەیە:

١- لەپێناو پارێزگاری کردن بووە لە عەقیدەی موسلمانان، بۆ ئەوەی زیادەڕەوی نەکەن لە حەقی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەو کردەوەیە نەکەن ئەوەی گاور و جوولەکە کردیان لەلای گۆڕی پێغەمبەرەکان و پیاو چاکان.

٢- هەر پێغەمبەرێک لە هەر شوێنێک بمرێت لەو شوێنە دەنێژرێت، بەڵگە:

عن أبي بكر رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (ما قبض نبي إلا دفن حيث يقبض)[٢].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەگەر لەبەر ئەمە نەبوایا گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) بەدیار دەخرا و لەگەڵ گۆڕەکانی تر لە گۆڕستانی بەقیع دەنێژرا، لەبەر ئەم عیلەتە گۆڕی نەقل ناکەن بۆ گۆڕستان، وتەی: (لعنة الله على اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)، عائیشە دەڵێت: موسڵمانانی ئاگادار دەکردەوە نەکەن وەک ئەوان بکەن، ئەگەر لەبەر ترسی ئەوە نەبوایا لە دەشت و لەبەر چاوی خەڵک دەنێژرا، بەڵام لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان ترسان گۆڕەکەی بکرێتە پەرستگا.

---

[١] إعانة المستفيد (٤٠١/١).

[٢] أخرجه ابن ماجه في (سننه) (١٦٢٨).

عیلەتی دووەم: وتەی ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (إن الأنبياء يقبرون حيث يقبضون))[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (بەڵگەیە بۆ حیکمەتی شاردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی خۆی و نەشاردنەوەی لە گۆڕستان، ئەمە لەپێناو پارێزگاری کردن بووە لە عەقیدەی موسڵمانان بۆ ئەوەی زیادەڕەوی نەکە لە حەقی پێغەمبەر، وە ئەو کردەوەیە نەکەن ئەوەی گاور و جوولەکە کردیان لەلای گۆڕی پێغەمبەرەکان و پیاو چاکان، ئەمە ڕوون کردنەوەی حیکمەت بوو)[٢].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٢٤٨)

[٢] إعانة المستفيد (٤٠١/١-٤٠٢).

**ولمسلم عن جندب بن عبد الله قال: سمعت النبي (ﷺ) قبل أن يموت بخمس وهو يقول: (إني أبرأ إلى الله أن يكون لي منكم خليل، فإن الله قد اتخذني خليلاً، كما اتخذ إبراهيم خليلا، ولو كنت متخذا من أمتي خليلا، لاتخذت أبا بكر خليلا، ألا وإن من قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم مساجد، ألا فلا تتخذوا القبور مساجد، فإني أنهاكم عن ذلك).**

واتە : جوندوبی كوڕی عبدالله گوتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) پێنج شەو پێش مردن دەیفەرموو: (من خۆم لەوە بەدوور دەگرم كە یەكێک لە ئێوە بكەم بە خەلیلی خۆم، چونكە خوا منی كردووە بە خەلیلی خۆی، هەروەک چۆن ئیبراهیمی كردووە بە خەلیلی خۆی، وە ئەگەر لەناو ئومەتەكەم دا كەسێكم بكردایە بە خەلیلی خۆم ئەوە ئەبو بەكرم دەكرد بە خەلیلی خۆم, ئاگادار بن ئەوانی پێش ئێوە دەهاتن گۆڕی پێغەمبەرەكانیان دەكرد بە پەرستگا و شوێنی نوێژ و عیبادەت، جا بە تەئكید من ئەوەتان لێ قەدەغە دەكەم).

### ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(بخمس):** واتە: پێنج شەو.

**(أبرأ):** واتە: من بەریم و خۆم لەوە بەدوور دەگرم یەكێک لە ئێوە بكەم بە خەلیلی خۆم.

**(خليل):** گەورەترین جۆری خۆشەویستی یە.

### هۆكاری باسكردنی فەرموودەكە لەم بابە:

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسەبەی هێناوەی ئەم فەرموودەیە لەم بابە دیارە، ئەویش ئەوەیە حەرام كراوە گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكان بكرێتە مزگەوت، لەگەل ئەمەش عابد كەس ناپەرستێت ئیلا خوا نەبێت، چونكە وەسیلەیە بۆ شیركی گەورە،

وەسیلە سەر دەکێشێت بۆ شتی دوای خۆی، وە قاعیدەیەکی شەرعی هەیە هەموو زانایان لەسەر یەک دەنگن: داخستنی دەرگای تووش بوون بە شیرک یان حەڕام شتێکی واجبە، چونکە شەریعەت هاتووە بۆ داخستنی حەڕامەکان)[١].

**سـوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لەوە بەدوور گرتووە کەسێک بکاتە خەلیلی خۆی، چونکە دڵی پڕ بووە بە خۆشەویستی خوای گەورە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت دەفەرموویێت: (پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لەوە بەدوور گرتووە کەسێک بکاتە خەلیلی خۆی، چونکە دڵی پڕ بووە بە خۆشەویستی خوای گەورە)[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزلی پێغەمبەر (ﷺ) بەجۆرێک خوای گەورە پێغەمبەری کردۆتە خەلیلی خۆی هەروەک چۆن ئیبراهیمی کردۆتە خەلیلی خۆی[٣].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزلی ئیبراهیم، چونکە خوای گەورە کردوویەتی بە خەلیلی خۆی[٤].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزلی ئەبوبکر خوا لێی ڕازی بێت، کە باشترین هاوەڵە بە یەک دەنگی هەموو زانایان[٥].

---

[١] التمهید لاپەڕە (٢٥٣).
[٢] القول المفید.
[٣] القول المفید.
[٤] القول المفید.
[٥] التعلیق المفید.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (بەڵگەیە بۆ فەزلی ئەبو بکر، وە باشترینی هاوەڵان بووە، چونکە فەرموودەکە بەڵگەیە خۆشەویست ترین هاوەڵ بووە لای پێغەمبەر (ﷺ))[١].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ خۆ پاراستن لەوەی گۆڕ بکەیتە مزگەوت، مەنعی ئەمەی کردووە بە سێ ڕێگا:

١- زەمی ئەو کردەوەی کردووە کە کردوویانە.

٢- وتەی: (لا تتخذوا).

٣- وتەی: (فإني أنهاكم عن ذالك).

ئەمە مبالەغە کردنە لە نەهی کردن لەم بابەتە، چونکە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک هەروەک هاتۆتەدی ئێستا[٢].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (بەڵگەیە بۆ خۆ پاراستن لەوەی گۆڕ بکەیتە مزگەوت، لەبەر وتەی: (ألا فلا تتخذوا القبور مساجد) وە وتەی: (فإني أنهاكم عن ذالك))[٣].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر حەریسی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئوممەتەکەی بۆ ئەوەی دووریان بخاتەوە لە شیرک و هۆکارەکانی، چونکە مزگەوت دروستکردن لەسەر گۆڕ هۆکارە بۆ شیرک و تووش بوون بە شیرک، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) حەریس بووە

---

[١] القول المفيد.

[٢] التعليق المفيد.

[٣] القول المفيد.

لەسەر ئاگادار کردنەوەی ئومەتەکەی و ترساندنیان لەم کردەوەیە، ئەمە تەواوی سۆز و بەزەیی پێغەمبەرە (ﷺ) بە ئومەتەکەی[١].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک مردووێک بنێژێت لە مزگەوت، واجبە لەسەری دەری بهێنێت لە مزگەوت[٢].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەرکەسێک مزگەوت دروست بکات لەسەر گۆڕ، واجبە لەسەری مزگەوت بڕوخێنێت[٣].

**٩-** ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ خیلافەتی ئەبو بکر.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (پێغەمبەر (ﷺ) نەی گوت ئەبو بکر خەلیفەیە دوای من، بەڵکو فەرموویەتی : (لو كنت متخذا من أمتي خليلا، لأتخذت أبا بكر خليلا)، بەمە دەزانرێت لەپێش ترین کەس بۆ پێغەمبەر ئەبو بکر بووە، کەواتە لە هەموو کەسێک حەق ترە ببێتە جێ نیشینی[٤].

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی خۆشەویستی بۆ خوای گەورە.

**فقد نهى عنه في آخر حياته، ثم إنه لعن ـ وهو في السياق ـ من فعله، والصلاة عندها من ذلك، وإن لم يبن مسجد، وهو معنى قولها: خشي أن يتخذ مسجدا، فإن الصحابة لم**

---

[١] القول المفيد.

[٢] القول المفيد.

[٣] القول المفيد.

[٤] القول المفيد.

**يكونوا ليبنوا حول قبره مسجدا، وكل موضع قصدت الصلاة فيه فقد اتخذ مسجدا، بل كل موضع يصلى فيه يسمى مسجدا، كما قال (ﷺ): (جعلت لي الأرض مسجدا وطهورا).**

ابن تيمييە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ئەڵبەتە لە كۆتایی ژیانی دا نەهی لەو كارە كردووە، پاشان لەو فەرموودەیە نەفرەتی لەو كەسانە كردووە كە ئەو كارە دەكەن، وە نوێژ كردنیش لەپاڵ گۆڕ و گۆڕستان هەمان شتە، ئەگەر چی بینای مزگەوتیشی لەلای بنیات نەنرا بێت، ئەوەش مانای وتەی عائیشەیە كە فەرمووی: (دەترسا كە بكرێتە مزگەوت)، پاشان هاوەڵان هەرگیز كاری وایان نەدەكرد كە لە دەوری گۆڕەكە مزگەوتێ دروست بكەن، هەر شوێنێكیش نوێژی لێ بكرێت ناو دەبرێت بە مزگەوت، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (زەوی هەمووی بۆ من كراوە بە مزگەوت و پاككەرەوە).

**ولأحمد بسند جيد عن ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعا: (إن من شرار الناس من تدركهم الساعة وهم أحياء والذين يتخذون القبور مساجد) [رواه أبو حاتم في صحيحه].**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەدترینی خەڵكی ئەو كەسانەن كە قیامەتیان بە سەردا دێت، لە كاتێكدا زیندوون، وە ئەوانەش كە گۆڕەكان دەكەنە مزگەوت).

### ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(إن من شرار الناس):** من: للبعيض، شرار: مع شر.

### هۆكاری باسكردنی فەرموودەكە لەم بابە:

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە لەم بابە دیارە: باسی ئەوەی كردووە خراپترینی خەڵك ئەوانەن كە گۆڕەكان دەكەنە مزگەوت، مەبەست لە گۆڕ كردنە مزگەوت ئەوەیە عیبادەتی خوا بكات لە لای گۆڕی

پیاو چاکێک، ئەی دەبێت حالی ئەو کەسە چۆن بێت کە ڕوو لە پێغەمبەر دەکات بە عیبادەت)[١].

**سـوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەوانەی مزگەوت دروست دەکەن لەسەر گۆڕەکان خراپترینی خەڵکن.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەوانەی مزگەوت دروست دەکەن لەسەر گۆڕەکان خراپترینی خەڵکن، ئەوانەی ئەم کردەوەیە دەکەن خراپترینی خەڵکن، جا چ جوولەکە بن یان گاور یان خۆیان بدەنە پاڵ ئیسلام، کەس لەمانە خراپتر نییە پەنا بەخوا)[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە قیامەت هەڵناستێت لەسەر ئەهلی ئیمان، چونکە ئەهلی ئیمان باشترینی خەڵکن، خراپترینی خەڵک نین و قیامەت لەسەریان هەڵناستێت، بەڵکو پێش قیامەت دەمرن، ڕۆحیان دەکێشرێت هەروەک فەرموودە هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، خوای گەورە هەوایەک دەنێرێت پێش هاتنی قیامەت، ڕۆحی هەموو ئیماندارێکی ژن و پیاو دەکێشێت، کەس نامێنێت لەسەر ڕووی زەوی ئیلا کافر و خراپترینی خەڵک نەبێت، دێن و دەچن و ڕادەکەن وەک گوێ درێژ، چونکە هیچ دین و ڕەوشتیان نییە[٣].

---

[١] التمهيد لاپەڕە ٢٥٥.
[٢] إعانة المستفيد (٤١١/١).
[٣] إعانة المستفيد (٤١١/١).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت نوێژ ڕووەو گۆڕ و لەسەر گۆڕ بکەیت، لەبەر وتەی: (والذين يتخذون القبور مساجد)، ئەمە گشتی یە هەموو گۆڕ کردنە مزگەوتێک دەگرێتەوە، جا بەوە بێت نوێژی لەسەر بکات، یان نوێژی ڕووەو گۆڕ بکات، یان نوێژی لەلا بکات[1].

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٥٤).

## باب ما جاء أن الغلو في قبور الصالحين يصيرها أوثانا تعبد من دون الله

روى مالك في (الموطأ): أن رسول الله (ﷺ) قال: (اللهم لا تجعل قبري وثنا يعبد، اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد).[1]

ولابن جرير بسنده عن سفيان عن منصور عن مجاهد: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴾ [النجم: ١٩] قال: كان يلت لهم السويق فمات فعكفوا على قبره، وكذلك قال أبو الجوزاء عن ابن عباس: كان يلت السويق للحاج[2].

وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لعن رسول الله (ﷺ) زائرات القبور، والمتخذين عليها المساجد والسرج. [رواه أهل السنن][3].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الأوثان.

**الثانية:** تفسير العبادة.

**الثالثة:** أنه (ﷺ) لم يستعذ إلا مما يخاف وقوعه.

**الرابعة:** قرنه بهذا اتخاذ قبور الأنبياء مساجد.

---

[1] أخرجه مالك في "الموطأ" (١٧٢/١)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٧٥٠).

[2] تفسير ابن جرير (٥٨/٢٧-٥٩).

[3] أخرجه أبو داود (٣٢٣٦)، والترمذي (٣٢٠)، والنسائي (٢٠٤٣)، وأحمد (٢٢٩/١)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (٢٢٥).

**الخامسة:** ذكر شدة الغضب من الله.

**السادسة:** وهي من أهمها – معرفة صفة عبادة اللات التي هي من أكبر الأوثان.

**السابعة:** معرفة أنه قبر رجل صالح.

**الثامنة:** أنه اسم صاحب القبر، وذكر معنى التسمية.

**التاسعة:** لعنه زوارات القبور.

**العاشرة:** لعنه من أسرجها.

## باب ما جاء أن الغلو في قبور الصالحين

## يصيرها أوثانا تعبد من دون الله

## باسی زیادەڕەوی کردن لەبارەی پیاو چاکانەوە سەرەنجام دەیان کات به (بت) بەجۆرێک دەبێتە عیبادەت کردن بۆ بێجگە لەخوا.

ئەم بابە پەیوەندی بە بابی پێشترەوە هەبوو، ئەویش ئەوەیە باسی زیادەڕەوی کردن دەکات لەبارەی پیاو چاکانەوە کە لەسەرەنجام دا دەیان کات بە (بت) و بەجۆرێک دەبێتە عیبادەت کردن بۆ بێجگە لەخوا, ماناکەی ئەوەیە زیادەڕەوی کردن وایان لێ دەکات ئەو گۆڕانە یان خاوەنی گۆڕەکان بپەرستن.

(غلو): زیادەڕەوی کردنە جا لە مەدح کردن بێت یان زەم کردن، لێرە مەبەست پێی زیادەڕەوی کردنە لە مەدح، گۆڕەکان حەقیان بەسەر ئێمەوە هەیە لە دوو ڕووەوە:

١- نابێت کەمتەرخەمی بنوێنین لەوەی واجبە ڕێزیان بگرین، نابێت ئیهانەیان بکەین و لەسەریان دابنیشین، هەروەها شتی تری وەک ئەمانە.

٢- نابێت زیادەڕەویان تێیدا بکەین و سنور ببەزێنین.

**روى مالك في (الموطأ): أن رسول الله (ﷺ) قال: (اللهم لا تجعل قبري وثنا يعبد، اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد).**

واتە: ئیمام مالک ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوایە گۆڕەکەم نەکەیت بە بتێک و بپەرسترێت، غەزەبی خوا توندە بەسەر قەومێکەوە کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە پەرستگا).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(في الموطأ):** کتبێکی بەناوبانگە، یەکێکە لە صحیح ترین کتابەکان، چونکە سەنەدی بەرزترە لە سەندی بوخاری لەبەر نزیکی لە پێغەمبەر (ﷺ)، لەگەڵ فەرموودە ئاثاری هاوەڵانیشی هێناوەتەوە، زۆر لە زانایان ئەم کتابەیان ڕاڤە کردووە، لەوانە:

١- (التمهيد) ابن عبدالبر.

٢- (المنتقى) أبو الوليد الباجى.

٣- (شرح الموطأ مالك) للزرقانى.

٤- (أوجز المسالك إلى موطأ مالك) كندهلوى.

٥- (تنوير الحوالك) سيوطى.

باشترین شەرحی موطأ و فراوانترین شەرح شەرحی (ابن عبدالبر)ە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، واتە کتابی التمهید.

**(وثنا):** واتە: هەر شتێک بپەرسترێت بێجگە لەخوا، جا دار بێت یان بەرد یان گۆڕ یان هەر شتێکی تر.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە چونکە زیادەڕەوی کردن لە گۆڕی پێغەمبەران دەبێتە (وثن) و دەپەرسترێت، یەکێک لە جۆرەکانی زیادەڕەوی کردن مزگەوت دروستکردنە لەسەر گۆڕ.

**سوودەکانی ئـەم فەرموودەیە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زیادەڕەوی کردن لە گۆڕی پێغەمبەران دەبێتە (وثن) و دەپەرسترێت بێجگە لەخوا، یەکێک لە جۆرەکانی زیادەڕەوی کردن مزگەوت دروستکردنە لەسەر گۆڕ.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (زیادەڕەوی کردن لە گۆڕی پێغەمبەران دەبێتە (وثن) و دەپەرسترێت، بە بەڵگەی وتەی: (اللهم لا تجعل قبری وثنا یعبد).

یەکێک لە جۆرەکانی زیادەڕەوی کردن مزگەوت دروستکردنە لەسەر گۆڕ، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)، واتە: دەیکەن بە شوێنی نوێژ کردن بە ئومێدی قبول بوون)[1].

**٢-** خوای گەورە گۆڕی پێغەمبەری (ﷺ) پاراست و وەڵامی دوعاکەی دایەوە، هەروەها پاراستی لە زیادەڕەوی کردن تیایدا، گۆڕەکەی دەورەدا بە دیوار کە ڕێگرە لەوەی خەڵکی پێی بگەن، تەنانەت ڕێگرە لە بینین و پێگەیشتنیش، هەموو ئەمانە لەبەر ئەوە بوو تاوەکو زیادەڕەوی تێدا مەنع بکرێت[2].

[1] إعانة المستفيد (٤٢٣/١).
[2] إعانة المستفيد (٤١٥/١).

**٣-** ئەم فەرموودەیە ڕوون و ئاشکرایە کە گۆڕ دەکرێتە وەثەن، خوراڤییەکان دەڵێن: گۆڕەکان ناکرێت ببنە وەثەن، وەثەن تەنها هی سەردەمی نەزانینە[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن: بینا دروست کردن لەسەر گۆڕی پیاوچاکان لە خۆشەویستی پیاوچاکانە و دەڵێن ئێوە بینایە دروست ناکەن لەسەر گۆڕی پیاوچاکان، چونکە ئێوە ڕقتان لێ دەبێتەوە)[2].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی تۆڕە بوون بۆ خوای گەورە، وەک تۆڕە بوونی دروستکراوەکان نییە نە لە حەقیقەت و نە لە پاشماوە، هەندێک ئەهلی تأویل دەڵێن: تۆڕە بوونی خوا واتە تۆلە سەندنەوە لەو کەسەی سەرپێچی کردووە، هەندێکی تر دەڵێن: ویستنی تۆلە سەندنەوەیە لەو کەسەی سەرپێچی کردووە.

ئەمەش گۆڕینی وشەیە لە شوێنی خۆی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرموو: (انتقم الله)، بەڵکو فەرمووی: (اشتد غضب الله).

جیاوازی نێوان تووڕەبوونی خوای گەورە و دروستکراوەکان:

١- تووڕە بوونی دروستکراوەکان کوڵانی خوێنی دڵە، پەڵێکی ئاگرە شەیتان دەیخاتە ناو دڵی مرۆڤ تاوەکو تۆڕە ببێت، بەڵام تۆڕە بوونی خوای گەورە سیفەتێکە وەک هی دروستکراوەکان نییە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١]

٢- تووڕەبوونی نەوەی ئادەم دەرئەنجامی خراپی بەدوادا دێت، مرۆڤ کاتێک تووڕە دەبێت ئەو شتەی ڕوودەدات و بەدەست دێت شتێکی سوپاس نەکراوە، کەسی وا هەیە

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٦٠).

[2] إعانة المستفيد (٤٢٣/١).

به سەبەب تۆڕە بوونەکەی کەسێک دەکوژێت، پیاو هەیە خێزانی خۆی تەڵاق دەدات، یان قاپ و قاچاغ دەشکێنێت و شتی تری وەک ئەمانە، بەڵام تۆڕە بوونی خوای گەورە ئیلا دەرئەنجامی باشی بەدوادا دێت، چونکە حەکیمە و هەموو شتەکانی لەجێگای خۆیەتی)[1].

عبدالله بن جار الله دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی تۆڕە بوون بۆ خوای گەورە)[2].

---

[1] القول المفيد.

[2] الجامع الفريد لاپەڕە (٨٧).

**ولابن جرير بسنده عن سفيان عن منصور عن مجاهد: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴿١٩﴾﴾ [النجم: ١٩] قال: كان يلت لهم السويق فمات فعكفوا على قبره، وكذلك قال أبو الجوزاء عن ابن عباس: كان يلت السويق للحاج**[1].

واتە: ابن جرير دەگێڕێتەوە لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴿١٩﴾﴾ کە موجاهد گوتی: لات پیاو چاکێک بووە، جۆرە خواردنێکی بەخورما دروست دەکرد و دەیدا بە حاجیانی ماڵی خوا، پاشان مرد، دەچوون لەسەر گۆڕەکەی دەمانەوە.

هەروەها ئەبو جەوزا دەڵێت: عبدالله بن عباس خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەڵێت: لات پیاوێک بووە خورما و ڕۆنی بە ئاردی جۆوە بۆ حاجیان دروست دەکرد.

### ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:

**(عن سفيان):** یان سوفیانی کوڕی ثەوری یە، یان سوفیانی کوڕی عویەینەیە، خاوەنی تيسر العزيز الحميد دەڵێت: ئەوەی دیار بێت سوفیانی ثەوری یە.

**(السويق):** خورما و ڕۆنی بە ئاردی جۆوە بۆ حاجیان دروست دەکرد.

### هۆی باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرەی باسکردووە چونکە مانەوە لای گۆڕی بووە هۆی پەرستنی.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم ئەثەرە دیارە: باشی ئەم پیاوە بووە هۆی ئەوەی زیادەڕەوی بکەن لە گۆڕەکەی، هەروەک دەفەرمووێت:

---

[1] تفسير ابن جرير (٢٧/٥٨-٥٩).

(فعكفوا على قبره)، مانەوە لە لای گۆڕەکەی بووە هۆی پەرستنی، عکوف ماناکەی: مانەوەیە لەلای گۆڕ بەهۆی بەگەورە دانانی، وە بیروباوەڕی بەرەکەت و پاداشت و سوودی هەیە، وە لاچوونی زیان بەهۆی مانەوەیە لەلای ، ئەمە مانای عکوفە)[١].

**سوودەکانی ئـــەم ئەثەرە:**

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە مانەوە لە لای گۆڕی پیاوچاکان دەبێتە وەثەن و دەپەرسترێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مانەوە لای گۆڕی پیاوچاکان دەبێتە وەثەن و دەپەرسترێت، هەروەک ئەمە ڕوویدا لە لات و بوە وەثەن و پەرسترا بەهۆی مانەوە لە لای گۆڕەکە، هەروەک شیرک لە قەومی نوح هاتەدی بەهۆی زیادەڕەوی کردن لە مافی پیاوچاکان، سیاسەتی شەیتان یەک سیاسەتە بۆ پێشینەکان و پاشینەکان، بۆ خەڵک دێت لە دەرگای زیادەڕەوی کردن لە پیاوچاکان)[٢].

---

[١] التمهيد لاپەڕە ٢٦١.

[٢] إعانة المستفيد (٤٢٣/١).

**وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لعن رسول الله (ﷺ) زائرات القبور، والمتخذين عليها المساجد والسرج. [رواه أهل السنن].**

واتە: ابن عباس خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت دەفەرموویێت: (پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لەو ژنانە كردووە كە سەردانی گۆڕستان دەكەن، لەوانەش كە پەرستگا و مزگەوتی لەسەر دروست دەكەن، لەوانەش كە چرا و ڕوناكی لەسەر قەبران دادەگیرسێنن).

**ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:**

**(لعن):** واتە: دوعای لێكردووە بە نەفرەت.

**(زائرات القبور):** واتە: ئەو ئافرەتانەی سەردانی گۆڕەكان دەكەن.

**هۆكاری باسكردنی فەرموودەكە لەم بابە:**

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هۆكاری هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە لەم بابە: مزگەوت دروست كردن لەسەر گۆڕ و چرا داگیرساندن زیادەڕەوی كردنە و سەردەكێشێت بۆ عیبادەت كردنی)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپاێزێت دەفەرموویێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە لەم بابە دیارە بەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لەوانە كردووە كە پەرستگا و مزگەوت لەسەر گۆڕ دروست دەكەن، لەوانەش كە چرا و ڕوناكی لەسەر قەبران دادەگیرسێنن، سەبارەت بە گۆڕ كردنە مزگەوت پێشتر باسمان كرد، سەبارەت بە نەفرەت كردن لەوانە كە چرا و

---

[1] القول المفيد.

ڕوناكی لەسەر قەبران دادەگیرسێنن، چونكە هۆكارە بۆ بەگەورە دانانی ئەو گۆڕانە، وە جۆرێكە لە جۆرەكانی زیادەڕەوی كردن و سەردەكێشێت بۆ پەرستنیان)[١].

**سـوودەكانی ئەم فەرموودەیە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ حەرامی ڕۆناک کردنەوەی گۆڕستان بە ڕۆناکی بە هەر هۆکارێک، جا بە چرا بێت یان کارەبا یان هۆکاری تر، هەموو ئەم جۆرە ڕوناک کردنەوانە بەگوێرەی کاتەکان قەدەغە کراون، واجب ئەوەیە دەبێت گۆڕەکان بەتاڵ بن لە ڕوناکی، چونکە ڕوناکی هۆکارە بۆ کردن بە وەثەن، پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لەوانە کردووە کە ئەم کردەوەیە دەکەن، چونکە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک[٢].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر ڕۆناک کردنەوەکە بۆ سوودی خەڵک بێت لە کاتی مردوو شاردنەوە یان لەسەر پەرژینی دیوارەکە بێت هیچی تێدا نییە، بەڵام دانانی چرا لەسەر گۆڕ دروست نییە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لەو ژنانە کردووە کە سەردانی گۆڕستان دەکەن، لەوانەش کە پەرستگا و مزگەوتی لەسەر دروست دەکەن، لەوانەش کە چرا و ڕوناکی لەسەر قەبران دادەگیرسێنن، ئەگەر ڕوناکی لە شەقام بێت و تێپەڕن بە لایدا هیچی تێدا نییە، ئەگەر چرا دابگیرسێنن لە کاتی پێویستی و شاردنەوە یان چرا لەگەڵ خۆیان بهێنن بۆ ئەم مەبەستە هیچی تێدا نییە)[٣].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٢٦١-٢٦٢).

[٢] إعانة المستفيد (٤٢٤/١).

[٣] مجموع فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز (٢٤٤/١٣).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە گۆڕ بکەیتە مزگەوت، جا مزگەوتی لەسەر دروست بکەیت یان نوێژ ڕووەو گۆڕ بکەیت یان نوێژ لەسەر گۆڕ بکەیت و بیکەیتە شوێنی سوجدە بردن.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە ئافرەت سەردانی گۆڕستان بکات، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان لەسەر ئەم بابەتە:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون حەڕامە ئافرەت سەردانی گۆڕستان بکات، هیچ جیاوازی نییە لەنێوان گۆڕی پێغەمبەر و گۆڕەکانی تر، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و هەندێک لە مالکی و شافعی و حەنەفی یە، هەروەها وتەی ابن تیمیە و ابن القیم و ئیمام النووی و ابن عثیمینە.

دووەم: هەندێک زانای تر بۆ ئەوە چوون ڕێگەپێدراوە بێ کەڕاهەت، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و وتەی زۆربەی حەنەفی و مالکی یەکانە.

سێیەم: هەندێک زانای تر بۆ ئەوە چوون سەردانی ئافرەت بۆ گۆڕستان باش نییە، کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و وتەی زۆربەی شافعی یەکانە، وە وتەی هەندێک حەنەفی و مالکی یە.

پوختەی وتەی زانایان:

١- نابێت ئافرەت زۆر سەردانی گۆڕستان بکات و سنور ببەزێنێت، چونکە بەر نەفرەت دەکەوێت.

٢- زۆربەی زانایان دەڵێن باش نییە یان حەڕامە ئافرەت سەردانی گۆڕستان بکات، باشتر وایە ئافرەت خۆی بپارێزێت.

**٣-** زۆرینەی ئەوانەی سەردانی گۆڕستان دەکەن و تووشی فیتنە و سەرپێچی دەبن ئافرەتن، دەبێت ئافرەت تەقوای خوا بکات و پابەند بێت بە دین.

## باب ما جاء في حماية المصطفى (ﷺ) جناب التوحيد وسده كل طريق يوصل إلى الشرك

وقول الله تعالى: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [التوبة: ١٢٨]

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا تجعلوا بيوتكم قبورا، ولا تجعلوا قبري عيدا، وصلوا علي، فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم) رواه أبو داود بإسناد حسن، ورواته ثقات[١].

وعن علي بن الحسين: أنه رأى رجلا يجيء إلى فرجة كانت عند قبر النبي (ﷺ)، فيدخل فيها فيدعو، فنهاه، وقال: ألا أحدثكم حديثا سمعته من أبي عن جدي عن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تتخذوا قبري عيدا، ولا بيوتكم قبورا، وصلوا علي فإن تسليمكم يبلغني أينما كنتم). [رواه في المختارة][٢].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية براءة.

**الثانية:** إبعاده أمته عن هذا الحمى غاية البعد.

---

[١] أخرجه أبو داود (٢٠٤٢)، ومن طريقه البيهقي في "شعب الإيمان" (٤٩١/٣ رقم ٤١٦٢)، وأحمد (٣٦٧/٢)، وصححه الألباني في "تحذير الساجد" لاپەڕە ٩٧.

[٢] أخرجه أبو داود (٢٠٤٢)،وأحمد (٣٦٧/٢).وصححه الألباني في "تحذير الساجد" لاپەڕە ٩٧.

**الثالثة:** ذكر حرصه علينا ورأفته ورحمته.

**الرابعة:** نهيه عن زيارة قبره على وجه مخصوص مع أن زيارته من أفضل الأعمال.

**الخامسة:** نهيه عن الإكثار من الزيارة.

**السادسة:** حثه على النافلة في البيت.

**السابعة:** أنه متقرر عندهم أنه لا يصلى في المقبرة.

**الثامنة:** تعليله ذلك بأن صلاة الرجل وسلامه عليه يبلغه وإن بعد، فلا حاجة إلى ما يتوهمه من أراد القرب.

**التاسعة:** كونه (ﷺ) في البرزخ تعرض أعمال أمته في الصلاة والسلام عليه.

# باب ما جاء في حماية المصطفى (ﷺ) جناب التوحيد وسده كل طريق يوصل إلى الشرك

## پێغەمبەر خودی تەوحیدی پاراستووە هەر ڕێگایەكیش بەرەو شیرك بڕوات دایخستووە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (لات سەیر نەبێت دانەری كتاب ئەم بابانەی یەك بەدوای هێناوەتەوە، چونكە ئەم بابەتە گەورەیە، شیرك تووشی ئەم ئوممەتە بووە بەهۆی فیتنەی گۆڕ و زیادەڕەوی كردن تێیدا لە حەقی پیاوچاكان و پێغەمبەران، شیرك لەم ئوممەتە هاتۆتەدی بەهۆی ئەم شتانە و لەو كاتەوەی كە مزگەوت لەسەر گۆڕ دروستكراوە و لەو كاتەی تەسەوف بەدیاركەوتووە، ئیلا ئەوە نەبێت كە خوای گەورە ڕەحمی پێ كردبێت، كارەكە زۆر زۆر ترسانەكە، لەبەر ئەوە دانەری كتاب دووبارەی كردۆتەوە چونكە نەخۆشی یەكە تووشی ئەم ئوممەتە بووە و دەبێت زانایان خەڵك ئاگادار بكەنەوە كە ئەمە مەترسی یەكی توندە و دەبێت هەستن بە چارەسەر كردنی و بانگەواز بۆ تەوحید بكەن و شیرك نەفی بكەن لەم ئوممەتە، چونكە ئەگەر زانایان بێ دەنگ بن كارەكە ترسناك تر دەبێت و جەهل زیاتر دەبێت)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (٤٢٥/١).

**وقول الله تعالى:** ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ [التوبة: ١٢٨]

واته: سوێند بەخوا پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە کە لە خۆتانە، بەلایەوە سەختە هەر شتێک کە ئێوە بخاتە نارەحەتیەوە، سوورە لەسەرهیدایەتی ئێوە و قازانجی ئێوە لە دونیا و ئاخیرەت، بەرامبەر ئیمانداران بە بەزەیی و بە ڕەحمە، جا ئەگەر پشتیان لەم شەریعەتە کرد تۆش بڵێ بەسمە خوا پشت و پەنام بێ، هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق جگە لەو، تەنها پشتم بەو بەستوە و هەر ئەو خاوەنی عەرشی گەورەیە.

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ﴾: نفس مەبەست پێی جنسە، واتە: لە جنۆکە و فریشتە نییە، بەڵکو لە جنسی خۆتانە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (﴿حَرِيصٌ عَلَيۡكُم﴾ حەریسی پێغەمبەرە (ﷺ) بەسەر ئێمەوە، وە گرانی لەسەر پێغەمبەر لەوەی تووشی بارگرانیمان بکات، بەمە لایەنی تەوحیدی پاراستووە و هەموو ئەو ڕێگایانەشی داخستووە کە هۆکارن بۆ تووش بوون بە شیرک، ئەمە ڕووی کردنە بەڵگەیە لەم بابە)[1].

### سوودەکانی ئەم ئایەتە:

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ هەندێک لە سیفەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش ئەمانەن:

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٢٦٥).

١- رسول من أنفسكم.

٢- عزيز عليه ما عنتم.

٣- حريص عليكم.

٤- بالمؤمنين رءوف.

٥- رحيم.

**٢-** پێغەمبەر (ﷺ) حەریس بووە لەسەر ئەوەی ئوممەتەکەی تووشی ناخۆشی و بەهیلاك چوون نەبێت، کەواتە هەموو ئەو ڕێگایانەی باسکردووە و دایخستووە بۆ ئەوەی مرۆڤ تووشی شیرك نەبێت.

**٣-** بانگخواز دەبێت سوور بێت لەسەر ئەوە ئوممەت تووشی شیرك نەبێت، دەبێت بانگەواز بۆ تەوحید بکات و هەموو ئەو ڕێگایانەی مرۆڤ تووشی شیرك دەبێت بۆ خەڵك باس بکات.

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا تجعلوا بيوتكم قبورا، ولا تجعلوا قبري عيدا، وصلوا علي، فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم) رواه أبو داود بإسناد حسن، ورواته ثقات[1].**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێ ی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، گۆڕیشم مەکەن بە شوێنی کۆبوونەوە و یادەوەری، لە هەر شوێنێک بوون سەلاواتم لەسەر بدەن، چونکە سەلاواتدانی ئێوە لەسەر من لە هەر کوێ بن پێم دەگات).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(بيوتكم):** جمعی (بيت)، شوێنی نیشتەجێ بوونە، جا لە قوڕ یان بەرد یان دار یان خێمە دروستکرا بێت.

**(لا تجعلوا بيوتكم قبورا):** زانایان دەڵێن دوو مانای هەیە:

١- ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕ، واتە: مردوو مەشارنەوە لە ماڵەکانتان، بەڵکو لە گۆڕستان بینێژن.

٢- ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕ، واتە: ماڵەکانتان وەک گۆڕ لێ مەکەن و نوێژی تێدا بکەن، چونکە گۆڕستان نوێژی تێدا ناکرێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

---

[1] أخرجه أبو داود (٢٠٤٢)، ومن طريقه البيهقي في "شعب الإيمان" (٤٩١/٣ رقم ٤١٦٢)، وأحمد (٣٦٧/٢)، وصححه الألباني في "تحذير الساجد" لاپەڕە ٩٧.

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) لایەنی تەوحیدی پاراستووە و هەموو ئەو ڕێگایانەی داخستووە کە مرۆڤ تووشی شیرک دەبێت پێی، نابێت گۆڕ بکەیتە عید و مزگەوت و شوێنی نوێژ، چونکە سەر دەکێشێت بۆ تووش بوون بە شیرک.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە گرینگی بەماڵەوە بدرێت و ئاوەدانی بکەیتەوە بە نوێژ و زیکر و دوعا و قورئان خوێندنەوە، حەڕامە هەجری ماڵ بکەیت لە عیبادەت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت نوێژ لە گۆڕستان بکرێت، نوێژ کردن ڕووەو گۆڕ یان لەناو گۆڕستان ئەم پێنج حاڵەتانەن:

حاڵەتی یەکەم: کەسێک نوێژ ڕووەو گۆڕ دەکات و بۆ خاوەنی گۆڕ نوێژ دەکات، ئەمەیان شیرکی گەورەیە، چونکە نوێژ عیبادەتە، عیبادەت کردن بۆ بێجگە لەخوا شیرکە.

حاڵەتی دووەم: نوێژی جنازە لەسەر مردوو دەکەی ڕووەو گۆڕ دوای شاردنەوەی ئەمەیان دروستە، بەڵگە:

عن عبدالله بن عباس رضى الله عنهما: أن النبي (ﷺ) صلى على قبر بعد ما دفن، فكبر عليه أربعا[1].

واتە: لە ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر گۆڕ کردووە دوای شاردنەوەی مردوو و چوار "الله أكبر"ی لەسەر کردوە.

---

[1] متفق عليه.

حاڵەتی سێیەم: نوێژی مردوو لەناو گۆڕستان نوێژی لەسەر دەکەن پێش شاردنەوەی چونکە نوێژی لە مزگەوت لەسەر نەکراوە ئەمەیان دروستە، بەڵگە:

١- ئەگەر دروست بێت نوێژی جنازە ڕووەو گۆڕ بکەی نوێژی جنازە لەناو گۆڕستان لەپێش ترە دروست بێت.

٢- عن ابي مرثد الغنوي قال: سمعت رسول الله (ﷺ) قال: (لاتصلوا الى القبور، و لاتجلسوا عليها)[١]. واتە: ڕووەو گۆڕ نوێژ مەکەن و لەسەریشی دامەنیشن.

ئەم فەرموودەیە باسی نوێژێکە کە ڕکوع و سوجدەی تێدا بێت نەک نوێژی جەنازە، هەروەها ڕێگری کردنەکەشی لەبەر ئەوەیە خۆ چوواندنە بە گۆڕ پەرستان و سەردەکێشیت بۆ پەرستنی گۆڕ، واتە شیرک.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروستە نوێژ لەسەر مردوو بکرێت لەناو گۆڕستان هەروەک چۆن دروستە نوێژ لەسەر مردوو بکرێت دوای شاردنەوەی)[٢].

حاڵەتی چوارەم: نوێژ لەناو گۆڕستان دەکات بێجگە لە نوێژی جەنازە، جا نوێژەکە واجب بێت یان سوننەت, ئەوە ئەو نوێژە بەتاڵ و پوچە، بەڵگە:

١- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (الارض كلها مسجد إلا المقبرة و الحمام)[٣].

واتە: (زەوی هەمووی مزگەوتە تەنها گۆڕستان و حەمام نەبێت).

---

[١] رواه مسلم (٩٧٢).
[٢] مجموعه الفتاوى (٣٩٢/٨).
[٣] رواه الترمذى (٣١٧)، ابن ماجه (٧٤٥).

٢- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[١].

واتە: نەفرەتی خوا لە جولەکە و گاورەکان بێت گۆڕی پێغەمبەر و پیاو چاکانی خۆیانیان کردە مزگەوت.

٣- هەروەها خۆ چوواندنە بە موشریکەکان و وە سەردەکێشیت بۆ تووش بوون بە شیرک.

حاڵەتی پێنجەم: نوێژ دەکەی ڕووەو گۆڕستان لە دەرەوی گۆڕستان ئەگەر بەربەست یان پەرژین یان جیاکەرەوە نەبوو ئەوا حەڕامە، بەڵگە:

١- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: نوێژ ڕووەو گۆڕ مەکەن.

بەڵام ئەگەر دیوار هەبێت یان شارع (شەقام) هەبێت یان دوور بێت دروستە نوێژ ڕووەوە گۆڕستان بکرێت.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ڕێگایانەی داخستوە کە هۆکارن بۆ تووش بوون بە شیرک.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە سەلاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدەیت لەهەر کوێیەک بیت، خەڵکانێک کاتێک دەچن بۆ حەج یان عومرە خەڵکانێکی تر پێیان دەڵێن سەلاممان بگەینە بە بەپێغەمبەر (ﷺ)، ئەم کردەوەیە دروست نییە و داهێنراوە، هاوەڵان و سێ سەدەی زێڕین ئەمەیان نەکردوە، بەڵکو خاوەن ژیری موسڵمانیش ئەمەی نەکردوە، چونکە موسڵمان لەهەر شوێنێک بێت سەلام لەپێغەمبەر (ﷺ) دەکات، کەواتە لەهەرشوێنێک بێت سەلام دەگات بە پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵگە:

---

[١] رواه البخاري (٤٣٥)، مسلم (٥٢٩).

١- عن ابى هريرة رضى الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لاتجعلوا بيتوكم قبورا، ولاتجعلوا قبرى عيدا، وصلوا على فإن صلاتكم تبلغنى حيث كنتم)[١].

واتە: ماڵەکانتان مەکەن بەگۆڕستان، گۆڕەکەشم مەکەن بەشوێنی کۆبونەوە و یادەوەری لە هەر شوێنێک بوون صەڵەواتم لەسەر لێ بدەن، چونکە صەڵەواتی ئێوە بەمن دەگات لە هەر کوێ بن.

روایەت هاتووە دەفەرمووێت: (فإن تسليمكم يبلغنى أين كنتم) [٢].

واتە: بەدڵنیایەوە سەلامی ئێوە بەمن دەگات، ئێوە لەهەرکوێیەک بن.

٢- عن عبداللّه بن مسعود قال: قال رسول الله (ﷺ): (إن لله ملائكة سياحين في الارض يبلغوني من أمتي السلام)[٣].

واتە: لە عبدالله بن مسعود دەگێرنەوە خوا لێ ی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە فریشتەی هەیە لەناو زەوی سەلامی ئوممەتی من دەگەیەنن بەمن).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لەگەڵ ئەمەش ئێمە دەڵێین تۆ ئەگەر سەلام بکەیت لەوسەری دونیا سەلامت پێی دەگات، چونکە خوای گەورە فریشتەی داناوە لەزەوی ئەگەر یەکێك سەلام لە پێغەمبەر بکات نقل دەکرێت بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، ئێمە کاتێك دەڵێین: (اللهم صل وسلم على رسول الله) سەلامی ئێمەی بۆ نقل دەکرێت و لە

---

[١] رواه ابوداود.
[٢] أخرجه ابو يعلى (٤٦٩).
[٣] رواه النسائي (١٢٨٢).

ناو نوێژ دەڵێ ی: (السلام عليك أيها النبى ورحمه الله وبركاته) سەلامی بۆ نقل دەكرێت.

گوێم لە هەندێک خەڵک بوە لە مەدینە دەڵێن: باوكم وەسیەتی كردووم كە سەلام لە پێغەمبەر (ﷺ) بكەم، دەڵێت سەلامی من لە پێغەمبەر (ﷺ) بكە، ئەمە هەڵەیە پێغەمبەر (ﷺ) زیندوو نیە هەتا سەلامی زیندووی بۆ نقل بكەیت، پاشان ئەگەر باوكت سەلام لە پێغەمبەر بكات ئەوا سەلامی باوكت نقل دەكرێت بە یەكێكی لە تۆ بەتواناتر بۆ گەیاندن و بەهێزتر كە فریشتەكانن.

كەواتە ئەمە پێویست ناكات و ئێمە دەڵێین تۆ لە هەر شوێنێک بیت لە سەر زەوی بڵێ: (السلام عليك ايها النبى)، سەلامت بە خێراتر و باشتر پێ دەگات لە ئەمە)[١].

زانایانی الجنة الدائمة دەڵێن: (كەسێک سەلامی كەسێكی تر بگەیێنێتە پێغەمبەر (ﷺ) یان مردوویێكی تر ڕێگە پێدراو نییە بەڵكو داهێنراوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەموو داهێنراوێک گومڕاییە وهەموو گومڕاییەكیش بۆ ناو ئاگرە).

واجبە ئەم كردەوەیە تەرك بكرێت و ئەوانیش ئاگادار بكرێنەوە كە تووشی بووینە پێی بلێن نابێت، فەزڵی خوای گەورەیە لەسەر ئێمە كە سەلامی ئێمە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی دەگات لەهەر كوێ بین لە ڕۆژهەڵاتی زەوی بین یا روزئاوا)[٢].

---

[١] مجموعه فتاوى ابن عثيمين (٢٣/٤١٦-٤١٧).

[٢] فتاوى الجنة الدائمة (١٦/٢٩-٣٠).

**وعن علي بن الحسين: أنه رأى رجلا يجيء إلى فرجة كانت عند قبر النبي (ﷺ)، فيدخل فيها فيدعو، فنهاه، وقال: ألا أحدثكم حديثا سمعته من أبي عن جدي عن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تتخذوا قبري عيدا، ولا بيوتكم قبورا، وصلوا علي فإن تسليمكم يبلغني أينما كنتم). [رواه في المختارة].**

واته: عەلی کوڕی حوسەین ناسراوە بە زین العابدین پیاوێکی دەبینی کە زوو زوو دەهات سەری دەکرد بە پەنجەرەیەکدا و لای گۆڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دوعای دەکرد، زین العابدینیش نەهی لێکرد و گوتی: ئایا حەدیسێکت بۆ بگێڕمەوە کە باوکم بۆ منی گێڕاوەتەوە و ئەویش لە باپیرەم عەلی بیستوویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (گۆڕەکەم مەکەن بە"عید"واتە: شوێنی کۆبوونەوە و یادەوەری، ماڵەکانیشتان مەکەن بە گۆڕستان، سەلاواتم لێ بدەن لە هەر شوێنێک بوون، چونکە ئێوە لە هەر کوێ بن سەلامەکەتان پێم دەگات).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(عن علي بن الحسين):** ناوی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالبە، بە (زین العابدین) بەناوبانگە.

**(فرجة):** واتە: کونێک لەدیوار.

**(وصلوا علي، فإن تسليمكم يبلغني أينما كنتم):** ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دەقەکە بەم شێوەیەیە، من بەگومانم لە صحیحی ئەم دەقە، چونکە وتەی:

(صلوا علي) دەبوایا تەواوکەری بیگوتبا: فإن صلاتکم تبلغني، ئیلا ئەوە نەبێت بڵێیت ئەمە لە بابی الطی و النشرە، ماناکەی: صلوا علي وسلموا، فإن تسلیمکم و صلاتکم تبلغني)[١].

**(وصلوا علي):** واتە: لە هەر کوێ بیت دروستە صەلاواتی لێ بدەیت، پێویست ناکات بچیتە لای گۆڕەکەی بۆ سەلام و سەلاوات لێدان.

**(رواه في المختارة):** مختارە: ناوی کتابێکە دانەرەکەی عبدالله بن محمد بن عبدالواحد المقدسی یە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) لایەنی تەوحید وهەموو ئەو ڕێگایانەشی داخستووە کە مرۆڤ بەرەو شیرک دەبەن، نەهی کردووە گۆڕی بکرێتە عید و مزگەوت، کەواتە گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاکان لەپێشترە لەوەی نابێت بیکەیتە عید و مزگەوت، چونکە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک.

### سوودەکان ئەم فەرموودەیە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە فەرمان بە چاکە بکەیت و نەهی لە خراپە بکەیت، وە دەبێت نەزان فێربکرێت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بۆ بۆ هاندانی کردنی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە[٢].

---

[١] القول المفید (٥٧٩/١-٥٨٠).

[٢] الجامع الفرید لاپەڕە (٩١).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سەلاوات و سەلامی ئێمە بە پێغەمبەر دەگات ئەگەر چی ئێمە چەند دووریش بین لە گۆڕی پێغەمبەر[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی کراوە لە سەردان کردنی گۆڕی پێغەمبەر بە شێوەیەکی تایبەت[٢].

زانایان دەڵێن تایبەت کردنی ڕۆژی جەژن بۆ سەردانی گۆڕستان داهێنراوە، بەڵگە:

١- عن أبي هُرَيرَة رَضِيَ اللهُ عنه قال: قال رسولُ الله (ﷺ): (لا تَجْعَلوا بُيوتَكم قُبورًا ولا تَجْعَلوا قبري عِيدًا).

تایبەت کردنی سەردانی گۆڕستان هەموو ساڵێك داخلی کردنە جەژن دەبێت.

پرسیار لە "ابن باز" کراوە ئایا تایبەت کردنی هەردوو جەژن بۆ سەردانی گۆڕستان هیچ ئەصلی هەیە؟

لە وەڵام دا دەفەرمووێت: (نەم زانیوە هیچ ئەصلی هەبێت، بەڵکو سوننەتە سەردانی گۆڕستان بکەیت هەر کاتێک بۆی ڕێک کەوت و ئاسان بوو)[٣].

هەروەها دەفەرمووێت: (بناء دروست کردن لەسەر گۆڕ و تایبەت کردنی ڕۆژێکی دیاری کراو بۆ سەردانی گۆڕستان و کردنە جەژن شتێکی خراپە)[٤].

---

[١] الجامع الفريد لاپەرە (٩١).
[٢] الجامع الفريد لاپەرە (٩١).
[٣] مجموع فتاوى ابن باز (٣٣٧/١٣).
[٤] فتاوى نور على الدرب (٢٦٢/٢).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (تايبەت كردن هەينی و جەژن هيچ ئەصلی نييە لە سوننەت، تايبەت كردنی سەردانی گۆڕستان لە ڕۆژی جەژن و باوەڕی وابێت ڕێگەپێدراوە، ئەوا بە داهێنراو حساب دەكرێت، چونكە جێگير نەبووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، نەم زانيووە هيچ لە ئەهلی عيلم ئەمەيان گوتبێت)[١].

[١] مجموع فتاوى ورسائل العثيمين (٢٨٧/١٧).

## باب ما جاء أن بعض هذه الأمة يعبد الأوثان

**وقول الله تعالى:** ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ {النساء:٥١}.

**وقوله تعالى:** ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللّهِ مَن لَّعَنَهُ اللّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ﴾ {المائدة:٦٠}.

**وقوله تعالى:** ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾ {الكهف:٢١}.

**عن أبي سعيد رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لتتبعن سنن من كان قبلكم حذو القذة بالقذة، حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه) قالوا: يا رسول الله، اليهود والنصارى؟ قال: (فمن)؟ أخرجاه[١].**

**ولمسلم عن ثوبان رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (إن الله زوى لي الأرض، فرأيت مشارقها ومغاربها، وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوي لي منها، وأعطيت الكنزين: الأحمر والأبيض، وإني سألت ربي لأمتي أن لا يهلكها بسنة بعامة، وأن لا يسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم، وإن ربي قال: يا محمد إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد وإني أعطيتك لأمتك ألا أهلكهم بسنة بعامة وألا أسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم، ولو اجتمع عليهم من بأقطارها حتى يكون بعضهم يهلك بعضا ويسبي بعضهم بعضا)[٢].**

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٤٥٦)، ومسلم (٢٦٦٩).

[٢] أخرجه مسلم (٢٨٨٩).

**ورواه البرقاني في صحيحه، وزاد: (وإنما أخاف على أمتي الأئمة المضلين، وإذا وقع عليهم السيف لم يرفع إلى يوم القيامة، ولا تقوم الساعة حتى يلحق حي من أمتي بالمشركين، وحتى تعبد فئة من أمتي الأوثان، وإنه سيكون في أمتي كذابون ثلاثون، كلهم يزعم أنه نبي، وأنا خاتم النبيين، لا نبي بعدي. ولا تزال طائفة من أمتي على الحق منصورة لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله تبارك وتعالى)[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية النساء.

**الثانية:** تفسير آية المائدة.

**الثالثة:** تفسير آية الكهف.

**الرابعة:** وهي أهمها: ما معنى الإيمان بالجبت والطاغوت في هذا الموضع؟: هل هو اعتقاد قلب، أو هو موافقة أصحابها مع بغضها ومعرفة بطلانها؟.

**الخامسة:** قولهم إن الكفار الذين يعرفون كفرهم أهدى سبيلا من المؤمنين.

**السادسة:** وهي المقصود بالترجمة أن هذا لا بد أن يوجد في هذه الأمة، كما تقرر في حديث أبي سعيد.

**السابعة:** التصريح بوقوعها، أعني عبادة الأوثان في هذه الأمة في جموع كثيرة.

---

[1] أخرجه أبو داود (٤٢٥٢)، وابن ماجه (٣٩٥٢)، وأحمد (٢٧٨،٢٨٤/٥)، وصححه الألباني في "الصحيحة (٢٥٢/٤).

**الثامنة:** العجب العجاب خروج من يدعي النبوة، مثل المختار، مع تكلمه بالشهادتين وتصريحه بأنه من هذه الأمة، وأن الرسول حق، وأن القرآن حق وفيه أن محمدا خاتم النبيين، ومع هذا يصدق في هذا كله مع التضاد الواضح. وقد خرج المختار في آخر عصر الصحابة، وتبعه فئام كثيرة.

**التاسعة:** البشارة بأن الحق لا يزول بالكلية كما زال فيما مضى، بل لا تزال عليه طائفة.

**العاشرة:** الآية العظمى أنهم مع قلتهم لا يضرهم من خذلهم ولا من خالفهم.

**الحادية عشرة:** أن ذلك الشرط إلى قيام الساعة .

**الثانية عشرة:** ما فيه من الآيات العظيمة، منها: إخباره بأن الله زوى له المشارق والمغارب، وأخبر بمعنى ذلك فوقع كما أخبر، بخلاف الجنوب والشمال، وإخباره بأنه أعطي الكنزين، وإخباره بإجابة دعوته لأمته في الاثنتين، وإخباره بأنه منع الثالثة، وإخباره بوقوع السيف، وأنه لا يرفع إذا وقع، وإخباره بإهلاك بعضهم بعضا وسبي بعضهم بعضا، وخوفه على أمته من الأئمة المضلين، وإخباره بظهور المتنبئين في هذه الأمة، وإخباره ببقاء الطائفة المنصورة. وكل هذا وقع كما أخبر، مع أن كل واحدة منها أبعد ما يكون من العقول.

**الثالثة عشرة:** حصر الخوف على أمته من الأئمة المضلين.

**الرابعة عشرة:** التنبيه على معنى عبادة الأوثان.

## باب ما جاء أن بعض هذه الأمة يعبد الأوثان

## بەڵگەی قورئان و سوننەت لەسەر ئەوەی کە هەندێک لەم ئومەتە غەیری خوا دەپەرستن

(أن بعض هذه الأمة): واتە: هەمووی نا، ئوممەت هەمووی لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە سوپاس بۆ خوا، بەڵکو هەندێکیان لەسەر حەق دەمێننەوە، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (ولا تزال طائفة من أمتي على الحق منصورة لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله تبارك وتعالى)، ئەم ئومەتە لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە بەڵکو زۆریان گۆمڕا دەبن، بەڵام هەندێک لەم ئوممەتە لەسەر حەق دەمێننەوە هەتا نزیک قیامەت، ئەمەش فەزڵ و ڕەحمی خوای گەورەیە.

لەبەر ئەوە دانەری کتاب ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرمووی: (أن بعض هذه الأمة)، ئەمەش لە وردی تێگەیشتنی دانەری کتابە پەلەی نەکردووە لە ئەحکامەکان بە پێچەوانەی ئەوانەی عمومی ئومەت کافر دەکەن، هەروەک چۆن دانەری هەندێک کتابی سەردەم لەسەر ئەمەن ...

مەبەستی دانەری کتاب لەم بابە: لەبەر ئەوە ئەم بابەی باس کردوە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەوانە بداتەوە کە دەڵێن ئەم ئوممەتە تووشی شیرک نابێت، ئەویش ئەوانەن کە عیبادەتی گۆڕەکان دەکەن و دەڵێن: ئەوەی ئێمە دەیکەین شیرک نییە، چونکە ئوممەت تووشی

شیرک نابێت بەڵکو ئەمە لە بابی توسل کردن یان خۆشەویستیە بۆ پیاو چاکان، یان عوزری تری پووچ دەهێننەوە)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (واتە: باسکردنی ئایەت و فەرموودە لەسەر ئەوەی ئەم ئوممەتە معصوم نییە لە تووش بوون بە شیرک، هەروەک چۆن خەڵک بە کۆمەڵ کۆمەڵ داخلی دین بوون ئاواش دەردەچن لە دین هەروەک چۆن هەڵگەڕانەوە لە سەردەمی ئەبوبەکر ڕوویدا)[٢].

گۆڕ پەرستەکان چەند شوبهەیەکیان لەلایە و دەڵێن ئەم ئوممەتە تووشی شیرک نابێت، لەوانە:

**شوبهەی یەکەم:** عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (والله ما أخاف عليكم أن تشركوا بعدي، ولكن أخاف عليكم أن تنافسوا فيها)[٣].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (سوێند بەخوا من لە ئێوە ناترسم تووشی شیرک ببن، بەڵکو لەوە لێتان دەترسم منافسەی یەکتر بکەن لەسەر دونیا و شوێن دونیا بکەون).

پێغەمبەر (ﷺ) لە شیرک نەترساوە لە ئومەتی خۆی، بەڵگەیە ئەم ئوممەتە تووشی شیرک نابێت.

---

[١] إعانة المستفيد (٤٤٥/١).

[٢] التعليق المفيد.

[٣] رواه البخاري ( ١٣٤٤)، ومسلم (٢٢٩٦).

زانایان سێ وەڵامیان هەیە سەبارەت بەم گومانە:

١- مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە ئێوە هەموو پێکەوە تووشی شیرک نابن، چونکە ئەم ئوممەتە معصومە لەوەی هەموویان پێکەوە تووشی شیرک بن.

ابن حجر العسقلانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (واتە ئێوە هەموو پێکەوە تووشی شیرک نابن، چونکە شیرک لە هەندێکتان ڕوویداوە و تووشی بوونە)[1].

٢- فەرموودەکە باسی هاوەڵانی پێغەمبەرە (ﷺ)، واتە هاوەڵان تووشی شیرک نابن.

ابن حجر العسقلانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (هاوەڵان تووشی شیرک نابن دوای ئەو)[2].

٣- لەوانەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی گوتبێ پێش ئەوەی بزانێت ئەم ئومەتە تووشی شیرک دەبێت و خوای گەورە وەحی بۆ ناردبێت بەوەی کە کۆمەڵێک لەم ئوممەتە گومڕا دەبن و شەریک بۆ خوا دادەنێن.

**شوبهەی دووەم:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لا يجتمع دينان في جزيرة العرب).

لەم فەرموودەیە نەفی دوو ئاینی کردووە لە جزیرەی عەرەب، بەڵگەیە تووشی شیرک نابن.

زانایان سەبارەت بەم گومانە دەڵێن:

---

[1] فتح الباری (٢١١/٣).
[2] فتح الباری (٦١٤/٦).

١- زانایانی فەرموودە بەم شێوەیە ئەم فەرموودەیەیان تەفسیر نەکردووە، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە نەهی کراوە لەوەی دوو ئاین جێگیر ببن لە جزیرەی عەرەب، چۆن دەکرێت بە نەفی تەفسیر بکەیت لەگەڵ ئەوەی چەند ئایینێک لە جزیرەی عەرەب هەبووە.

٢- ئەگەر فەرموودەکە بە نەفی تەفسیر بکەیت ئەوا واقعت بەدرۆ خستۆتەوە، چونکە چەند ئاینێک هەن لە جزیرەی عەرەب.

٣- چەندین ڕیوایەتی ڕوون و ئاشکرا هاتوون مەبەست پێی نەهی یە نەک نەفی، لەوانە:

أ- عن عمر بن الخطاب أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول: (لأخرجن اليهود والنصارى من جزيرة العرب)[1].

ب- عن ابن عباس: في حديث طويل قال (ﷺ): (أخرجوا المشركين من جزيرة العرب)[2].

شوبهەی سێیەم: عن جار رضى الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (إن الشيطان قد أيس أن يعبده المصلون في جزيرة العرب، ولكن في التحريش بينهم)[3].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شەیتان بێ ئومێد دەبێت لەوەی نوێژەکەرەکان بیپەرستن و بێ ئومێد دەبێت لەوەی تووشی شیرکیان بکات.

---

[1] رواه مسلم (١٧٦٧).
[2] رواه البخاري (٣٠٥٣)، ومسلم (١٦٣٧).
[3] رواه مسلم (٢٨١٢).

هەروەها ڕیوایەتی ابن مسعود – رضي الله عنه:- (إن الشيطان قد يئس أن تعبد الأصنام بأرض العرب، ولكن رضي منهم بما دون ذلك بالمحقرات وهي الموبقات)[1].

زانایان سەبارەت بەم گومانە دەڵێن:

١- شەیتان لە نەفسی خۆیدا بێ ئومێد بووە کە بیپەرستن، شەیتان غەیب نازانێت و سوورە لەسەر گومڕا کردنی خەڵک، هەروەک دەڵێت: ﴿لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ٦٢﴾ [الإسراء: ٦٢]، خۆی بێ ئومێد بووە بەڵام خوای گەورە بێ ئومێدی نەکردووە و هەڵی پێداوە، شەیتان بێ ئومێد بوو کاتێک عیزەتی ئیسلام و بەدیارکەوتنی تەوحیدی بینی لە جزیرەی عەرەب، بەڵام خوای گەورە بێ ئومێدی نەکردووە.

٢- هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون ماناکەی ئەوەیە شەیتان بێ ئومید بووە لەوەی هەموویان پێکەوە لەسەر کوفر کۆ بکاتەوە و تووشی کوفری گەورەیان بکات، کە ئەمە وتەی ابن ڕەجەبە[2].

٣- هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون لەوانەیە مەبەست پێی سێ سەدەی زێڕین بێت ئەوان تووشی شیرک نابن، چونکە وشەی: (المصلون)، (ال) للعهد.

٤- لەوانەیە مەبەست پێی ئەوە بێت شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی لە هەموو کات و شوێنێک بێجگە لە خوا بپەرسترێت، واتە لە هەموو کات و هەموو شوێنێک تووشی شیرک نابن، دەکرێت لە هەندێک کات یان هەندێک شوێن تووشی شیرک ببن.

---

[1] رواه الحاكم (٣٢/٢)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (٥٢/٦) (٧٤٧١). قال الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي، وصححه لغيره الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) (٢٢٢١).

[2] مجموعة الرسائل والمسائل النجدية (٤٨٢/٤-٤٨٦).

٥- لەوانەیە مەبەست پێی ئەوە بێت شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی موسڵمانان شەیتان بپەرستن، دەکرێت تووشی پەرستنی پێغەمبەر و پیاو چاک و گۆڕ و شتی تر ببن.

٦- لەوانەیە مەبەست پێی ئەوە بێت شەیتان بێ ئومێد بووە لە موسڵمانانی ڕاستگۆ کە تووشی شیرک نابن.

**شوبهەی چوارەم:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من یرد الله به خیرا یفقهه في الدین، وإنما أنا قاسم والله یعطي، ولا یزال أمر هذه الأمة مستقیما حتی تقوم الساعة).

پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە ئەم ئوممەتە بەردەوام لەسەر ڕێگای ڕاست دەمێنێتەوە هەتا نزیک قیامەت، ئەمەش بەڵگەیە تووشی شیرک نابن.

زانایان سەبارەت بەم گومانە دەڵێن ئەم فەرموودەیە بە چەند ڕیوایەتێک هاتووە، هەندێک ڕیوایەت هەندێکی تر تەفسیر دەکەن، مەبەست پێی کۆمەڵەیەک لە ئوممەتی من بەردەوام لەسەر حەق دەمێننەوە هەتا نزیک قیامەت.

ڕیوایەت هاتوە دەفەرمووێت کۆمەڵەیەک لە ئوممەتی من: (لا تزال طائفة من أمتي ظاهرین حتی یأتیهم أمر الله وهم ظاهرون)[1].

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەندێک لەم ئوممەتە لەسەر حەق دەمێننەوە هەتا هەتایی)[2].

---

[1] رواه البخاري (٧٣١١)، ومسلم (١٩٢١) من حدیث المغیرة بن شعبة رضي الله عنه.

[2] فتح الباری (١٦٤/١).

**وقول الله تعالى:** ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾﴾ [النساء: ٥١]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (تۆ سەیری ئەوانە ناکەیت کە بەشێک لە کتابیان پێدراوە ئیمانیان هێناوە بە جبت و تاغوت، لەبارەی کافرەکانەوە دەڵێن: ڕێباز و دینی ئەوان ڕاسترە و باشترە لەوانەی کە ئیمانیان هێناوە بە ئیسلام).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿أَلَمْ تَرَ﴾: استفهام لێرە للتقرير و التعجب، خطاب یان بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) یان بۆ هەموو کەسێکە کە ئاراستەی بکرێت.

﴿إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ﴾: واتە: أعطوا، کتاب بە هەمووان نەدراوە، چونکە بێ بەش بوونە لە کتاب بەهۆی تاوانەکانیان، زانستی تەواویان نییە بە کتاب.

﴿نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾: کتاب مەبەست پێی تەورات و ئینجیلە.

﴿يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾: الجبت: وتراوه: سیحره، وتراوه: پەیکەر، ئەوەی ڕاست بێت پەیکەر و سیحر و کاهن و شتی تر دەگرێتەوە.

﴿هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا﴾: واتە: ئەو موشریکانە مەنهەجیان باشتر و ڕاست ترە لە ڕێگای ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

ڕووی هێنانەوەی ئەم ئایەتە لەم بابە دیار نییە مەگەر بە فەرموودە، ئەویش ئەم فەرموودەیە: (لترکبن سنن من کان قبلکم)، ئەوانەی کتابیان پێدراوە ئیمانیان هێنا بە جبت و تاغوت، ئەم ئوممەتەش شوێن ئوممەتەکانی پێشتر دەکەون و ئیمان بە جبت و تاغوت دەهێنن، کەواتە ئایەت ڕێک مطابقە لەگەڵ بابەکە[1].

صال الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم ئایەتە لەم بابە ئەوەیە: ئەگەر لەناو جوولەکە هەبێت ئیمانی بە جبت و تاغوت هێنا بێت ئەوا ئەم ئوممەتەش هەمان شت دەکەن و خۆیان دەچووێنن بە ئەوان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە لەوەی ئەم ئوممەتە خۆیان دەچوێنن بە گاور و جولەکەکان، لەوانە خۆ چواندن بە ئیمان هێنان بە جبت و تاغوت)[2].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەیە جوولەکە بە موشریکەکانیان گوت ئێوە باشترن لە محمد (ﷺ) و ڕێگاکەتان باشترە.

---

[1] القول المفید (٥٨٨/١).
[2] إعانة المستفید (٤٤٧/١-٤٤٨).

ابن الجوزی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (سەبارەت بە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە چوار وتە هەیە:

١- کۆمەڵێک جولەکە هاتنە لای قورەیش و پرسیاریان لێکردن: دینی ئێمە باشترە یان دینی محمد (ﷺ)؟ جولەکەکان وتیان دینی ئێوە باشترە، ئایەت دابەزی، ئەمە وتەی ابن عباسە.

٢- کەعبی کوڕی ئەشرەف و حەی کوڕی ئەخطەب هاتنە مەککە، قورەیش بە هەردووکیانی گوت ئێمە باشترین یان محمد (ﷺ)؟ گوتیان: ئێوە، ئایەت دابەزی، ئەمە وتەی عیکریمەیە.

٣- کەعبی کوڕی ئەشرەف بە قورەیشی گوت: ئێوە باشترن و ڕێگاتان چاکترە لە ڕێگای محمد (ﷺ)، ئایەت دابەزی، ئەمە وتەی (مجاهد) و (سودی) و وتەیەکە لە وتەکانی عیکریمە.

٤- حەی کوڕی ئەخطاب بە موشریکەکانی گوت: ئێمە و ئێوە باشترین لە محمد (ﷺ)، ئەم ئایەتە دابەزی، کە ئەمە وتەی ابن زیدە)[1].

**٢-** ئینکاری و سەر سوڕمانی حاڵی ئەوانەی کە بەشێک لە کتێبی ئاسمانی پێدراوە (کەچی لەگەڵ ئەوەشدا) باوەڕیان بەفاڵچی و جادووگەر و بت و پەیکەر و شەیتان هەیە، هەروەها ئەهلی کوفر بە باشتر دادەنێن لە ئەهلی ئیمان، لەبەر وتەی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا﴾.

---

(١) زاد المسير (٢/٦٤-٦٥).

**٣-** سەرپێچی کردنی جولەکەکان لەسەر زانست بووە، دەبوایا ئیمانیان بهێنایا، چونکە کتێبی خوای گەورە لەبەر دەستیان بووە.

**٤-** ئەسلی سیحر وەریگراوە لە جولەکەکان، لەبەر وتەی: ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ﴾، لەبەر ئەوە سیحریان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ)، (لبيد بن الأعصم) سیحرێکی لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد بە سیحرێکی گەورە، بەڵام خوای گەورە پێغەمبەری پاراست لەو سیحرەی کە ئەوان دەیانەویست کاری تێ بکەن[1].

**٥-** سنور بەزاندن و وازهێنان لە حەق دوای زانست لە تایبەتمەندییەکانی جولەکەکانە، لەبەر وتەی: ﴿وَالطَّاغُوتِ﴾.

**٦-** هەر کەسێک سیحر بکات و ئیمانی پێی هەبێت و سنور ببەزێنێت، ئەوە سیفەتی جولەکەی تێدایە (تووشی کوفر بووە).

**٧-** ڕوونکردنەوەی خراپی کردەوەی جولەکەکان، بەجۆرێک خوای گەورە کتابی پێداون لەگەڵ ئەمەش بە موشریکەکان دەڵێن ئێوە باشترن و ڕێگاتان ڕاستترە لە ئیمانداران.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ڕوونکردنەوەی خراپی کردەوەی جولەکەکان، بەجۆرێک خوای گەورە کتابی پێداون لەگەڵ ئەمەش بە موشریکەکان دەڵێن ئێوە باشترن و ڕێگاتان ڕاستترە لە ئیمانداران، ئەوەی زانراو بێت ئەوەی حوکم بکات پێچەوانەی ئەو شتەی بزانێت خراپترە لەوەی نەزانێت، هەردووکیان خراپن بەڵام یەکەمیان توندترە)[2].

**٨-** ڕوونکردنەوەی ڕق و کینەی جولەکەکان بەرامبەر ئیمانداران.

**٩-** جولەکەکان ئەهلی حەسادەتن، چونکە لە نەفسی خۆیان دەزانن (محمد) باشترە و ڕێگای ڕاستترە لە موشریکەکان، لەگەڵ ئەمەش ئیمان ناهێنن و بە خراپە وەسفی دەکەن.

---

(١) تفسير سورة النساء (٤١٢/١).

(٢) تفسير سورة النساء (٤١١/١).

**١٠-** حەڕامە كافر بە باشتر دابنێیت لە موسڵمان، لەبەر وتەی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا﴾.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە موافقە لە (ظاهر)دا پێی دەڵێن ئیمان ئەگەر چی لە دڵدا موافقیان نەبێت، چونکە جولەکەکان کاتێک بە قورەیشیان گوت: ئێوە باشترن و ڕێگاتان چاکترە لە ڕێگای ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەوان لە ناخی خۆیاندا باوەڕیان وابوو ئەم وتەیە پووچە، بەڵام ئەوان ئەمەیان گوت بۆ ئەوەی پشتیان بگرن، لەگەڵ ئەمەش خوای گەورە ناوی ناوە بەوە ئیمانی هێناوە بە جبت و تاغوت.

ئەوەی مەدحی کوفر و کافرەکان دەکات تەنها بە زمانی خۆی، کافر لە ئیمانداران بە باشتر دادەنێت، ئەوە ئەو کەسە ئیمانی هێناوە بە جبت و تاغوت، ئەگەر چی لە دڵدا موافقی ئەوان نەبێت ئەگەر زۆری لێ نەکرابێت، ئەمە وەڵامیشە بۆ مورجیئەکانی سەردەم ئەوانەی دەڵێن: هەرکەسێک قسە بکات بە قسەی کوفر، کافر نابێت تا بە دڵی ئەو قسەی پێ ڕاست نەبێت)[1].

**١٠-** واجبە ئینکاری جبت و تاغوت بکرێت، چونکە خوای گەورە ئیمان هێنانی بە جبت و تاغوت وەک سەرسوڕمان و زەم باسیکردووە.

ئەگەر لەناو جولەکە هەبێت ئیمانی بە جبت و تاغوت هێنا بێت، ئەوە ئەم ئوممەتەش هەمان شت دەکەن و خۆیان دەچووێنن بە ئەوان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە بەوە ئەم ئوممەتە خۆیان دەچوێنن بە گاور و جولەکەکان و شوێنی ڕێبازیان دەکەون.

(١) إعانة المستفيد (٤٥٣/١).

**١١-** باسکردنی عەیبەکانی کەسی گومڕا و وەڵامیش بۆ ئەوانەی دەڵێن دەبێت چاکەکانی باس بکەیت و نابێت وەڵامی بدەیتەوە.

**١٢-** ڕق و کینە و حەسوودی وا لەمرۆڤ دەکات ستەم بکات و لابدات لە حوکم، هەروەک چۆن جولەکە کافریان بە باشتر دانا بەسەر ئیمانداران، دەبێت مرۆڤ خۆی بپارێزێت.

**وقوله تعالى:** ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللّهِ مَن لَّعَنَهُ اللّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ﴾ {المائدة:٦٠}.

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت: (ئەی پێغەمبەر بەوانە بڵێ کە تانە لە دینەکەتان دەدەن: ئایا خەبەرتان پێ بدەم بەوەی کە پاداشتی خراپترە لەوەی کە گومان دەبەن بەسەر ئێمەدا بێت، ئەوانەن کە خوا نەفرەتی لێ کردوون و غەزەبی لێ گرتوون و هەرگیز لێیان ڕازی نابێت، هەروەها خوای گەورە هەندێکی لەوان کردە مەیموون و بەراز و ئەوانەشی کە دەستیان دایە تاغوت پەرستی).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ﴾: واتە: پێیان بڵێ ئەی محمد: ئایا هەواڵتان بدەمێ، خطاب بۆ ئەهلی کتابە، واتە هەواڵ بە ئەهلی کتاب بدە.

﴿مَنْ لَعَنَهُ اللَّهُ﴾: ئەوانەی خوا نەفرەتیان لێکردووە جولەکە و گاورەکانن، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ﴿٧٨﴾﴾ [المائدة: ٧٨].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە ئەم ئومەتەش شوێن ئەهلی کتاب دەکەون و عیبادەتی بێجگە لەخوا دەکەن.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەهلی کتاب عیبادەتی تاغوتیان کردووە، لەبەر وتەی: ﴿وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ﴾، واتە: داوایان لە بێجگە لەخوا کردووە، یان ئاژەڵیان سەربڕیوە بۆ بێجگە لەخوا، یان نەزریان کردووە بۆ بێجگە لەخوا، ئەم ئوممەتەش شوێن ئەوان دەکەون و عیبادەتی تاغووت دەکەن.
ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن ئەم ئوممەتە تووشی شیرک نابێت، چونکە فەرموودەکە بەڵگەیە هەندێک خۆیان دەچووێنن بە گاور و جولەکە لە عیبادەتی تاغوت و گۆڕ، وە حوکم بە بێجگە لە حوکمی خوا دەکەن[1]

**٢-** مەسخ ڕوویداوە لە ئوممەتەکانی پێشوو، لەبەر وتەی: ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ﴾.
**٣-** وەڵام بۆ ئەوانەی دەڵێن دەبێت باسی چاکەی کۆمەڵی گومڕابوو بکەیت لە بیدعەچییەکان و کەسانی تر، چونکە خوای گەورە باسی عەیبەکانی کرد باسی هیچ چاکەیانی نەکرد.

---

(١) إعانة المستفيد (٤٥٣/١).

٤- عیبرەت لە پلە و پاداشت و قەدر لەلای خوای گەورەیە نەک خەڵکی، لەبەر وتەی: ﴿مَثُوبَةً عِنْدَ اللَّهِ﴾، لەسەر ئەمە مرۆڤ نابێت سەیری پلەی خۆی بکات لەلای خەڵک، بەڵکو دەبێت سەیری پلەی خۆی بکات لەلای خوا.

٥- جێگیرکردنی سیفەتی غەزەب بۆ خوای گەورە، لەبەر وتەی: ﴿مَنْ لَعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ﴾.

٦- پاداشت لە جنسی کردەوەیە، لەبەر ئەوە کران بە مەیمون چونکە لە شێوەی مرۆڤە، لەبەر وتەی: ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ﴾.

ئەمانە سزادران بە (جنس)ی کردەوەی خۆیان، چونکە ئەم فێڵەیان کرد وایان دەرخست شێوەیان شێوەیەکی ڕێگەپێدراوە، کەچی لە ڕاستیدا حەڕام بوو، ئەمانە سزا دران بەوەی بوون بە مەیموون کە وەک شێوەی مرۆڤە و مرۆڤیش نییە، پاداشت لە (جنس)ی کردەوەیان بوو، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ [الشورى: ٤٠]، هەروەها خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ﴾ [العنكبوت: ٤٠].

ابن کثیر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (کاتێک جولەکەکان ئەمەیان کرد خوای گەورە شێوەیان کرد بە شێوەی مەیموون، لە ڕووکەشدا وەک مرۆڤ وایە، بەڵام لە حەقیقەتدا مرۆڤ نییە، کردەوەی ئەوان و فێڵیان وەک ڕاستییە لە ڕووکەشدا، لە ناخەوەش باطلە، پاداشتان لە جنسی کردەوەکەیانە)[١]

٧- عیبادەتی تاغوت کردن، هەر شتێک بپەرسترێت جگە لەخوا تاغوتە.

٨- ئەوانە خراپترین جێگە و ڕێگەیان هەیە و گومڕاترین کەسن لە ڕێبازی ڕاست و دروست، لەبەر وتەی: ﴿أُولَئِكَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضَلُّ عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ﴾.

---

(١) تفسير ابن كثير (١/١٥٠).

**وقوله تعالى:** ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾ {الكهف:٢١}.

واته: خوای گەورە دەفەرمووێت: (ئەوانەی کاربەدەست بوون وتیان: با مزگەوت لەسەر گۆڕەکانیان دروست بکەنین).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾: سەبارەت بەمە وتەی ڕاست ئەوەیە ئەوانەی سەرپەرشتی گۆڕەکانیان دەکرد کاربەدەست بوون.

صالح آل الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان کێ بوون ئەوانەی سەرپەرشتی گۆڕی ئەشکەوتەکەیان دەکرد:

هەندێک دەڵێن: موسڵمانان بوون، موسڵمانانی ئەو کاتە تووشی بە گەورە دانانی هاوەڵانی ئەشکەوت بوون، وتیان: ﴿ٱبْنُواْ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا﴾، وتیان: ﴿لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾.

وتەی دووەم: ئەوانەی سەرپەرشتی گۆڕەکانیان دەکرد موشریک بوون، واتە ئەوانەی شوێن بیروباوەڕی جاهلی کەوتبوون و لەبەر ئەوە لە دڵیان شیرک و بیدعە هەبوو پێچەوانەی پێغەمبەرەکانیان کرد و گوتیان: ﴿لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾.

وتەی سێیەم: کە ابن کثیر و چەندین زانا بە ڕاستیان داناوە ئەوەیە ئەوانەی سەرپەرشتی گۆڕەکانیان دەکرد گەورە و کاربەدەستەکان بوون)[١].

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە: ئەمانە مزگەوتیان دروستکرد لەسەر گۆڕ، ئەم ئوممەتەش مزگەوت دروست دەکەن لەسەر گۆڕەکان وەک خۆ چووان بە کافرەکان، ئەمەش ڕوویداوە لە واقع، لەم ئوممەتە مزگەوت دروستکراوە لەسەر گۆڕەکان ئەمەش بەڵگەیە شیرک لەم ئوممەتە ڕوویداوە هەروەک چۆن لە ئوممەتەکانی پێشتر ڕوویداوە بە ڕێگای خۆ چوواندن)[٢].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

١- چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت دەلالەت لەسەر تەواوی توانا و حیکمەتی خوای گەورە دەکات[٣].

٢ - دەسەڵاتی ئەهلی شیرک بەسەر کاروبارياندا، وتیان: بێگومان مزگەوتێکیان بەسەرەوە دروست دەکەین (کە ئەمەش شتێکی داهێنراو بوو لە ئایینی گاوریدا کە لەسەر گۆڕی پیاو چاکان پەرستگایان دروست دەکرد)، لەبەر وتەی: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا﴾.

---

(١) التمهيد لاپەڕە (٢٧٧).

(٢) إعانة المستفيد (٤٤٩/١).

(٣) القول المفيد (٥٩٦/١-٥٩٧).

زیادەڕەوی کردن لە گۆڕدا سەر دەکێشێت بۆ شتی گەورەتر، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک عەلی نارد پێی فەرموو: (أن لا تدع قبرا مشرفا إلا سويته)، واتە: (هیچ گۆڕێکی بەرز مەهێڵەوە مەگەر ڕاستی بکەیت)[١].

**عن أبي سعيد رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لتتبعن سنن من كان قبلكم حذو القذة بالقذة، حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه) قالوا: يا رسول الله، اليهود والنصارى؟ قال: (فمن؟) أخرجاه.**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەخوا شوێن ڕێگەی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون هەروەک چۆن پەڕی تیرێک لە پەڕەکەی دیکە دەچێت"واتە: ڕێک وەک ئەوان دەکەن"، هەتا ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بە کونی بزنمژە دا (ضب: ئاژەڵێکە درێژی یەکەی نزیکەی ٧٥سم و پانییەکەی ٢٠ سم دەبێت)، ئەوا ئێوەش خۆتانی پێدا دەکەن)، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت جوولەکە و گاورەکانە ؟ فەرمووی: (ئەی جا کێ؟).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لتتبعن):** لام لامی سوێند خواردنە، ئەم ڕستەیە تەئکید کراوە بە سێ ئەدەواتی تەوکید، سوێندی مقدر و لامی سوێند و نونی تەوکید، تقديرەکەی: (والله لتتبعن).

**(سنن):** واتە: ڕێگا.

[١] القول المفيد (٥٩٦/١-٥٩٧).

**(لتتبعن سنن من كان قبلكم):** ئەم فەرموودەیە لەسەر ظاهري خۆی نییە، هەموو ئوممەت شوێنی سوننەتی پێش خۆیان ناکەون، بەڵکو ئەم عامە تایبەت کراوە، چونکە لەم ئوممەتە کۆمەڵێک هەن شوێنی جوولەکە و گاورەکان ناکەون و بەردەوام لەسەر حەقن هەتا قیامەت.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە چونکە ئەم ئوممەتە تووشی پەیکەر پەرستن دەبێ، چونکە شوێن ڕێگای پێشینەکان دەکەون، پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە بەوەی ئێمە شوێن ئەوان دەکەوین)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خۆ چوواندن بە جوولەکە و گاورەکان حەڕامە، چونکە فەرموودەکە ماناکەی نەهی و ئینکاری کردنە لەو کەسەی شوێنیان دەکەوێت[2].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ موعجیزەیەک لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، بەجۆرێک خەبەری داوە ئەم ئوممەتە تووشی خۆ چوواندن دەبێت بە جوولەکە و گاورەکان، خۆچوواندن ڕویدا هەروەک چۆن خەبەری دا[3].

---

[1] القول المفيد (٦٠٣/١-٦٠٥).

[2] إعانة المستفيد (٤٥٤/١).

[3] إعانة المستفيد (٤٥٤/١).

**٣-** ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی موسڵمان سەرپێچی یەکانی ئەهلی کتاب بزانێت بۆ ئەوەی تووشی نەبێت، ئەمە لە قورئان و سوننەت باسکراوە نموونە لەسەر هەندێک لە سەرپێچیەکانیان:

١- دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان و بەگەورە دانانیان.

٢- وەسف کردنی خوای گەورە بە عەیب و نقص، وەک ئەوەی گوتیان خوای گەورە هەژارە، یان خوای گەورە ماندوو بوو کاتێک ئاسمان زەوی دروست کرد.

٣- خواردنی ماڵی حەڕام و ڕیبا.

٤- گۆڕینی وتەی خوای گەورە بە وشە و مانا، نموونە: خوای گەورە فەرمانی پێیان کرد بڵێن: ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُولُواْ حِطَّةٞ﴾ [البقرة: ٥٨]، ئەوان داخلی بوون لەسەر پشتی سەر، وە گوتیان: حنطة لە جیاتی حطة.

موسڵمان تووشی هەمان شت بووە ئەوەی جوولەکە تووشی بوون، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ٥﴾ [طه: ٥]، کۆمەڵێک لە موسڵمانان دەڵێن: الرحمان على العرش استولى.

ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: لام لە وشەی استولى ئەهلی تحریف زیادیان کردوە، هەروەک چۆن گاورەکان نونیان زیاد کرد لە وشەی (حطة) وتیان: (حنطة).

**٤-** ئەم فەرموودەیە چەند ماوە درێژ بێت لەنێوان مرۆڤ و ڕیسالە ئەوە دوورتر دەبێت لە حەق، چونکە خەبەری داوە بۆ داهاتوو نەک خەبەری دابێت بۆ ئەو کات[1].

---

[1] القول المفيد.

**ولمسلم عن ثوبان رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (إن الله زوى لي الأرض، فرأيت مشارقها ومغاربها، وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوي لي منها، وأعطيت الكنزين: الأحمر والأبيض، وإني سألت ربي لأمتي أن لا يهلكها بسنة بعامة، وأن لا يسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم، وإن ربي قال: يا محمد إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد وإني أعطيتك لأمتك ألا أهلكهم بسنة بعامة وألا أسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم، ولو اجتمع عليهم من بأقطارها حتى يكون بعضهم يهلك بعضا ويسبي بعضهم بعضا)**[١].

واته: ثەوبان خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوا زەوی کۆکردەوە بۆم، منیش شوێنەکانی خۆرهەڵاتەکانی و خۆر ئاوابووەکانی زەویم بینی، ئومەتەکەشم موڵک و دەسەڵاتی دەگاتە ئەو شوێنانەی زەوی کە نیشانم دران، هەروەها هەردوو خەزێنە سوور و سپی یەکەشم پێ درا کە دەکاتە "خەزێنەکانی کیسرا و قەیسەر" ئەوە بوو کەوتنە دەست ئومەتەکەی.

[١] أخرجه مسلم (٢٨٨٩).

داواشم کرد لە پەروەردگارم بۆ ئوممەتەکەم کە بە ساڵانی گشتگیر و ئاسمانی "واتە: قات و قڕی" لەناویان نەبات، هیچ دوژمنێکیش جگە لە خۆیان زاڵ نەکات بەسەریان دا و دەست نەگرن بەسەر وڵاتەکانیان دا.

پەروەردگاریش فەرمووی: (ئەی محمد کە فەرمانی قەدەرێکم دا، ئەوە ڕەت کردنەوەی نییە، منیش ئەوەم بەخشی پێت بۆ ئومەتەکەت کە بە ساڵانی گشتگیر و قات و قڕی لەناویان نەبەم، ئەوەشم دا پێت کە هیچ دوژمنێکی جگە لە خۆیان زاڵ نەکەم بەسەریان دا و دەست نەگرن بەسەر وڵاتەکانیان دا ئەگەر چی هەرچی هێزی هەیانە لەسەر زەوی کۆی بکەنەوە.

ئەمەش بەردەوام دەبێت بە مەرجێک کۆک بن، هەتا ئەو کاتەی کە شوێنکەوتنی پێغەمبەر درود و سەلامی خوای لێ بێت لادەدەن، هەندێکیان هەندێکی تر لەناو دەبەن، وە هەندێکیان هەندێکی تر دەکەنە بەندە و کەنیزەک)

**ورواه البرقاني في صحيحه، وزاد: (وإنما أخاف على أمتي الأئمة المضلين، وإذا وقع عليهم السيف لم يرفع إلى يوم القيامة، ولا تقوم الساعة حتى يلحق حي من أمتي بالمشركين، وحتى تعبد فئة من أمتي الأوثان، وإنه سيكون في أمتي كذابون ثلاثون، كلهم يزعم أنه نبي، وأنا خاتم النبيين، لا نبي بعدي. ولا تزال طائفة من أمتي على الحق منصورة لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله تبارك وتعالى)**[1].

[1] أخرجه أبو داود (٤٢٥٢)، وابن ماجه (٣٩٥٢)، وأحمد (٢٧٨،٢٨٤/٥)، وصححه الألباني في "الصحيحة (٢٥٢/٤).

واته: ئيمام بەڕقانی ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە ، ئەم زیادەشی لەگەڵ هێناوە: (من تەنها لە پێشەوا و ئیمامە گومڕاکەرەکان دەترسم کە زیان لە ئومەتەکەم بدەن .

کاتێک جەنگ کەوتە نێوانیانەوە، ئەو جەنگە بەردەوام دەبێت و ڕاناوەستێ هەتا ڕۆژی قیامەت، قیامەتیش نایەت هەتا چەندین قەبیلە و کۆمەڵ "واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە" دەڕۆنە ڕیزی موشریکەکانەوە " واتە: یان خاکی ئیسلام بەجێ دەهێڵن دەڕۆنە خاکی کوفرەوە، یان بەکاروکردەوە شەریک بۆ خوا دادەنێن و دەڕۆنە ڕیزی ئەوانەوە "، وە هەتا ژمارەیەکی زۆر لە ئومەتەکەم پەیکەر دەپەرستن، بە تەئکید لەناو ئومەتەکەمدا سی (٣٠) درۆزن پەیدا دەبن "واتە: ئەوانەی دەبنە خاوەن هێز و دەسەلات"، هەموویان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم ، لەدوای منیش هیچ پێغەمبەرێک نییە.

بەردەوام کۆمەڵێک لە ئومەتەکەم لەسەر حەق دەمێنێتەوە، خوا ئەوانە سەرکەوتوو دەکات، ئەوانەش کە پشتیان بەر دەدەن لە موسلمانان و ئەوانەش کە دژایەتییان دەکەن زیانیان پێ ناگەیەنن "واتە: لە ڕووی دینەوە، وە ناشتوانن بنبڕیان بکەن"، ئەوانە هەر دەمێننەوە هەتا فەرمانی خوا دێت بۆ ڕۆح کێشانی هەرچی ئیمانداره لەسەر زەویدا).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(إن الله زوى لي):** واتە: خوای گەورە زەوی بۆ من کۆ کردۆتەوە.

**(فرأيت):** لەوانەیە مەبەست پێی ئەوە بێت بە چاو بینی بێت، وە لەوانەشە مەبەست پێی لە خەودا بێت.

**(مشارقها ومغاربها):** باسی باکور و باشوری نەکردووە لەبەر کەمی دانیشتوانی، وە لەبەر نەگەیشتنی فتوحاتەکان بەو شوێنانە، فتوحاتەکان لە ڕۆژ هەڵات بەرەو ڕۆژئاوا بوون.

**(أعطيت الكنزين):** واتە: دوو خەزێنە بە من دراون، مەبەست پێی دوای مردن بووە، وە دراوە بە ئوممەتەکەی، بەڵام لەبەر ئەوە گوتوویەتی دراوە بە من، چونکە ئەوەی دەدرێت بە ئوممەتی هەروەک ئەوە وایە بە محمد درابێت (ﷺ).

**(فيستبيح بيضتهم):** واتە: يستحل، (البيضة): ئەوەیە کە لەسەر سەر دادەنرێت بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە تیر، مەبەست پێی ئەوەیە هیچ دوژمنێک جگە لەخۆیان زاڵ نەکات بەسەریان دا و دەست بەرن بەسەر وڵاتەکانیان دا.

**(الأئمة):** جمعی إمام، دەکرێت ئیمامی هی خێر بێت وە هی شەڕ بێت.

**(إذا وقع عليهم السيف لم يرفع إلى يوم القيامة):** واتە: کاتێک جەنگ کەوتە نێوانیانەوە، ئەو جەنگە بەردەوام دەبێت و ڕاناوەستێ هەتا ڕۆژی قیامەت، لە کاتی خەلیفە عوثمان خوا لێی ڕازی بێت هەتا ئێستا ئەم ئومەتە یەکتر دەکوژن.

**(حتى يلحق حي من أمتي بالمشركين):** حي: واتە قەبیلە، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە دەڕۆنە ڕیزی موشریکەکانەوە، واتە:

١- یان خاکی ئیسلام بەجێ دەهێڵن دەڕۆنە خاکی کوفرەوە.

٢- یان بەکاروکردەوە شەریک بۆ خوا دادەنێن و دەڕۆنە ڕیزی ئەوانەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە لەبەر ئەم ڕیوایەتەیە: (حتى يلحق حي من أمتي بالمشركين ويعبد فئام من أمتي الأوثان))[١].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، ئەویش لەبەر:

- وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (إن الله زوى لي الأرض، فرأيت مشارقها ومغاربها).

- وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوي لي منها).

- خەبەردان بەوەی ئەم ئومەتە جیاوازی دەکەوێتە نێوانیان و شەڕ دژی یەکتر دەکەن و دوژمن بەسەریان دا زاڵ دەبێت، وە ئەمە ڕوویدا هەر چۆن خەبەری دابوو.

- خەبەردانی پێغەمبەر بەوەی کە ئومەتی تووشی شیرک دەبێت، وە ئەمە ڕوویدا هەر چۆن خەبەری دابوو.

- خەبەر دان بەوەی کەسانێک دێن بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، وە ئەمە ڕوویدا هەر چۆن خەبەری دابوو، بەردەوام درۆزنەکان هەبوون ئەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان دەکرد.

- خەبەردان بەوەی بەردەوام کۆمەڵێک لە موسلمانان لەسەر حەق دەمێننەوە، وە ئەمە ڕوویدا هەر چۆن خەبەری دابوو ...[٢].

---

[١] القول المفيد.

[٢] إعانة المستفيد (١/٤٦٧-٤٦٨).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ تەواوی سۆز و ڕەحمی پێغەمبەر بۆ ئومەتەکەی، بەجۆرێک دوعای بۆ کرد بەم دوعایە پیرۆزانە و گەورانە، خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی داوە[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەگەر شەڕ کەوتە نێوان موسلمانان بەردەوام دەبێت تا قیامەت و هەڵناگیرێت، بەڵام هەندێک کات زۆر دەبێت و هەندێک کاتی تر کەمتر دەبێت[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە جیاوازی نێوان ئوممەت هۆکارە بۆ زاڵ بوونی دوژمن بەسەریاندا، وە کۆبوونەوەیان و تەبا بوون و کۆبوونەوەیان لەسەر تەوحید هۆکارە بۆ ڕێگری کردنی کافرەکان دەست بەسەر وڵاتەکەیان دا بگرن[٣].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ترسناکی پێشەوایانی گومڕا، واتە: کاربەدەست و زانایان و عابدەکان و بانگخوازانی گومڕا، بەڵام پێشەوایانی باش خێرن لەسەر ئوممەت و هۆکارن بۆ چاک بوونی ئوممەت[٤].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەندێک لەم ئوممەتە تووشی شیرک دەبن و لەدین دەردەچن.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانەری کتاب باسیکردووە: ڕوودانی شیرک لەم ئومەتە هەڵگەڕانەوەی هەندێکیان، ئەمەش ڕووی هێنانەوەیە لەم بابە: (باب ما جاء بعض هذه الأمة يعبد الأوثان))[٥].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات درۆزنە و کافرە.

---

[١] إعانة المستفيد (٤٦٨/١).

[٢] إعانة المستفيد (٤٦٨/١).

[٣] إعانة المستفيد (٤٦٨/١).

[٤] إعانة المستفيد (٤٦٨/١).

[٥] إعانة المستفيد (٤٦٨/١-٤٦٩).

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد دوای پێغەمبەری ئێمە (ﷺ)، یان ئەو کەسەی بەڕاست دانا کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، هەموو ئەمانە کوفرن)[١].

ابن قدامە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەر کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات، یان ئەو کەسەی بانگەشەی دەکات بەڕاستی دابنێیت، ئەوە هەڵگەڕاوەیە، چونکە موسەیلەمە کاتێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، قەومەکەی بەڕاستی موسەیلەمەییان بەڕاست دانا، بەمە هەموویان هەڵگەڕانەوە لە دین، وە طلیحەی ئەسەد و بەڕاست دانەرانی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (لا تقوم الساعة حتى يخرج ثلاثون كذابا كلهم يزعم أنه رسول الله))[٢].

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (زانراوە هەر کەسێک درۆ بداتە پاڵ خوای گەورە بەوەی نێردراوی خوایە یان پێغەمبەری خوایە، یان خەبەرێک بدات لە خواوە بە درۆ، وەک موسەیلەمە و عنسی و کەسانی تری وەک ئەم دووانە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان کرد، ئەوە کافرە و خوێنی حەڵاڵە)[٣].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە پێغەمبەر دوا پێغەمبەرە و هیچ پێغەمبەری تر دوای ئەو ناهێن، هەر کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی

---

[١] روضة الطالبين (١٠/٦٤-٦٥).
[٢] المغنى (٨/١٥٠).
[٣] الصارم المسلول لاپەڕە (١٤٨).

بكات ئەوە كافرە، چونكە خوا و پێغەمبەر و ئیجماعی موسلمانانی بەدرۆ خستۆتەوە، ...)[١].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە كۆمەڵی ڕزگار بوو دەمێنێتەوە لەسەر حەق ئەگەر چی فیتنە و ناخۆشی و شەڕ چەند زۆر بێت[٢].

**٩-** حصر كردنی ژمارەی ئەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكەن تەنها **٣٠** كەس نیین، بەڵكو زیاتر هاتوون بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان كردووە، مانای فەرموودەكە بەم شێوەیەیە:

١- هەندێک دەڵێن مانای ئەوەیە **٣٠** كەس بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكەن بەناوبانگ دەبن، كەسانی تریش بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكەم بەڵام وەک ئەم **٣٠** كەسە بەناوبانگ نابن.

٢- ئەم فەرموودەیە كەمترین ژمارەی ئەوانەی باسكردووە كە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكەن.

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم حصر كردنە بە **٣٠** پێغەمبەر مانای وا نییە تەنها **٣٠** كەس بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكەن، چونكە ئەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان كردووە **٣٠** كەس زیاتر بوون)[٣].

---

(١) إعانة المستفيد (٤٦٩/١).

(٢) إعانة المستفيد (٤٦٨/١).

(٣) فتح الباري (٦١٧/٦).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (باسکردنی ٣٠ کەس بۆ ڕوون کردنەوەی کەمترین حەدە، ئەوانە ژمارەیان لە ٣٠ کەس کەمتر نییە ئەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن)[1].

دوو کەس لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کرد: موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامە، وە ئەسوەدی عنسی لە یەمەن.

**١٠-** قبوول نەبوونی دوعای کەسێک بەڵگەیە نییە کە کەسەکە خراپە یان زۆر باش نییە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) داوای سێ شتی کرد، خوای گەورە دووی پێدا.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (سألت ربي عز وجل ثلاث خصال، فأعطاني اثنتين ومنعني واحدة، سألت ربي أن لا يهلكنا بما أهلك به الأمم فأعطانيها، فسألت ربي عز وجل أن لا يظهر علينا عدوا من غيرنا فأعطانيها، فسألت ربي أن لا يلبسنا شيعا فمنعنيها).

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە موسلمان نیشتەجێ ببێت لەناو کافرەکان، لەسەر یەکێک لەو دوو مانایە.

**١٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شەڕ کردن لەنێوان موسلمانان حەڕامە.

**١٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە قەزای خوای گەورە ڕەت ناکرێتەوە.

**١٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مولکی ئەم ئومەتە درێژ دەبێتەوە لە ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوا.

---

[1] القول المفيد.

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئاماژەیە بۆ ئەوە مولکی ئەم ئومەتە درێژ دەبێتەوە لە ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوا، بەم شێوەیە ڕویداوە، بەڵام باکور و باشور کەمە بەروارد بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)[1].

---

[1] شرح صحیح مسلم (٢٤٢/٢).

## باب ما جاء في السحر

**وقول الله تعالى:** ﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ﴾ {البقرة:١٠٢}.

**وقوله:** ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ {النساء:٥١}.

**قال عمر: (الجبت): السحر، (والطاغوت): الشيطان[١].**

**وقال جابر: الطواغيت: كهان كان ينزل عليهم الشيطان في كل حي واحد[٢].**

**وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (اجتنبوا السبع الموبقات) قالوا: يا رسول الله: وما هن؟ قال: (الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات)[٣].**

**وعن جندب مرفوعا: (حد الساحر ضربه بالسيف) رواه الترمذي، وقال: الصحيح أنه موقوف[٤].**

---

[١] علقه البخاري في "صحيحه" كتاب التفسير، باب قوله: "وإن كنتم مرضى أو على سفر ..." {النساء:٤٣}، قبل حديث (٤٥٨٣) مجزوما به، و وصله غيره، انظر: "فتح الباري" (٢٥٢/٨).

[٢] علقه البخاري أيضا مجزوما به في مواضع السابق.

[٣] متفق عليه: أخرجه البخاري (١٤٦٠)، ومسلم (٨٩).

[٤] أخرجه الترمذي (١٤٦٠)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (١٤٤٦).

**وفي (صحيح البخاري) عن بجالة بن عبدة قال: كتب عمر بن الخطاب: أن اقتلوا كل ساحر وساحرة، قال: فقتلنا ثلاث سواحر[١].**

**وصح عن حفصة رضي الله عنها: أنها أمرت بقتل جارية لها سحرتها، فقتلت[٢].**

**وكذلك صح عن جندب[٣].**

**قال أحمد: عن ثلاثة من أصحاب النبي (ﷺ) [٤].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية البقرة.

**الثانية:** تفسير آية النساء.

**الثالثة:** تفسير الجبت والطاغوت، والفرق بينهما.

**الرابعة:** أن الطاغوت قد يكون من الجن، وقد يكون من الإنس.

**الخامسة:** معرفة السبع الموبقات المخصوصات بالنهي.

---

[١] أخرجه البخاري (٣١٥٦).

[٢] صحيح موقوف: أخرجه مالك في "الموطأ" (٨٧١/٢) بلاغا، ووصله عبدالرزاق في "مصنفه" (١٨٠/١٠)وصححه ابن كثير في تفسير آية (١٠٢) من سورة البقرة.

[٣] صحيح موقوف: أخرجه الحاكم في "مستدركه" (٣٦١/٤)، وقال الألباني في "السلسلة الضعيفة" (٣/تحت رقم ١٤٤٦): موقوف صحيح إلى الحسن، وقد توبع.

[٤] نقله عنه ابن كثير في "تفسيره" (١٤٥/١).

**السادسة:** أن الساحر يكفر.

**السابعة:** أنه يقتل ولا يستتاب. الثامنة: وجود هذا في المسلمين على عهد عمر، فكيف بعده؟

# باب ما جاء في السحر

## باسی سیحر

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سیحر دوو بەشە:

١- سیحر هەیە شیرکە: ئەویش ئەوەیە کە کەسی ساحیر بە واستەی شەیتانەکان دەیکات، دەیپەرستێت و خۆی لێ نزیک دەکاتەوە بۆ ئەوەی زاڵ بێت بەسەر ئەو کەسەی سیحری لێ دەکەن.

٢- سیحر هەیە تاوان و زوڵم کردنە: ئەویش بەهۆی دەرمان و شتی تری وەک دەرمان دەکرێت.

بەم دابەش کردنەی باسمان کرد دەگەین بە شتێکی گرینگ، ئەویش ئەوەیە ئایا ساحر کافر دەبێت یان نا؟

جیاوازی هەیە لەنێوان ئەهلی عیلم: هەندێکیان دەڵێن کافر دەبێت و هەندێکی تریان دەڵێن کافر نابێت.

بەڵام دابەش کردنی پێشوو ئەوەی باسمان کرد حوکمی بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە، هەر کەسێک سیحرەکەی بەواستەی شەیتانەکان بێت، ئەوا کافر دەبێت، چونکە سیحر ئەنجام نادرێت مەگەر بەهۆی شیرکەوە نەبێت، لەبەر وتەی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَـكِنَّ الشَّيْاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ... إلى قوله: وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ

﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ﴾ [البقرة: ١٠٢]، وە هەر کەسێک سیحرەکەی دەرمان و شتی تری وەک دەرمان بێت، ئەوا کافر نابێت بەڵام تاوانبارە.

سەبارەت بە کوشتنی ساحر، ئەگەر سیحرەکەی کوفر بێت ئەوە دەکوژرێت وەک هەڵگەڕانەوە لە دین، مەگەر تەوبە بکات, لەسەر ئەو وتەیەی دەڵێت تەوبەی قبوڵ دەکرێت کە ئەمە وتەی ڕاستە، ئەگەر سیحرەکەی کوفر نەبێت ئەوا دەکوژرێت وەک کەسێک تەعدا لە کەسێک بکات، بۆ ئەوەی زوڵم و فەساد و ئەزیەت دانی لەسەر زەوی لابچێت، ئەمەیان کوشتنەکەی بۆ ئیجتهادی ئیمام دەگەڕێتەوە، ئەوەی دیار بێت لە دەقەکان کە دانەری کتاب باسی کرد دەکوژرێت، ئەوەی گرینگ بێت بێگومان سیحر کاریگەری هەیە.

ئەگەر یەکێک بڵێت: ڕووی هێنانەوەی (سیحر) لە کتابی تەوحید چییە؟

دەڵێین: هۆکاری ئەم بابە لە کتابی تەوحید: چونکە جۆرێک لە جۆرەلانی سیحر ئەوەیە ناکرێت مەگەر بە شیرک نەبێت، شەیتانەکان خزمەتی مرۆڤ ناکەن ئیلا بۆ مەسلەحەت نەبێت، ئەوەی زانراو بێت مەسلەحەتی شەیتان لەوەدایە مرۆڤ گومڕا بکات و تووشی شیرک و تاوانی بکات)[1].

محمد بن عبدالرحمان الخميس خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (سیحر لە زمانەوانیدا: شتێکی شاراوەیە و هۆکاری دیار نییە.

[1] القول المفيد (٦/٢).

لە ڕووی شەرعەوە: سیحر کردنە بە گرێدان و فوو کردن و خوێندنەوە، کاریگەری لەسەر دڵ و لاشە هەیە، هەیە پێی نەخۆش دەبێت و هەیە دەمرێت و هەیە تەفرەقە دەخاتە نێوان پیاو و ژنەکەی.

حوکمی سیحر: حەڕامە چونکە کوفر کردنە بە خوا و شەریک بڕیاردانە بۆی، نەفی ئیمان و تەوحید دەکات، ڕووی داخل بوونی سیحر بە شیرک لە دوو ڕووەوەیە:

١- لەڕووی خزمەت کردنی شەیتانەکان و پەیوەست بوونە پێیانەوە.

٢- لەڕووی ئەوەی بانگەشەی عیلمی غەیب دەکات کە کەس نایزانێت ئیلا خوا نەبێت و تایبەتە بە خوا)[١].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (هۆکاری باسکردنی سیحر لە کتابی تەوحید: سیحر جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (من سحر فقد أشرك)، سیحر جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرکی گەورە، هۆکاری هێنانەوەی لە کتاب تەوحید دا دیارە، چونکە دژی ئەصلی تەوحیدە)[٢].

---

[١] توضيحات الجلية على شرح العقيدة الطحاوية (١٣١٣/٣).
[٢] التمهيد لاپەڕە (٢٨٥).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ﴾ {البقرة:١٠٢}.

واته: خوای گەورە دەفەرموویت: (سوێند بەخوا بە تەئکید زانیان کە هەر کەس سیحر بکات و بیگۆڕێتەوە بەرامبەر دینەکەی، ئەوا لە قیامەت دا هیچ بەشێکی نییە).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾: ابن قیم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (دەیان زانی هەر کەسێک سیحر وەربگرێت و قبولی بکات هیچ بەشی نییە لە ئاخیرەت، لەگەڵ ئەم زانین و زانستە ئەوان سیحریان کڕی و قبولیان کرد و فێربوون و خەڵکیشیان فێردەکردن)[(١)].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەی کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە سیحر کوفرە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** فێربوونی سیحر و خەڵک فێرکردن کوفری گەورەیە لەدین دەردەچیت، بەڵگە لە چەندین شوێن:

- وتەی: ﴿وَلَـٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ﴾.

- وتەی: ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾.

---

(١) بدائع التفسير (٣٣٣/١).

- وتەی: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾.

- وتەی: ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنْفُسَهُمْ﴾، ئەوان نەفسی خۆیان فرۆشت بە خراپترین شت، هیچ شتیش خراپتر نییە لە کوفر.

- وتەی: ﴿لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەوان هیچ زانستیان نییە، بەڵکو جەهلیان لەلایە، هیچ کەسیش لەوە نەزانتر نییە کە کوفر دەکات.

- وتەی: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا﴾.

- وتەی: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ خَيْرٌ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾.

**وقوله:** ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ [المائدە: ٦٠].

واتە: ئەوان ئیمانیان بە جبت و تاغوت هێناوە.

**قال عمر: (الجبت): السحر، (والطاغوت): الشيطان.**

واتە: عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت لەبارەی تەفسیری ئەوئایەتەوە فەرمووی: جبت: واتە سیحر، تاغوتیش واتە شەیتانەکان.

**وقال جابر: الطواغيت: كهان كان ينزل عليهم الشيطان في كل حي واحد.**

واتە: جابر خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: تاغوتەکان فاڵگرەوەکانن، شەیتانەکانی خۆیان دادەبەزنە سەریان، لە هەموو خێڵێکدا دانەیەک هەیە.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ (جبت): واتە: سیحر، (طاغوت): عومەر خوا لێی ڕازی بێت بە شەیتان وەسفی کردووە وەک نموونە، ئەگەرنا تاغوت لە شەیتان گشتی ترە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەم ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە چونکە جوولەکەکان ئیمانیان هێناوە بە سیحر، وە سیحریش کوفرە.

**وفي (صحيح البخاري) عن بجالة بن عبدة قال: كتب عمر بن الخطاب: أن اقتلوا كل ساحر وساحرة، قال: فقتلنا ثلاث سواحر.**

واتە: بەجالەی کوڕی عەبدە کە والی عومەر بوو گوتی: عومەری کوڕی خەتاب نامەیەکی نووسی کە هەرچی ساحیرە بیکوژن چ پیاو بێت یان ژن، بەجالە گوتی: ئێمەش بە فەرمانی عومەر سێ ساحیرمان کوشت.

**وصح عن حفصة رضي الله عنها: أنها أمرت بقتل جارية لها سحرتها، فقتلت، وكذلك صح عن جندب.**

واتە: لە فەرموودەی صحیح هاتووە کە دایکی ئیمانداران حەفصە فەرمانی کردووە بە کوشتنی کەنیزەکێکی خۆی کە سیحری لە حەفصە کردبوو، هەر لەبەر ئەوەش کوژرا، هەروەها لە فەرموودەی صحیح هاتووە کە جوندب ساحیری کوشتووە.

**قال أحمد: عن ثلاثة من أصحاب النبي (ﷺ).**

واتە: ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: کوشتنی ساحیر لە لایەن سێ هاوەڵی پێغەمبەرەوە بە صحیحی هاتووە، واتە: عومەر و حەفصە و جوندب.

**ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکان:**

**(أن اقتلوا كل ساحر وساحرة):** واتە: هەرچی ساحیرە بیکوژن چ پیاو بێت یان ژن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرانە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرانەی باسکردووە بۆ ئەوەی حوکمی ساحر ڕوون بکاتەوە.

**ســــوودەکانی ئەثەرەکان:**

**١-** ئەم ئەثەرانە بەڵگەن ساحر کافرە، چونکە هاوەڵان ساحریان کوشتووە، نەیان کوشتووە ئیلا لەبەر کوفر نەبێت.

**٢-** ئەم ئەثەرانە بەڵگەن واجبە ساحر بکوژرێت وەک کوشتنی هەڵگەڕانەوە لە دین.

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون ساحر کافرە و دەبێت بکوژرێت، کوشتنی ساحیر جێگیر بووە لە عمر بن الخطاب وعثمان بن عفان وحفصة بنت عمر وعبد الله بن عمر وجندب بن عبدالله)[1].

ابن قدامة ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەمە بەناوبانگ بووە و کەس ئینکاری نەکردووە و ئیجماع دروست بوو)[2].

زانایانی اللجنة الدائمة دەڵێن: (ئەگەر ساحر سیحرێک بکات بە کوفر ئەوا دەکوژرێت وەک هەڵگەڕانەوە لەدین، ئەگەر جێگیر بوو کەسێکی کوشتووە بە سیحر ئەوە دەکوژرێت وەک تۆڵەسەندنەوە، ئەگەر نە کەسێکی کوشتبێت و نە بە سیحری کوفری کردبێت، سەبارەت بە کوشتنی جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان، وتەی ڕاست دەکوژرێت وەک هەڵگەڕانەوە لە دین، کە ئەمە وتەی ئەبو حەنیفە و مالک و ئەحمەدە، لەبەر کوفرەکەی بە سیحر)[3].

---

[1] مجموع الفتاوى (٣٨٤/٢٩).

[2] المغنی.

[3] فتاوى اللجنة الدائمة (٥٥١/١-٥٥٣).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم كوشتنە ئایا حەددە یان كوشتنەكە لەبەر كوفرەكەیەتی؟

هەردوو ئیحتمال هەیە لەسەر ئەو تەفسیلەی پێشتر كە باسمان كرد بۆ كوفری ساحر، ئەگەر سیحرەكەی كوفر بێت ئەوا كوشتنەكەی كوشتنی هەڵگەڕانەوەیە، ئەگەر سیحرەكەی كوفر نەبێت ئەوا كوشتنەكەی لە بابی لادانی ئەو كەسەیە كە هێرش دەكاتە سەر مرۆڤ و فەساد بڵاودەكاتەوە، جێ بەجێكردنیشی بۆ ئیمام دەگەڕێتەوە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (فەرموودەكە بەڵگەیە واجبە ساحر بكوژرێت وەك كوشتنی هەڵگەڕانەوە لە دین، چونكە بەصحیحی جێگیر بووە لە سێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر: عمر حفصە و جندب، بەدیار نەكەوتووە هیچ یەكێك لە هاوەڵان پێچەوانەیان كردبێت، ئەمەش بەڵگەیە كوشتنی واجبە چونكە هەڵگەڕاوەتەوە، هەڵگەڕاوە دەبێت بكوژرێت لەبەر وتەی پێغەبەر (ﷺ): (من بدل دينه فاقتلوه)، وە لەبەر وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (لا يحل دم امرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث: النفس بالنفس، والثيب الزاني، والتارك لدينه المفارق للجماعة)، ساحر لە بەشی كۆتاییە والتارك لدينه المفارق للجماعة، دەبێت بكوژرێت)[2].

**٣-** ئەم ئەثەرانە بەڵگەن ساحر دەكوژرێت بێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بكرێت، چونكە لەم ئەثەرانە باس نەكراوە هاوەڵان داوای تەوبەیان لێ كردبێت، بەڵكو ئەوانیان كوشتووە، باسی داواكردنی تەوبەیان لێ نەكراوە، كە ئەمە وتەی ئیمام مالك و وتەیەكە لە وتەكانی ئەحمەد.

---

[1] القول المفيد.

[2] إعانة المستفيد (٤٧٩/١).

دووەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون داوای تەوبەی لێ دەکرێت وەک هەموو هەڵگەڕاوەکانی تر، کە ئەمە وتەی شافعی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەوەی ڕاست بێت لای ئەهلی عیلم ئەوەیە: ساحر دەکوژرێت بێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکەیت، لەبەر گەورەیی شەڕەکەی و فەسادی، هەندێک لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون داوای تەوبەی لێ دەکرێت وەک هەموو هەڵگەڕاوەکانی تر، بەڵام وتەی ڕاستی زانایان ئەوەیە داوای تەوبەی لێ ناکرێت، چونکە شەڕی گەورە و شاراوەیە هەروەها کوفری شاراوەشە، بانگەشەی ئەوە دەکات تەوبەم کردووە کەچی درۆ دەکات، زیانێکی گەورە لە خەڵک دەدات، لەبەر ئەوە زۆر لە زانایان دەڵێن ئەگەر زانرا و جێگیر بوو کەسێک ساحرە دەکوژرێت ئەگەر چی بڵێت تەوبەم کردووە و پەشیمان بوومەتەوە، ڕاست ناکات لە وتەی خۆی)[1].

---

[1] مجموع فتاوى الشيخ ابن باز (٦٩/٨).

## باب بيان شيء من أنواع السحر

**قال أحمد: حدثنا محمد بن جعفر، حدثنا عوف عن حيان بن العلاء، حدثنا قطن بن قبيصة عن أبيه أنه سمع النبي (ﷺ) قال: (إن العيافة والطرق والطيرة من الجبت).**

**قال عوف: العيافة: زجر الطير، والطرق: الخط يخط بالأرض والجبت، قال: الحسن: رنة الشيطان. إسناده جيد[١].**

**ولأبي داود والنسائي وابن حبان في صحيحه، المسند منه[٢].**

**وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله (ﷺ): (من اقتبس شعبة من النجوم، فقد اقتبس شعبة من السحر، زاد ما زاد) [رواه أبو داود] وإسناده صحيح[٣].**

**وللنسائي من حديث أبي هريرة رضي الله عنه: (من عقد عقدة ثم نفث فيها فقد سحر، ومن سحر فقد أشرك، ومن تعلق شيئا وكل إليه)[٤].**

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (ألا هل أنبئكم ما الغضة؟ هي النميمة، القالة بين الناس) [رواه مسلم][٥].**

---

[١] أخرجه أحمد (٦٠/٥ رقم ٢٠٦٠٣).

[٢] "سنن أبي داود (٣٩٠٦)، وابن ماجه (٣٧٢٦)، و"سنن النسائي الكبرى" (٣٢٤/٦ رقم ١١١٠٨)، و"صحيح ابن حبان" (٥٠٢/١٣ رقم ٦١٣١).

[٣] أخرجه أبو داود (٣٩٠٦)، وابن ماجه (٣٧٢٦)، وأحمد (٣١١/١ رقم ٢٨٤١).

[٤] أخرجه النسائي (٤٠٧٩)، والطبراني في "الأوسط" (١٢٧/٢ رقم ١٤٦٩)، وضعفه الألباني في "ضعيف الجامع" (٥٧٠٢).

[٥] أخرجه مسلم (٢٦٠٦).

**ولهما عن ابن عمر رضي الله عنهما، ان رسول الله (ﷺ) قال: (إن من البيان لسحرا)**[1]**.**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** أن العيافة والطرق والطيرة من الجبت.

**الثانية:** تفسير العيافة والطرق.

**الثالثة:** أن علم النجوم نوع من السحر.

**الرابعة:** أن العقد مع النفث من ذلك.

**الخامسة:** أن النميمة من ذلك.

**السادسة:** أن من ذلك بعض الفصاحة.

---

[1] أخرجه البخاري (٥١٤٦) من حديث ابن عمر رضي الله عنهما، ومسلم (٨٦٩) من حديث عمار بن ياسر رضي الله عنه.

# باب بيان شيء من أنواع السحر

## ڕوونکردنەوەی بەشێک لە جۆرەکانی شیرک

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب حەکیمە لە دەربڕینی باسکردنی باب، بەجۆرێک فەرموویەتی: ڕوونکردنەوەی بەشێک لە جۆرەکانی شیرک، حوکمی لەسەر نەداوە بە شتێک، چونکە هەیە شیرکە و هەیە لە تاوانە گەورەکانە و هەیە دروستە بەگوێرەی مەبەست و کاریگەری و پاشماوەی)[1].

سليمان ال الشيخ دەفەرموویێت: (دانەری کتاب دەیەوێت ڕوون کردنەوە لەسەر بەشێک لە جۆرەکانی شیرک بدات، لەبەر زۆری ڕوودانی و بزربوونیان لە خەڵک)[2].

جیاوازی نێوان موعجیزە و سیحر:

١- موعجیزە شتێکە لە عادەت دەرچووە بە پێچەوانەی یاساکانی کەون و لە خوای گەورەوەیە، بەڵام سیحر ڕوودەدات بەگوێرەی یاساکان کە دەکرێت ساحر فێری بووبێت.

٢- موعجیزە بەرهەم نەهاتووە مەگەر لە خێر، هەرچی سەبارەت بە سیحریشە لە خێرەوە نەهاتووە.

٣- موعجیزە ناکرێت بەتاڵی بکەیتەوە بەڵام سیحر دەکرێت بەتاڵی بکەیتەوە.

---

[1] القول المفيد (٢/٣٦).
[2] تيسير العزيد الحميد لاپەڕە (٢٩٢).

٤- موعجيزه لەسەر دەستی پێغەمبەران ڕوودەدات کە باشترینی خەڵکن لە زانست و کردەوە و ڕەوشت کەچی سیحر لەسەر دەستی ساحر ڕوودەدات کە خراپترینی خەڵکن لە زانست و کردەوە و ڕەوشت.

٥- موعجیزە هیچ هۆکاری بۆ نییە، لەبەر ئەوە بێجگە لە پێغەمبەر کەس ناتوانێت موعجیزە پیشان بدات، بەڵام سیحر هۆکارەکانی زانراون.

جیاوازی نێوان موعجیزە و کەرامەت:

(المعجزة): ڕوودانی شتێکی دەگمەن و سەیرە کە خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەرانی پێ دەکات و تەحەددای خەڵکی پێ دەکات.

(الكرامة): ڕوودانی شتێکی دەگمەن و سەیرە کە خوای گەورە لە سەر دەستی پیاو چاکان دەی هێنێتە دی.

ڕوون کردنەوەی زیاتر لەسەر جیاوازی نیوان کەرامەت و معجزة:

١- موعجیزە بنیات نراوە لەسەر ئەوەی کە بەدیار بکەوێ و بەناو بانگ بێت بۆ پێغەمبەران، بەڵام کەرامەت بنیات نراوە لەسەر شاردنەوە و بۆ ئەوە نییە کە مشهور "بەناوبانگ بێت" پێ ی.

٢- موعجیزە پەیوەستە بە تەحەددا و بانگەوازی پێغەمبەرایەتی، بەڵام کەرامەت پەیوەست نییە بە تەحەددا و بانگەوازی بۆ ئەوە ناکات کە من پلەم بەرزە لە لای خوا.

٣- بەرووبووم و سوودی معجیزە بۆ خەڵکە، بەڵام کەرامەت بەزۆری بەرووبووم و سوودی بۆ خۆیەتی.

٤- معجیزە لە هەموو شتێک ڕوودەدات بەلام کەرامەت لە هەموو شت ڕوو نادات.

٥- معجیزە تایبەتە بە پێغەمبەران (علیهم السلام) بەلام کەرامەت هی دۆستانی خوایە.

٦- پێغەمبەران موعجیزەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر موشریکان چونکە دڵیان ڕەق بوو، بەڵام کەرامەت بۆ ئەوەیە کە دڵی پیاو چاکان جێگیر بێت و بگات بە ئارامی.

زانایان دەڵێن ڕاستە دەتوانی بڵێی کەرامەت نیشانەی باشی کەسەکەیە بەڵام نابێتە بەڵگە کە خاوەن کەرامەت لە هەمووان باشترە، چونکە کەرامەت بۆ ئەوەیە تا ئیمانی پێ زیاد بێت و جێگیر ببێ لەسەر حەق و خوای گەورە کەرامەت دەدات بە ئیمان لاوازیش.

ابو علی الجوزجانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (داواکەری بەردەوامی بە (استقامة)، واتە: داوای بەردەوام بوون لە خوا بکە نەک داوای کەرامەت، چونکە نەفسی تۆ داوای کەرامەت دەکات، بەلام خوای گەورە داوای بەردەوام بوونت لێ دەکات)[1].

خەڵک بەشێوەیەکی گشتی چاویان لە کەرامەتە و حەزیان لە کەرامەتە، بەڵام زانایان دەڵێن بەردەوام بوون لەسەر دین گەورەترین کەرامەتە.

زانایان دەڵێن موسڵمان نابێت بێ ئومێد بێ لە ڕەحمی خوا و بلێ من دۆستی خوا نیم چونکە کەرامەتم نیە، چونکە هەموو خاوەن کەرامەتێک بەڵگە نیە کە لە هەمووان باشتر بێت، کەسی وا هەیە کەرامەتی نییە بەڵام بەردەوامی هەیە لەسەر دین کە ئەمە گەورەترین کەرامەتە، هەروەها هەرکەسێک بانگەوازی بۆ ئەوە بکات من کەرامەتم هەیە بۆ ئەوەی

---

[1] مجموع فتاوی ابن تیمیه (٣٢٠/١١).

خەڵک بۆلای خۆی ڕابکێشت ئەگەری زۆری هەیە ساحر بێت یان گومڕاکەرێک بێت لە گومڕاکەران.

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (کەرامەتیش تاقیکردنەوەیە بۆ مرۆڤ، هەیە پێی بەختەوەر دەبێت و هەشە پێی گومڕا دەبێت، ئەگەر سوپاسی خوای گەورەی کرد ئەوا بەختەوەرە، بەڵام ئەگەر موعجب (سەرسام)، بوو بە نەفسی خۆی و بەردەوام نەبوو ئەوە گومڕا بووە).

**قال أحمد: حدثنا محمد بن جعفر، حدثنا عوف عن حيان بن العلاء، حدثنا قطن بن قبيصة عن أبيه أنه سمع النبي (ﷺ) قال: (إن العيافة والطرق والطيرة من الجبت).**

واتە: ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە کە قەبیصە گوێ بیستی پێغەمبەری خوا بوو فەرموویەتی: (بە تەئکید هەڵدان یان هەڵفڕاندنی باڵندە و لێدانی خەتی بەخت و شومی و نەگبەتی جۆرێکن لە سیحر)

**قال عوف: العيافة: زجر الطير، والطرق: الخط يخط بالأرض والجبت، قال: الحسن: رنة الشيطان. إسناده جيد ولأبي داود والنسائي وابن حبان في صحيحه، المسند منه.**

واتە: عەوف دەفەرمووێت: العيافة: هەڵفڕاندنی باڵندەیە، الطرق: ئەوەیە کە لەسەر لم خەتیان دەکێشا بۆ بەخت گرتنەوە، حەسەنی کوڕی عەلی دەفەرمووێت: جبت دەنگی شەیتانە یان شەیتان خۆیەتی.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(العيافة):** واتە: هەڵفڕاندنی باڵندەیە بۆ گەش بینی یان ڕەش بینی.

**(الطرق):** واتە: خەت لێدان بۆ بەخت، بەزۆری ئافرەتان ئەم خەتانە لێدەدەن، نازانن چۆن دەگەن بە ئاواتیان بانگەشەی عیلمی غەیب دەکەن، چەندین خەتیان لێدەدا بە خێرایی، پاشان دوو دوو دەیانسڕییەوە هەتا دوو خەت یان یەک خەت دەما، پاشان دەیانگوت بڕۆ کارەکەت بکە یان کارەکەت مەکە.

**(الطيرة):** ڕەش بینی، عەرەب ڕەش بین دەبوون بە باڵندە و شوێن و کات و کەسەکان.

**(رنة الشيطان):** واتە: وەحی شەیتان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە بۆ ئەوەی جۆرەکانی سیحر ڕوون بکاتەوە و ئاماژە بۆ ئەوە بکات هەڵدان یان هەڵفڕاندنی باڵندە و لێدانی خەتی بەخت و شومی و نەگبەتی جۆرێکن لە سیحر.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شومی و نەگبەتی جۆرێکە لە سیحر، چونکە وەک خەت لێدانی بەختە پشت بە شتێکی شاراوە دەبەستێت، نابێت پشتی پێ ببەستیت، دواتر باسی دەکەین لە بابی شومی و نەگبەتی کە چی لێی دەرهێنراوە[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خەت لێدان بۆ بەخت جۆرێکی سیحرە، هەروەها هەر شتێکی تری وەک ئەمانە هەمان حوکمی هەیە، وەک: ئەستێرەکانی بەخت و بورجەکان و قاوە گرتنەوە و شتی تری وەک ئەمانە.

---

[١] القول المفيد (٣٩/٢-٤١).

**وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله (ﷺ): (من اقتبس شعبة من النجوم، فقد اقتبس شعبة من السحر، زاد ما زاد) [ رواه أبو داود ] وإسناده صحيح.**

واتە: ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک بەشێ لە عیلمی ئەستێرەناسی فێر ببێت یان وەری بگرێت، ئەوا بەشێ لە سیحر فێر بووە یان وەری گرتووە، چەندە لەو ئەستێرەناسی یە زیاتر فێر بێت ئەوەندە لە سیحر فێربووە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(اقتبس):** واتە: فێربوون.

**(من النجوم):** مەبەست پێی زانستی ئەستێرەناسی یە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە فێربوونی زانستی ئەستێرەناسی بۆ ڕوودانی شت لەسەر زەوی جۆرێکە لە سیحر.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زانستی ئەستێرەناسی شیرکە، زانایان دەڵێن زانستی ئەستێرە ناسی دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر:

یەکەم: (علم التأثير): واتە زانستی کاریگەر باوەڕت وابێت ئەستێرە کاریگەری هەیە لەسەر زەوی و ڕووداوەکان، کە ئەم سێ حاڵەتانەن:

أ- هەر کەسێک باوەڕی وابێت ئەستێرە فاعلە (بکەرە یان کارایە)، ئەمە شیرکی گەورەیە و شیرکە لە پەروەردگاریەتیدا.

نموونە: دەڵێت ئەستێرە خۆی بارانی باراند یان ئەستێرە فڵانە شتی بەسەر فلانە کەسدا هێنا.

ب- ئەگەر ئەستێرە بکاتە هۆکار بۆ بانگەوازی کردنی زانستی شاراوە (واتە: علمی غیب) ئەمە شیرکی گەورەیە.

نموونە: فلانە کەس لە فلانە ئەستێرەدا لەدایک بووە، بەختەوەر دەبێت یان تووشی نەخۆشی دەبێت.

ج- ئەگەر باوەری وابێت فلانە ئەستێرە هۆکارە بۆ خێر و شەڕ، ئەگەر چی باوەڕی وابێت هەموو شتێکیش بەدەست خوایە، ئەمە شیرکی بچووکە.

دووەم: (علم التسيير): ئەم زانستە دروستە کاری پێ بکەی بۆ دین و دونیا:

- بۆ دین: بە نموونە ئەستێرە دەکەیتە بەڵگە بۆ زانینی قیبلە و زانینی سێ یەکی شەو...

- بۆ دونیا: نموونە بۆ زانینی ڕێگاو شوێن و زانینی وەرزەکانیساڵ، خەڵکانێک کشتوکاڵیان دەکرد لەکاتی هەڵاتنی فلانە ئەستێرە، هەندێک دەڵێن باش نییە بۆ ئەم مەبەستە بەکاربێت بۆ ئەوەی خەڵکانێک گومانیان بۆ ئەوە نەچێت ئەستێرەیە ساردی و گەرمی و هەوا دێنێت.

قەتادە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: ئەستێرە بۆ سێ حیکمەت دروستکراون:

١- بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمانی دونیا.

٢- بۆ ڕەجمی شەیتانەکان.

٣- بۆ ئەوەی بکرێت بە نیشانە، کاروانچی و گەشتیارەکان ڕێگەی خۆیانیان پێ بدۆزنەوە.

ابن ڕەجەب ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: زاناش لەسەر زەوی ئەم سێ نیشانەیان تێدایە:

١- لە تاریکستانی دا خەلک هیدایەت دەدەن.

٢- ئەوان مایەی جوانی و ڕازانەوەی دونیان.

٣- ئەوان ڕەجمی ئەو شەیتانانە دەکەن کە حەق و ناحەق تێکەڵ دەکەن)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (فەرموودەی ابن عباس بەڵگەیە فێربوونی زانستی ئەستێرەناسی حەڕامە و جۆرێکە لە جۆرەکانی سیحر)[٢].

---

(١) فضل علم السلف على علم الخلف.

(٢) إعانة المستفيد (٥٠١/١).

**وللنسائي من حديث أبي هريرة رضي الله عنه: (من عقد عقدة ثم نفث فيها فقد سحر، ومن سحر فقد أشرك، ومن تعلق شيئا وكل إليه).**

واته: له ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێک گرێیەک ببەستێ و پاشان فووی پێدا بکات، ئەوا سیحری کردووە، هەر کەسێک سیحر بکات ئەوا شەریکی بۆ خوا داناوە، هەروەها هەرکەسێک شتێک هەڵبواسێ یان دڵی پابەند بێت بە هەر شتێکەوە، ئەوا خوا کاری ڕاست ناهێنێت و دەیداتە دەست ئەو شتەی کە هیچی بە دەست نییە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ثم نفث فيها):** واتە: پاشا فووی پێدا بکات، (نفث): فوو کردنە کەمێک تەڕاتی لەگەڵە.

**(ومن تعلق شيئا وكل إليه):** واتە: هەر کەسێک شتێک هەڵبواسێ یان دڵی پابەند بێت بە هەر شتێکەوە، ئەوە خوا کاری ڕاست ناهێنێت و دەیداتە دەست ئەو شتەی کە هیچی بە دەست نییە.

لەبەر ئەوە ئەمەی باسکردووە چونکە ئەوەی فوو دەکات بە گرێ و دەیەوێت بگات بەو شتە کە مەبەستییەتی، یان لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت هەندێک لە خەڵکی کاتێک سیحریان لێ دەکرێت دەچنە لای ساحر و پەیوەست دەبن بە ساحرەوە، ناچنە لای ئەو کەسەی کە ڕوقیە دەکات و دەرمانی ڕێگەپێدراو دەدات بە خەڵک.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە گرێ ببەستن و پاشان فوو پێدا کردن جۆرێکە لە جۆرەکانی سیحر.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەستنی گرێ و فوو پیا کردن پێی بە مەبەستی کاریگەری لە خەڵک کردن و زیان پێ گەیاندنیان سیحرە، هەرکەسێک سیحر بکات شەریکی بۆ خوا بڕیار داوە، هەروەها سیحر جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک چونکە ساحر داوای یارمەتی لە شەیتانەکان دەکات و نزیک دەبێتەوە لە شەیتان، ئەمە شیرکە[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک پەیوەست بێت بە سیحر و دەجالەکانەوە، ئەوا خوا کاری ڕاست ناهێنێت و دەیداتە دەست ئەو شتەی کە هیچی بە دەست نییە[2].

---

[1] إعانة المستفيد (١/٥٠١-٥٠٢).

[2] إعانة المستفيد (١/٥٠٢).

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (ألا هل أنبئكم ما العضة؟ هي النميمة، القالة بين الناس) [رواه مسلم].**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا پێتان ڕابگەیەنم کە سیحر چییە؟ سیحر قسە هێنان و قسە بردنە لە نێوان خەڵکیدا).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ألا):** أداة استفتاح، مەبەست پێی ئەوەیە مخاطب ئاگادار بکاتەوە لەبەر گرینگی بابەتەکە.

**(هل أنبئكم مالعضة):** (العضة): بەمانای قطع دێت، سەبارەت بە ڕیوایەتی (العضة) کەسرە لەژێر عین بێت، ئەوە بە مانای التفريق دێت.

**(النميمة):** واتە: نەقل کردنی قسە لەنێوان خەڵک بۆ ئەوەی تەفرەقە بخەیتە نێوانیان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکات نەمیمەش جۆرێکە لە سیحر، چونکە وەک سیحر کاریگەری هەیە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** فەرموودەی ابن مسعود خوا لێی ڕازی بێت بەڵگەیە نەمیمە حەڕامە و لە تاوانە گەورەکانە و جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک[١].

---

[١] إعانة المستفيد (٥٠٢/١).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پێناسەی نەمیمە، نەمیمە قسە نەقل کردنە بۆ ئەوەی تەفرەقە و فەساد بخەیتە نێوان خەڵک.

**ولهما عن ابن عمر رضي الله عنهما، ان رسول الله (ﷺ) قال: (إن من البيان لسحرا).**

واتە: بوخاری موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە ابن عومەر خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (بە تەئکید هەندێک لە بەلاغەت واتە: "ڕەوانبێژی و فەصاحەت" سیحرە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(إن من البيان):** پیتی: (من) لەوانەیە بۆ (تبعیض) بێت، و لەوانەشە بۆ (جنس) بێت، لەسەر مانای یەکەم هەندێک جۆری بەلاغەت سیحرە، لەسەر مانای دووەم جنسی بەلاغەت هەمووی شیرکە، وتەی ڕاست وتەی یەکەمە، چونکە ڕیوایەت هاتووە دەفەرموێت: (إنَّ من الـبَيَان لسِحْرًا أو: إنَّ بعْضَ الـبَيَان لسِحْرٌ)[1].

**(إن من البيان):** ئەمەیان بەشێوەی زەم باسکراوە یان مەدح یان بۆ ڕوونکردنەوەی واقع، پاشان سەیری ئەثەری دەکەیت؟

وەڵام: بۆ ڕوونکردنەوەی واقعە، بەلاغەت نە مەدح کراوە و نە زەم کراوە، بەڵکو سەیری ئەثەری دەکەیت، ئەگەر بۆ حەق بوو مەدح کراوە، ئەگەر بۆ ناحەق بوو زەمکراوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە هەندێک لە بەلاغەت واتە: (ڕەوانبێژی و فەصاحەت) سیحرە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

[1] رواه البخاري (٥٧٦٧).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ حەڕامی بەلاغەت ئەگەر بۆ سەرخستنی باطل بەکاریبهێنی و دەعوەی بۆ بکەیت[(١)].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی بەلاغەت ئەگەر بۆ حەق بێت، ئەصلی فەرموودەکە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەگەر مەدحی تێدا بێت ئەوە بۆ حەقە.

وتراوە: مەبەست پێی زەمە، ابن عبدالبر لە کۆمەڵێک لە زانایان نەقل دەکات.

بەڵام دەوترێ: بەلاغەت ئەگەر بۆ حەق بێت و بانگەواز بێت بۆ کتاب و سوننەت، ئەوە مەدح کراوە، ئەگەر مەبەست پێی فێڵ کردن و تێکەڵ کردنی حەق بە ناحەق بێت ئەوە زەم کراوە، فەرموودەکە ئەگەری هەردوو مانای هەیە، کتاب و سوننەت هاتووە بە جوانترین و باشترین بەلاغەت بۆ ڕوونکردنەوەی حەق و بانگەوازی خەڵک کردن.

پیاوێک وتاری خوێند لەلای عومەری کوڕی عبدالعزیز بە جوانی، فەرمووی: سوێند بەخوا ئەمە سیحری حەڵاڵ بوو[(٢)].

ابن بطال ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (باشترین و جوانترین وتە ئەوەیە بڵێیت: ئەم فەرموودەیە زەم نییە بۆ هەموو بەلاغەتێک و مەدحیش نییە بۆ هەموو بەلاغەتێک، بە پیتی (من) هاتووە کە بۆ تبعیضە، چۆن زەمی بەلاغەت دەکەیت لە کاتێکدا خوای گەورە منەتی کردوە بەسەر بەندەکانی بەجۆرێک دەفەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ۝٤﴾ [الرحمن: ٣-٤]؟!).

---

(١) إعانة المستفيد (٥٠٢/١).

(٢) التعليق المفيد.

## باب ما جاء في الكهان ونحوهم

**روى مسلم في صحيحه، عن بعض أزواج النبي (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: (من أتى عرافا فسأله عن شيء فصدقه، لم تقبل له صلاة أربعين يوما)[١].**

**وعن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي (ﷺ) قال: (من أتى كاهنا فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد (ﷺ)) رواه أبو داود[٢].**

**وللأربعة، والحاكم وقال: صحيح على شرطهما، عن (أبي هريرة من أتى عرافا أو كاهناً فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد (ﷺ))[٣]. ولأبي يعلى بسند جيد عن ابن مسعود موقوفا[٤].**

**وعن عمران بن حصين مرفوعا: (ليس منا من تطير أو تطير له أو تكهن أو تكهن له أو سحر أو سحر له، ومن أتى كاهنا فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد (ﷺ)) رواه البراز بإسناد جيد[٥].**

---

[١] أخرجه مسلم (٢٢٣٠) بدون لفظ "فصدقه بما يقول" وهي عند أحمد (٦٨/٤).

[٢] أخرجه أبو داود (٣٩٠٤)،وأحمد (٤٠٨/٢، ٤٧٦)، وصححه الألباني في "إرواء الغليل" في الصحيحة (٣٣٨٧).

[٣] أخرجه أحمد (٤٢٩/٢ رقم ٩٥٣٦)، والترمذي (١٣٥)، وابن ماجه (٦٣٩)، والنسائي في "الكبرى" (٩٠١٧)، والبيهقي (١٣٥/٨)، والحاكم (٨/١) وبعضهم عنده حديث بنحوه.

[٤] أخرجه أبو يعلى (٢٨٠/٩ رقم ٥٤٠٨).

[٥] أخرجه البزار (٥٢/٩ رقم ٥٤٠٨).

**ورواه الطبراني في الأوسط بإسناد حسن من حديث ابن عباس دون قوله: (ومن أتى..) الخ[١].**

**قال البغوي: العراف: الذي يدعي معرفة الأمور بمقدمات يستدل بها على المسروق ومكان الضالة ونحو ذلك وقيل: هو الكاهن والكاهن هو الذي يخبر عن المغيبات في المستقبل وقيل: الذي يخبر عما في الضمير.**

**وقال أبو العباس ابن تيمية: العراف: اسم للكاهن والمنجم والرمال ونحوهم ممن يتكلم في معرفة الأمور بهذه الطرق[٢].**

**وقال ابن عباس –في قوم يكتبون (أبا جاد) وينظرون في النجوم: ما أرى من فعل ذلك له عند الله من خلاق[٣].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** لا يجتمع تصديق الكاهن مع الإيمان بالقرآن.

**الثانية:** التصريح بأنه كفر.

**الثالثة:** ذكر من تكهن له.

**الرابعة:** ذكر من تطير له.

**الخامسة:** ذكر من سحر له.

---

[١] أخرجه الطبراني في "الأوسط" (٣٠٢/٤ رقم ٤٢٦٢).

[٢] مجموع الفتاوي (١٧٣/٣٥).

[٣] أخرجه البيهقي (١٣٩/٨)، وعبدالرزاق في "جامع معمر" الملحق ب"المصنف" (٢٦/١١ رقم ١٩٨٠٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٤٠/٥ رقم ٢٥٦٤٨).

**السادسة:** ذكر من تعلم أبا جاد.

**السابعة:** ذكر الفرق بين الكاهن والعراف.

# باب ما جاء في الكهان ونحوهم

## باسی کاهینەکان و هاوشێوەکانیان

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هۆكاری ئەم بابە لەگەڵ بابی پێشووتر: بابی پێشووتر باسی ڕوون كردنەوەی سیحر و حوكمی ساحر و جۆرەكانی سیحری كرد، ئەم بابە باسی حوكمی كاهن دەكات، چونكە لێک چوون هەیە لەنێوان كاهن و سیحر، چونكە هەموو سیحر و كاهن كردەوەی شەیتانی یە و نەفی عەقیدە دەكات و دژی تەوحیدە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە كتابی تەوحید: كاهن جنۆكە بەكاردەهێنن، بەكارهێنانی جن كوفر و شیركی گەورەیە بەخوا، چونكە بەكارهێنانی جن بۆ ئەم شتانە ناكرێت مەگەر بە نزیک بوونەوە نەبێت لە جن بە عیبادەت، كاهن دەبێت ئیلا لە جن نزیک ببێتەوە بە هەندێک عیبادەت هەتا ئیشەكەی بۆ بڕوێنێت، وەک: ئاژەڵ بۆ سەربڕین یان داوا لێكردن لە كاتی تەنگانە یان كوفر كردن بەخوا یان ئیهانە كردنی قورئان یان جنێو دان بە خوا، یان كردەوەی تری شیركی وەک ئەمانە.

كاهن كردەوەی دژی ئەصلی تەوحیدە، كاهن موشریكە بەخوا چونكە جن بەكاردەهێنێت، ناكرێت جن خەبەری غەیبی پێ بدات مەگەر بە لێ نزیک بوونەوە نەبێت لێ ی بە چەندین جۆری عیبادەت)[2].

محمد بن عبدالرحمان الخميس دەفەرمووێت: (كهانە و عرافە شیركن، داخلی شیرک دەبن لە دوو ڕووەوە:

---

[1] إعانة المستفيد (٥٠٣/١).

[2] التمهيد لاپەڕە (٣٠٤).

**١-** له ڕووی بانگەشه كردن به زانستی غەیب لەگەڵ خوا، كه ئەم غەیبه تایبەته بەخوا.

**٢-** لەڕووی نزیک بوونەوه له بێجگه له خوا، وەک خزمەت كردنی شەیتانەكان و داوای یارمەتی لێكردنیان)[١].

**روى مسلم في صحيحه، عن بعض أزواج النبي (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: (من أتى عرافا فسأله عن شيء فصدقه ، لم تقبل له صلاة أربعين يوما).**

---

[١] التوضيحات الجلية على شرح العقيدة الطحاوية (١٣١٩/٣).

واتە: موسليم ڕیوایەتی کردووە لە یەکێ لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێ بڕوات بۆ لای فاڵگرەوەیەک و پرسیاری لێ بکات لەبارەی هەر شتێکەوە و باوەڕی بە وەڵامەکەی هەبێت، ئەوا هیچ نوێژێکی لێ وەرناگیرێت تا چل ڕۆژ).

**وعن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي (ﷺ) قال: (من أتى كاهنا فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد (ﷺ)). رواه أبو داود.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک بڕوات بۆ لای فاڵگرەوەیەک و بەڕاستی دابنێت لەوەی کە دەیڵێت ئەوا کافر بووە بەوەی دابەزیووە بۆ محمد (ﷺ)) .

**وللأربعة، والحاكم وقال: صحيح على شرطهما، عن أبي هريرة من أتى عرافا أو كاهنا فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد (ﷺ)". ولأبي يعلى بسند جيد عن ابن مسعود موقوفا.**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک بڕوات بۆ لای فاڵگرەوەیەک یان عەڕافێک و بەڕاستی دابنێت لەوەی کە دەیڵێت ئەوا کافر بووە بەوەی دابەزیووە بۆ محمد (ﷺ)).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکان:

**(عرافا):** (عەڕاف): هەر کەسێک لەبارەی شتی دزراو و وون بوو خەبەر بدات، شتی نادیار بەکار بهێنێت، ئەمەیان عەڕافە.

(کاهن): هەر کەسێک خەبەری غەیبی بدات لە ڕێگای جنەوە، ئەمەیان کاهینە.

(ڕەممال): هەر کەسێک لەبارەی شتی دزراوەوە خەبەر بدات، لە ڕێگەی خەت کێشانەوە لەسەر زەوی، ئەمەیان ڕەمماڵە.

(ئەستێرەناس): هەر کەسێک لەبارەی غەیبەوە خەبەر بدات، لەڕێگەی سەیرکردنی ئەستێرەکانەوە ئەمەیان پێی دەگوترێت ئەستێرەناس.

**(فصدقه):** لە صحیح مسلم نییە بەڵکو ڕیوایەتی ئیمام ئەحمەدە لە مسند، ڕیوایەتی مسلم: (فسأله عن شيء لم تقبل صلاة أربعين ليلة).

ئەم ڕیوایەتە دانە پاڵ مسلم سێ ئەگەری هەیە:

**١-** لەوانەیە وەهم بێت لە دانەری کتابەوە.

**٢-** لەوانەیە وەهم بێت لە نسخەکانی کتاب.

**٣-** لەوانەیە دانەری کتاب لەبەر ئەوە دایبێتە پاڵ مسلم بە اعتبار ئەصل.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودانە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودانەی باسکردوە بۆ ئەوەی حوکمی چوونە لای عەرڕاف و کاهن و پرسیار لێ کردنیان و بەڕاست دانانیان ڕوون بکاتەوە.

**سوودەکانی فەرموودەکان:**

**١-** ئەم فەرموودانە بەڵگەن چوونە لای کاهنەکان و بەڕاست دانانیان کوفرە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ظاهری فەرموودەکە وادیارە تەنها پرسیار کردن دەبێتە هۆی ئەوەی چڵ ڕۆژ نوێژی قبول نەبێت، بەڵام ئەمە لەسەر اطلاقی خۆی نییە، پرسیار کردن لە عەرڕاف دابەش دەکرێت بۆ چەند بەشێک:

بەشی یەکەم: تەنها پرسیاری لێ دەکات، ئەمەیان حەڕامە لەبەر وتەی: (من أتى عرافا ...)، جێگیر بوونی سزا لەسەر پرسیار لێکردن بەڵگەیە لەسەر حەڕامی، چونکە سزا نییە ئیلا لەسەر کردەوەی حەڕام.

بەشی دووەم: پرسیاری لێ دەکات و بەڕاستی دادەنێت، ئەمەیان کوفرە، چونکە بەڕاست دانانە لەسەر عیلمی غەیب و بەدرۆ خستنەوەی قورئانە، بەجۆرێک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ﴾ [النمل: ٦٥]

بەشی سێیەم: پرسیاری لێ دەکات بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە ئایا ڕاستگۆیە یان درۆزنە، نەک بۆ ئەوەی وتەی وەربگرێت، ئەمەیان هیچی تێدا نییە و داخلی فەرموودەکە نابێت، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لە ابن صيد کردووە و فەرمووی: (ماذا خبأت لك؟ قال: الدخ، فقال: اخسأ؛ فلن تعدو قدرك)، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری شتێکی شاراوەی لێ کرد بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە و خەبەری پێ بدات.

بەشی چوارەم: پرسیاری لێ دەکات بۆ ئەوەی لاوازی و درۆی بەدیار بخات، تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی درۆ و لاوازییەکەی ڕوون بکاتەوە، ئەمە داواکراوە و دەکرێت بڵێی واجبە، پووچ کردنی وتەی کاهن گومانی تێدا نییە شتێکی داواکراوە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەوەی دیار بێت خواش زاناترە وتەی یەکەمە؛ کە کوفرە و لە دین دەردەچێت، چونکە بەڕاست دانانی کاهن و قورئان پێکەوە کۆ نابنەوە، چونکە خوای گەورە کاهنی پووچ کردووە و خەبەری داوە کە کردەوەی

---

[1] القول المفيد (٢/٢).

هی شەیتانەکانە، هەر کەسێک بەڕاستی دابنێت ئەوا کافرە بەخوا بە کوفری گەورە، ئەمە ظاهری فەرموودەکەیە[١].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەوەی دەچێتە لای کاهن یان عەڕاف و بەڕاستی دادەنێت لە ئیسلام دەرنەچووە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) حەدی بۆ داناوە کە چل ڕۆژ نوێژی قبول نییە، ئەوەی دەچێتە لای کاهن ئەگەر حوکمی کوفری گەورەی بەسەر بدەیت ئەوا هەڵگەڕاوەتەوە لە دین و هەرگیز نوێژی قبول نابێت هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئیسلام، هەندێک لە ئەهلی عیلم دەڵێن: بەڵگە وتەی: (فصدقه، لم تقبل له صلاة أربعين يوما)، لەسەر وتەی: (كفر بما أنزل على محمد (ﷺ))، کوفری بچووکە نەک کوفری گەورە بێت و لە دین دەربچێت، ئەمە وتەی یەکەمە و وتەی ڕاستە، ئەمە جمعە لەنێوان بەڵگەکان، وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (من أتى عرافا فسأله عن شيء فصدقه، لم تقبل له صلاة أربعين يوما)، بەڵگەیە لە ئیسلام دەرنەچووە، فەرموودەی تر وتەی: (من أتى عرافا فسأله عن شيء فصدقه، فقد كفر بما أنزل على محمد (ﷺ))، بەڵگەیە لەسەر کوفر، زانیمان ئەم کوفرە کوفری بچووکە، کوفری گەورە نییە و لەدین دەرناچێت، ئەمە یەکێکە لە وتەکانە سەبارەت بەو کەسەی دەچێتە لای عەڕاف و بەڕاستی دادەنێت.

وتەی دووەم: وەستاون لەسەر ئەم بابەتە، نە دەڵێن کوفری گەورەیە و نە دەڵێن کوفری بچووکە، بەڵکو دەڵێن: چوونە لای کاهن و بەڕاست دانانیان کوفرە بەخوا، بێ دەنگ دەبن لەم بابەتە.

---

[١] إعانة المستفيد (٥٠٧/١).

وتەی سێیەم: بەڕاست دانانی کاهن کوفرە بەخوا بە کوفری گەورە، ئەم وتەیە جێگای تێڕوانینە لە دوو ڕووەوە:

ڕووی یەکەم: باسمان کرد وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (لم تقبل له صلاة أربعين يوما)، بەڵگەیە کافر نەبووە بە کوفری گەورە، ئەگەر کافر ببوایا ئەم حەددەی بۆ دیار نەدەکرد بۆ قبول نەبوونی نوێژ بۆ ماوەیەکی کاتی.

ڕووی دووەم: بەڕاست دانانی کاهن شوبهەی تێدایە لە بانگەشەی عیلمی غەیب یان بەڕاست دانانی ئەو کەسەی بانگەشەی عیلمی غەیب دەکات کە ئەمە کوفرە بە خوا و کوفری گەورەیە، بەڵام کاهن ئەوەی بانگەشەی غەیب دەکات لە شتێک ڕاست دەکات بە هۆی ڕێگای (مسترق السمع)، کەواتە خەبەرەکە لە ڕێگای جنەوەیە، جن نەقلی دەکەن لەوەی گوێیان لێ بووە لە ئاسمانەکان، ئەمە شوبهەیە.

ئەوەی دێتە لای کاهن و دەڵێت: من بەڕاستی دادەنێم لەوە خەبەرە غەیبی یە، چونکە زانستی وەرگرتووە لە ئاسمانەوە لە ڕێگای جنەوە، ئەم شوبهەیە ڕێگری ئەوە دەکات بەڕاست دانانی کاهن کافر بکەیت بە کوفری گەورە.

وتەی ڕاست و دیار ئەوەیە کوفرەکە کوفری بچووکە نەک کوفری گەورە لەبەر فەرموودەکان)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە ترسناکی چوونە لای کاهن و عەڕاف، چونکە یان کافر دەبێت یان چل ڕۆژ نوێژ لێی وەرناگیرێت.

---

[1] التمهيد لاپەڕە ٣٠٧-٣٠٩.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک بچێتە لای کاهن یان عەڕاف، پرسیاری لێ بکات نوێژی قبول نابێت، دوو ئەگەر هەیە:

١- یان نوێژی قبوڵ نابێت.

٢- یان پاداشتی ئەو نوێژانە بەرامبەر ئەو تاوانەیە کە چووتە لای کاهن و عەڕاف.

زانایان دەڵێن هەر کەسێک بچێتە لای عەڕاف یان کاهن یان عەرەق بخواتەوە، نوێژی قبوڵە بەڵام پاداشتی نوێژەکەی بەرامبەر ئەو تاوانەیە کە کردوویەتی، نابێت بڵێت من نوێژ ناکەم چونکە بۆ ماوەی چل ڕۆژ بێ سوودە.

أبو عبد الله ابن منده ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: (لا تقبل له صلاة)، واتە: پاداشت وەرناگرێت چل ڕۆژ وەك سزا بۆ خواردنەوەی عەرەق، هەر وەک وتراوە بۆ ئەو کەسەی ڕۆژی هەینی قسە دەکات و وتار خوێنیش وتار دەدات، نوێژ دەکات و جومعەی بۆ نییە، مەبەست پێی ئەوەیە پاداشتی جومعەی بۆ نییە لەبەر تاوانەکەی)[1].

ئیمام النووي ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (قبول نەبوونی نوێژ ماناکەی ئەوەیە پاداشتی بۆ نیە ئەگەر چی نوێژیشی دروستە و لەسەری لاچووە، هەروەها پێویستی بە دوبارە کردنەوە نییە).

صالح ال الشیخ  خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (نوێژی دروستە و لەسەری واجب نییە قەزای بکاتەوە بەڵام پاداشتی بۆ نییە، چونکە پاداشتی نوێژ کردن هەتا چل ڕۆژ بەرامبەر

---

[1] تعظيم قدر الصلاة (٢/٥٨٧-٥٨٨).

ئەو تاوانەیە کە چوەتە لای کاهن و عەڕاف، نوێژی لەسەر لاچووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی تاوانی ئەو کەسەی دەچێتە لای عەڕاف و پرسیاری لێ دەکات)[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ کوفری عەڕاف و کاهنەکان، چونکە ئەگەر مرۆڤ چل ڕۆژ نوێژی قبوڵ نەبێت بەهۆی چوونە لای عەڕاف و کاهنەکان یان مرۆڤ تووشی کوفر ببێت بەهۆی چوونە لای عەڕاف و کاهەنەکان، دەبێت عەڕاف و کاهن کافر بن و شەیتان بن.

---

[1] التمهید لاپەڕە (٣٠٧).

**وعن عمران بن حصين مرفوعا: (ليس منا من تطير أو تطير له أو تكهن أو تكهن له أو سحر أو سحر له، ومن أتى كاهنا فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد) رواه البراز بإسناد جيد، ورواه الطبراني في الأوسط بإسناد حسن من حديث ابن عباس دون قوله: (ومن أتى ...) الخ.**

واته: له عیمرانی کوڕی حوصەین دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسە لە ئێمە نییە کە شومی دەکات لە باڵندە یان هەر شتێکی تر، یان باڵندە هەڵفڕێنێ بۆ ئەوەی بزانێت فلانە کار خێری پێوەیە یان نا، جا خۆی هەڵی بفڕێنێت یا کەسێکی دیکە ڕاسپێرێت بۆی هەڵبدات، هەروەها ئەو کەسەش کە فاڵ بگرێتەوە یان فاڵی بۆ بگرنەوە یان سیحر بکات یا سیحری بۆ بکەن، هەر کەسێک بڕوات بۆ لای فاڵگرەوەیەک هەرچی وەڵامێکی دایەوە باوەڕی پێ بکات ئەوا کافر بوە بەوەی کە دابەزیووە بۆ محمد (ﷺ)).

تەبەڕانیش هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەمەی لەگەڵ نییە: (هەر کەسێک بڕوات بۆ لای کاهینێ ...)

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ليس منا):** واتە: ئەو کەسە لە ئێمە نییە، ئەمە نابێتە بەڵگە کە فاعل لە دین دەردەچێت.

**(تطير أو تطير له):** باڵندە هەڵفڕێنێ بۆ ئەوەی بزانێت فلانە کار خێری پێوەیە یان نا، جا خۆی هەڵی بفڕێنێت یا کەسێکی دیکە ڕاسپێرێت بۆی هەڵبدات.

**(أتكهن أو تكهن له):** واتە: ئەو کەسەش کە فاڵ بگرێتەوە یان فاڵی بۆ بگرنەوە.

**(أو سحر أو سحر له):** واتە: یان سیحر بکات یا سیحری بۆ بکەن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات هەر کەسێک بڕوات بۆ لای فاڵگرەوەیەک و هەرچی وەڵامێکی دایەوە باوەڕی پێ بکات، ئەوا کافر بووە بەوەی کە دابەزیووە بۆ محمد (ﷺ).

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەو کەسە لە ئێمە نییە کە شومی دەکات لە باڵندە یان هەر شتێکی تر، یان باڵندە هەڵفڕێنێ بۆ ئەوەی بزانێت فلانە کار خێری پێوەیە یان نا، جا خۆی هەڵی بفڕێنێت یا کەسێکی دیکە ڕاسپێرێت بۆی هەڵبدات.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت کەس فاڵ بگرێتەوە یان فاڵی بۆ بگرنەوە یان سیحر بکات یا سیحری بۆ بکەن.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک بڕوات بۆ لای فاڵگرەوەیەک و هەرچی وەڵامێکی دایەوە باوەڕی پێ بکات ئەوا کافر بووە بەوەی کە دابەزیوە بۆ محمد (ﷺ).

**قال البغوي: العراف: الذي يدعي معرفة الأمور بمقدمات يستدل بها على المسروق ومكان الضالة ونحو ذلك وقيل: هو الكاهن والكاهن هو الذي يخبر عن المغيبات في المستقبل وقيل: الذي يخبر عما في الضمير.**

واته: بەغەوی دەفەرمووێت: عەڕاف: ئەو کەسەیە کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە شتە غەیبییەکان دەزانێت بە پێی چەند پێشەکییەک، گوایە دەزانێت شتی دزراو کێ دزیویەتی ئێستا لە کوێیە و شوێنەکەی ئاشکرا دەکات یان هەر شتێکی لەو بابەتە، یان گوتراوە عەڕاف هەر فاڵگرەوەیە.

فاڵگرەوەش: ئەو کەسەیە کە هەواڵی شتی غەیبی دەدات کە لە داهاتوودا ڕوو دەدات. یان گوتراوە: فاڵگرەوە ئەوەیە کە پێت دەڵێت چی لە دڵت دایە.

**وقال أبو العباس ابن تيمية: (العراف: اسم للكاهن والمنجم والرمال ونحوهم ممن يتكلم في معرفة الأمور بهذه الطرق).**

واته: ابن تیمیە دەفەرمووێت: (عەڕاف: ناوێکە فاڵچی و ئەستێرەناس و ڕەمل لێدەر و هاوشێوەکانیان دەگرێتەوە، ئەوانەی لەبارەی کاروباری غەیبی و نهێنی بە پێی کات و ئەو ڕێگا و دەستورانەی خۆیان قسە دەکەن).

**وقال ابن عباس - في قوم يكتبون (أبا جاد) وينظرون في النجوم: ما أرى من فعل ذلك له عند الله من خلاق.**

واته: لەبارەی ئەو کەسانەی ئەبجەد دەنووسنەوە لە هەمان کات دا سەیری ئەستێرەکان دەکەن (واتە: بۆ بەخت گرتنەوە)، ابن عباس دەفەرمووێت: (وا دەبینم کە هەر کەسێ ئەم جۆرە کارانە بکات لا خوا بێ بەشە).

## پێرست

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| - پێشەکی | ٣ |
| - كتاب التوحيد. | ٦ |
| - **باب** فضل التوحيد وما يكفر من الذنوب. | ٦٣ |
| - **باب** من حقق التوحيد دخل الجنة بغير حساب. | ٩٧ |
| - **باب** الخوف من الشرك. | ١٢٩ |
| - **باب** الدعاء إلى شهادة أن لا إله الله. | ١٥٣ |
| - **باب** من الشرك لبس الحلقة والخيط ونحوهما لرفع البلاء أو دفعه. | ٢٠٢ |
| - **باب** ما جاء في الرقي والتمائم. | ٢٢٢ |
| - باب من تبرك بشجرة أو حجر ونحوهما. | ٢٤٨ |
| - **باب** ما جاء في الذبح لغير الله. | ٢٦٩ |
| - **باب** لا يذبح لله بمكان يذبح فيه لغير الله. | ٢٩٦ |
| - **باب** من الشرك النذر لغير الله. | ٣١٤ |
| - **باب** من الشرك الاستعاذة بغير الله. | ٣٣٤ |

- **باب** من الشرك أن يستغيث بغير الله أو يدعو غيره. ٣٤٥
- **باب** قول الله تعالى: (أَيُشْرِكُونَ مَا لاَ يَخْلُقُ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ ...). ٣٦٥
- **باب** قول الله تعالى: (حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ...) ٣٩١
- **باب** الشفاعة. ٤٠٥
- **باب** قول الله تعالى: (إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْت). ٤٢١
- **باب** ما جاء أن سبب كفر بني آدم وتركهم دينهم هو الغلو في الصالحين. ٤٣٩
- **باب** ما جاء من التغليظ فيمن عبد الله عند قبر رجل صالح فكيف إذا عبده. ٤٥٨
- **باب** ما جاء أن الغلو في قبور الصالحين يصيرها أوثانا تعبد أوثان من دون الله.٤٨٣
- **باب** ما جاء في حماية المصطفى (ﷺ) جناب التوحيد وسده كل طريق يوصل إلى الشرك. ٤٩٦
- **باب** ما جاء أن بعض هذه الأمة يعبد الأوثان. ٥١١
- **باب** ما جاء في السحر. ٥٤٢
- **باب** بيان شيء من أنواع السحر. ٥٥٥
- **باب** ما جاء في الكهان ونحوهم. ٥٧٢